ISLAMIC AND SECULAR TRENDS

# تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی




## خاڵە هاوبەشەکان و جیاوازەکانیان

عەلی باپیر

چاپی سێیەم

التفسیر

# تەوژمی
# ئیسلامیی و عەلمانیی
# و
# خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان

ئاڵقەکانی (١-٧)

عـــەلی باپیـــر

چاپی سێیەم





# تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیـاوازەکانیـان


نوسینـــــــــــی: عـــەلـــی باپیـــــر

بڵاوکردنـــــــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

نەخشەسازی نـــاوەوە: جمعە صدیق کاکە

خـــــــــــە ت: نەوزاد کۆیی

بـــــــــــەرگ : أمین مخلص

نـــۆرە و ســاڵی چـاپ: سێیەم ٢٠١٥-١٤٣٦

تــــــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی (٣٧٣) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە







نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

Mob: +964 750 460 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

# پێشەكی

بەو كەسانەی:

- هێندە ئازاو بوێرن، هەركات پاش لێ بێئاگابوون هەقیان ناسی، بە سینایی دانی پێدا دێنن و، دەستبەرداری بیروڕێی هەڵەی خۆیان دەبن، هەرچەندە قەناعەت و بڕوایەكی لەمێژینەشیان بووبێ.
- هێندە ئازادو سەربەستن، ڕێگە بە قسەو بۆچوونی هیچ كەس نادەن -هەركەسێك بێ- كە لە دڵیاندا ڕەگ دابكوتێ و ببێتە قەناعەت، هەتا لە مەحەكی عەقڵ و زانیاریی نەدەن.

بە كردەوەو حاڵ نەك بە قسەو بانگەشە، بڕوایان بە تەبایی و پێكەوەژیان هەیە لەگەڵ نەیارە فیكرییەكانیاندا.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ...﴾

(سبأ: ٤٦)

## پێشەکی چاپی سێیەم

الحمدلله حق حمده، والصلاة والسلام والبركات على عبـده و رسـوله،محمـد وآلـه السائرين على دَرْبه.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

لە پێشـەکی ئـەم چـاپی سـێیەمەی(خاڵە هاوبـەش وجیاوازەکـانی تـەوژمی ئیسلامیی و عـەلمانیی)دا، بـە پێویسـتی دەزانم جـەخت لەسـەر سـێ مەسـەلە بکەمەوە:

١) هەرکام لە تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی لە هەرێمی کوردستان وعێراق و وڵاتانی دیکـەی جیهـان ئیسـلامیشـدا،واقیعێکن و نکـووڵیی لـەبوونیان ناکرێو، هەرکامێکیشیان بوونی ئەوی دیکە نادیدە بگرێ،خۆی بەهەڵەدا دەبات.

٢) گەل وکۆمـەڵگا پێشکەوتووەکان،هەمیشـە بـەگیانی تـەبایی و پێکـەوە ساچاندن و مەدارکردن پێکەوەدەژین و،خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان دەکەنە پـردی بەیەك گەیشتنیان و، هـەرکامێکیان تایبەندییـەکانی بەرانبـەرەکانی قبـووڵ دەکات و، هەموویان جیاوازییەکانی یەکدیی تەحەممول دەکەن و،هـیچ کامێکیـان لەسەر ئاستی تاك و لایەن وتەوژم، کەڵکەڵەی ئەوەی لە کەللەدانیە،کـە ئـەوانی دیکە لە خۆیدا بتوێنێتەوەو بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

٣) ئیسلام بە ئیمـان وعەقیدەکـەی و شـەریعەتەکەی وبـەها بەرزەکانیـەوە، ناسنامەو کلتووروفیکروفەرهەنگ و مێژووی پڕشنگداری گەلەکەمان بە گشـتیی پێکـدێنێ و،پارێزگـاریی لێکردنـی و بـەهرە لێـوەرگرتنی ئـەرك ومـافی

هەموولایەکمانەو، پێویسە بەوپەڕی هەستکردن بەبەرپرسیارێتییەوەو،دوور لە هەستاریی (حساسیة) لەوبارەوە،هەڵس وکەوت بکەین.

لەئەزموونی سەرکەوتوانەی ئەو کۆمەڵگایانەشدا،کە بەهرەمەند بوون لە زانست وتەکنۆلۆژییی سەردەم،وێی لێنەکردوون،کەدەستبەرداری ڕەسەنایەتیی و فیکرو عەقیدەوکلتووری خۆیان - کە پێیان وابوو ڕاست و بەکەڵکە- بن،دەرس و پەندێکی گرنگ وگەورە هەیە بۆ هەموولایەك،بەتایبەت بۆ ئەو عەلمانییە کرچ و کاڵانەی،کە پێیان وایە،دەبێ لەسەرجەم رابردووی خۆماندابڕێین و، لەئایین و عەقیدەو کلتووری خۆمان هەڵگەڕێینەوە، ئەوجار بەرەو پێش دەچین!

هیواداریشم ئەم کتێبە لەم چاپی سێیەمەشیدا،کە هیچ دەستکاریی نەکراوە،وەك رابردوو،ئامانجەکانی خۆی بپێکێ.

٢٤ ربیع الاول ١٤٣٥ك

٢٥ کانونی دووەمی ٢٠١٤ز

هەولێر

## پێشەکی چاپی دووەم

الحمدلله الكبير المتعال، والصلاة والسلام والبركات على رسول الله محمد وآله الى يوم المآل.

خوێنەری بەڕێز!

ماوەیەك بوو برایانی نووسینگەی تەفسیر داوایان لێدەکردم، کە لەدەرفەتێکدا چاوێك بەم کتێبەدا بگێڕمەوە، پێش چاپکردنەوەی دووبارەی، لەبەر پڕئیشیی بوارم نەبوو، ئێستاش کە ئەو بوارەم بۆ ڕەخساوە، بەپەسندی دەزانم، کە لەم پێشەکییەی ئەم چاپەدا، ئاماژە بەچەند مەسەلەیەك بکەم:

یەکـەم: یـەکێك لەنیشـانە هـەرە سـەرەکییەکانی کۆمـەڵگا سـەرکەوتوو و پێگەیشتووەکان، ئەوەیە،کەلەنێوان تاکەکانیدا بەگشتیی و پێکهاتە جیاوازەکانیدا بەتایبەت، لێك تێگەیشتن و تەبایی و هاوکـاریی هـەبێ و، بەپێچەوانەشـەوە هـەر کۆمەڵگایەك تاکەکانی و پێکهاتەکانی گیانی لێك تێگەیشتن و تەبایی و هاوکاریی ن نەبێ، بە کۆمەڵگایەکی کرچ و کاڵ و دواکەوتوو دادەنرا، ئنجا جێگێی دڵخۆشییە، کە کۆمەڵگای کوردەواریی ئێمە لەو بوارەدا، ڕوو بەگەشەکردن و بەرەوپێشچوونە.

دووەم: گەلێك جار عەلمانییە پەرگیرو دەمارگیرەکان، خەڵکی ئیسلامیی بـەوە تۆمـەتبار دەکەن، کە ئامادەیی گفت و گۆو لەیەك تێگەیشتنیان نیەو کەسـانێکی دەمارگیرو داخراون! جا دیارە ئێمە نکوولیی لەوە ناکەین، کە کەسانی ئاوا لە نێو تەوژمی ئیسلامییدا هەن، بەڵام یەکەم: کەمینەن و هەربـەرەو کـەمییش دەچـن، دووەم: کەمتر وایە کەسانی قسە ڕۆیشتوو و بڕیار بەدەست بن!

بەڵام ئەو برادەرانە ،ئەگەر بابەتییانەو بەویژدانەوە سەرنجیاندابایە، دەبوایە ئەم هەوڵ و هەنگاوەی بەنـدە، وەك بەرپرسـی لایـەنێکی ئیسـلامیی خـاوەن پێگـەی

جـەماوەریی سـەرگۆڕەپانی کوردسـتان، بکەنـە تـەرازوو و پێـوەری هەڵوێسـتی ئیسلامییەکان لەبارەی تەبایی‌و پێکەوە ژیانەوە، نەك قسەو هەڵوێستی هەنـدێك خەڵکی تـاكو تـەرا، بـەڵێ ئـەو برادەرانـە، دەبوایـە ئـەم کتێبـەی بەنـدە وەك دەستپێشخەرییەکی گرنگ لەو بوارەدا تەماشا بکەن، کە وێڕای خاڵە جیاوازەکان، هەوڵم داوە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانییش بخەمـەڕوو، تاکو وێڕای تەحەمولکردنی جیاوازییەکانی یەکدی، هاوکارو دەسبارگری یەکدیش بین بۆ چەسپاندنی خاڵ‌و کارو ئامانجە هاوبەشەکانمان.

سێیەم لەکاتێکدا، کە ئێمەی ئیسلامیی بەهەنگاو هەڵوێستی کردەیی، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زیـاتر ئـەو ڕاسـتییە دەسـەلمێنین، کـە وێـڕای پارێزگـاریی کـردن لـە تایبەتمەندییەکانمان، زۆریش سوورین لەسەر هاوکاریی‌و بەشداریی کردنی کارا بـۆ هەرچـی زیـاتر دەسـتەبەر کـردن‌و چەسـپاندنی هـەموو ئـەو ئامانجانـەی، کـە بەرژەوەنـدیی گشـتیی خـەڵك‌و کۆمەڵگایەکـەمانیانی تێدایـە، جێیداخـە، کـە کەسانێکی بڕیار بەدەست‌و پـارەداری نێـو هـەردووك حیزبـی حـوکمڕان، لـەڕێی هەندێك کلکە گۆڤارو بڵاوکراوەو سایتی وابەسـتەو دابەسـتەیانەوە، کـە ئێسـتا زاراوەی: (میدییێی سێبەر)یان بۆ بەکاردێ، بەردەوام بوختان‌و درۆو دەلەسەمان بۆ دەکەن‌و جنێومان پێدەڵێن!

بەڵکو هەیانە باسی: (را لێگرتن‌و سەرکوتانەوە)شمان دەکات[١]!

وەك بڵێی ئەو برادەرە لەبیری چووبێ، کـە لەحیزبێکدایـە لافـی دیموکراسـیی لێدەدات‌و، وابزانێ لەسەدەکانی نێوەڕاستدا دەژی‌و بەرپرسی دەزگایەکی راگەیاندن نیە، بەڵکو بەرپرسی: (دادگێی پشکنین – محکمة التفتیش)ە، کـە کـاتی خـۆی پیاوانی کڵێسا لەدژی نەیارانی کڵێساو بەرژەوەندییەکانیدا پێکیان هێنابوو!

---

[١] – ئەمە قسەی برادەرێکی عەلمانیی بەرپرسی یەکێك لەدەزگاکانی ڕاگەیانـدنی یـەکێك لـەو دوو حیزبەیە، بەرانبەر بە ئیسلامییەکان!

بەهیویێی ئەوە، کە ئەم کتێبە لەم چاپی دووەمەیشدا ئەو ئامانجانەی، کە بۆیان نووسراوە، بەچاکترین شێوە بهێنێتەدیو، ببێتــە مایــەی زیــاتر دڵ دامــەزرانــدنو دڵنیابوونی خەڵکی ئیسلامیی لەڕاستییو تێرو تەواویی بەرنامەکەیان و، بشبێتە مایەی بەرچاو ڕۆشن بوونەوەی خــەڵکی سیکۆلاریســتو نائیســلامیی، بەرانبــەر بەتەوژمی ئیسلامییو بیروراو هەڵوێستو ئامانجەکانی.

ئاشکراشە، کە خۆگۆڕینمان بــەرەو چــاکەو خێــر، بناغــەو هۆکــاری گــۆڕینو پاکسازییو چاکسازیی تێداکردنی ئەو واقیعەمانە، کە هەمووڵایەکمان، یان لانی کەم زۆربەی هەرە زۆرمان لەزۆرلاوە لێی بێزارینو پێــوەی گرفتــارین، بەڵگەشــی نــاوێ، کــە هــەنگاوی یەکــەمی خۆگــۆڕین (تغــيير الــنفس) بریتیــە لــەگۆڕینی بیروبۆچوونو تێڕوانین، چونکە بێگومان ڕەفتارو کرداری مرۆڤـــ هەڵ هــەڵقوڵاوو ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونو قەناعەتە فیکرییەکانیەتی.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألا اله إلا انت

أستغفرك وأتوب اليك

٥ی ذي الحجة ١٤٣١

٢٠١٠/١١/١١

بەغداد

## ئەم زنجیرە باسە

خوێنەری سەنگین وشیرین!

ئەم زنجیرە باسە، سەرجەم حەوت ئاڵقەیەو، لە ماوەی چەند مانگی رابردوودا لە سیوسێ ژمارەی هەردووك بڵاوكراوەی (هاوڵاتی)و (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە، بە ناوونیشانی: (تەوژمی ئیسلامیی وعەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەكانیان)، ئەمەش ناوونیشانی ئەو حەوت ئاڵقەیە، كە هەركامێكیان بۆ بابەتێكی سەربەخۆ تەرخان كراوە:

١- لە بواری بووناسییدا.

٢- لە بواری بیرو بڕوادا.

٣- لە بواری فیكرو زانستدا.

٤- لە بواری دەوڵەتداریيو حوكمڕانییدا.

٥- لە بواری ئابووریيو ژیانو گوزەراندا.

٦- لە بواری كۆمەڵایەتیدا.

٧- لە بواری تەبایيو پێكەوەژیاندا.

شایانی باسیشە، كە هەركام لە بابەتەكانی ئەو حەوت ئاڵقەیە، لە چەندان باسی جۆراوجۆر پێكهاتوون.

هیواداریشم ئەم زنجیرە باسە، مایەی بەرچاوڕۆشنییو هۆشیاریيو بێداریی زۆر كەس بێت و، ئومێدیشم وایە خوێنەرانی بەڕێز بە هەموو جۆرو شێوەكانیانەوە، ئەم زنجیرە باسە لە چاپەكانیداهاتوویدا بەهۆی سەرنجو تێبینیيو ڕەخنەكانیانەوە، بەهێزو پێزترو دەوڵەمەندتر بكەن.

لە کۆتاییشدا بە پێویستی دەزانم، کە سوپاسی ئەم بەڕێزانە بکەم:

- کاک (عدنان عثمان) سەرنووسەری پێشووی (هاووڵاتی)، کە مەردانە ڕێی بڵاوکردنەوەی ئەم زنجیرە باسەی لە بڵاوکراوەی ناوبراودا تەختو هەموار کرد.
- ستافی هاووڵاتی بە وردو درشتیانەوە، کە هەتا بیستو چوار (٢٤) ژمارەی هەفتەنامەکەیان لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەم زنجیرە باسە، پشوودرێژانە بەردەوام بوون.
- ستافی ئاوێنە بە درشتو وردیانەوە کە لە بەشی بیستو پێنجەم (٢٥)ی ئەم زنجیرەیەوە، هەتا بەشی سیو سێیەم (٣٣)و کۆتایی، دەستگەرمانە لەسەر بڵاوکردنەوەی بەردەوام بوون.
- (عبدالرحمن)ی کوڕمو کاک (حیدر مظفر)، کە یەکەمیان زۆربەی بابەتو باسەکانی ئەم زنجیرەیەو، دووەمیشیان ئەو بەشەی مابۆوەیان تایپ کردو وێڕای کاروبارو سەرقاڵیی زۆریشیان، نەیانهێشت بڵاوکردنەوەی ئەم زنجیرە باسە مەحتەل بێتو ڕابوەستێ.

خوا هەموو لایەکیان سەربەرزو سەرفرازی دنیاو دواڕۆژ بکات.

سبحانك ربِّ العِزَّة عمّا يصفون، وسلام على المرسلين،
والحمد لله ربِّ العالمين.

٢٨ ذي الحجة ١٤٢٨
٧ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨
هەولێر

## سێ ڕوونکردنەوەی پێویست

یەکەم: هەرچەندە ناوونیشانی ئەم زنجیرە باسە لێی دەفامرێتەوە، کە وێڕای بەراورد لە نێوان (ئیسلام)و (سیکۆلاریزم)دا - کە بەرنامەو ئایینی هەردوو تەوژمی (ئیسلامیی)و (عەلمانیی)ین - بەراوردی نێوان کردارو ڕەفتارو واقیعی ئەو دوو تەوژمەش بگرێتەخۆی، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك ئەوەم بە پەسند نەزانی:

١- بێگومان بەراوردی نێوان کردارو ڕەفتاری کۆمەڵێکی حوکمڕانی لەخۆدا کورتهەڵێنەرو، بۆخۆ قۆرخکەری بڕیاری سیاسیی و هێزی ئابووریی‌و سیستەمی ئیداریی وڵات - کە مەبەستم پێی هەردوو حیزبی حوکمڕانی پارتی‌و یەکیەتییە -و کۆمەڵێکی پەراوێز خراوی ماف پێشێلکراودا، بەراوردێکی ناهاوسەنگ و نامەنتیقییە.
دیارە بەشداریی تەوژمی ئیسلامییش لە حکوومەت و دام و دەزگاکانیدا، شتێکی ڕەمزییەو هی ئەوە نیە بە بەشداریی کردنی کردەیی دابنرێ.(1)

٢- ئیدارەی تەوژمی عەلمانیی ئەم قۆناغەی هەرێمی کوردستانیش، چ لەڕووی سیاسەتی نێوخۆ و، چ لەڕووی سیاسەتی دەرەکییەوە، هەم لەسەر ئاستی عێراق و ،هەم لەسەر ئاستی ئیقلیمی و نێودەوڵەتیشدا، بە ڕاددەیەك دووچاری شکست و قەیرانی جۆراوجۆر بۆتەوە، کە باسکردنی پەلکێشمان

---

(1) ئەوە لەکاتی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا بوو، بەڵام ئێستا هەرکام لە (کۆمەڵی ئیسلامی) و (یەکگرتووی ئیسلامی) لە دەرەوەی حکومەتن.

دەكات بۆ ڕەخنەی زۆر توند و تاڵی وا، كە لەگەڵ سروشتی ئەم زنجیرە باسە و ئەو ئامانجانەدا، كە بۆی نووسراوە گونجاو نیە.

٣- ئنجا دیارە، كە ئیسلامو عەلمانییەتیش سەرچاوەی فیكرو كار و هەڵوێستی تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیین، هەركاتێك سەرچاوەش ناسرا، ئەو ئاوو جۆگەیەش، كە لێیەوە هەڵدەقوڵێ، دەناسرا و بگرە بەهۆی ناسین و ئاشنایەتییمانەوە لەبارەی ئیسلامو سیكۆلاریزمەوە، تەرازوویەكمان بە دەستەوە دەبێ، كە بە شێوەیەكی ڕاست و دروست، تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و كۆمەڵ و گرووپە پێكهێنەرەكانی ن هەڵسەنگێنین.

دووەم: ئیسلامیی و عەلمانییەكانی كوردستان، لەگەڵ جیاوازییە گەورە و گرنگەكانی نێوان ئایینو بەرنامەكانی ن، ئامانجی گەورەو گرنگی زۆری هاوبەشیشیان هەن، ،ئەگەربیانەوێ لەسەر بناغەی تەبایی و پێكەوەژیانو خزمەت بە گەل و وڵات پێكەوە هاوكارو دەستبارگر بن، بۆ نموونە:

١. پارێزگاریی لێكردنو دەستەبەركردنی مافە ڕەواكانی خەڵكی كوردستان، لەڕووی نەتەوەیی و سیاسیی و ئابووریی و...هتدەوە.

٢. بەرەوپێشبردنی زانستو گەشەپێدانی ئاستی خوێندن، كە ئێستا بە شێوەیەكی ترسناك ڕوو لە دابەزینە، بە تایبەت لە زانكۆ و پەیمانگاكاندا لە سۆنگەی بەردەوام وروژاندنی جینسی و پەرەپێدانی بێ بەندوبارییەوە لە كەناڵەكانی راگەیاندنو...هتددا.

٣. ئاوەدان كردنەوەی وڵات و دروستكردنی ژێرخانی ئابووری، بە گەشەپێدانی كشتو كاڵو ئاژەڵداریی‌و پیشەسازیی.

٤. چەسپاندنیدادگەریی‌و چارەسەركردنی دیاردەی ترسناكی قڕیی‌و پڕیی‌و چینایەتی‌و، دابین كردنی پێداویستییە سەرەتاییەكانی ژیانو گوزەران بۆ سەرجەم هاووڵاتیان، وەك: خانوو بەرەو بژێوو بەرگ و پۆشاكو ئاوو سووتەمەنی‌و كارەبا..

٥. خۆشکردنی گوزەرانی خەڵکی، لە هەموو ڕوویێکەوە.
٦. پارێزگاریی لێکردنی خێزانو ئاسانکارییکردن بۆ پرۆسەی هاوسەرگیریی، کە ئێستا بەداخەوە بە شێوەیەکی بێڕەزا ڕێژەی تەڵاق بەرزبۆتەوەو، گەنجەکان دڵساردن لە پرۆسەی هاوسەرگیریی‌و متمانەو باوەڕی کوران‌و کچان بەوەفاو پاکییەکدی بەگشتیی، کەم‌و لەرزۆك بووە.
٧. پێشگیرییکردن لە داڕووخانی ئەخلاق‌و بەها بەرزەکان، بەتایبەت لەنێو توێژی گەنجاندا، کە چەندان نەخۆشی کوشندەی وەك: زیناو مەیخۆریی‌و تلیاك کێشان‌و قومارکردن، تەشەنەیان کردوە..

سێیەم چاوەڕوان بووم، کە نووسەرە عەلمانییەکان کەم‌و زۆر لەسەر ئەم زنجیرە باسە نووسینیان هەبێ، بۆ هەڵسەنگاندن‌و ڕەخنە لێگرتن، بەڵام هەتا ئێستا، جگە لە سێ چوار نووسینی سەرکێل، کە شایستەی ئاماژە پێکردن نین، هیچم نەدیوە، ڕەنگە فراوانیی بابەتەکەو، بەربڵاویی باسەکانیشی پەرچ‌و هۆکار بووبێ‌و، هیوادارم لەمەودوا، کە ئەم زنجیرە باسە لە دوو توێی کتێبێکدا کۆدەکرێتەوە، هەڵسەنگێران‌و لەبارەوە نووسرانی ئاسان ببێ،[1] پێشەکیش دەستخۆشی لە هەرکەسێك دەکەم، کە بەشێوەیەکی بابەتییانەو زانستییانە، سەرنج‌و تێبینیی‌و ڕەخنەکانی خۆی، چ لەبارەی ئەم کتێبەو، چ هەر کتێب و بەرهەمێکی دیکەشمەوە، دەخاتەڕوو، هیچ گومانیشی تێدانیە، کە بێجگە لە قسەو کتێبی خوا، ﷻ قسەو کتێب‌و بەرهەمی هیچ کەسێکی دیکە لە هەڵەو کەم‌وکووڕیی خاڵی نابێ، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: {كل بني آدم خطَّاءٌ وخير الخطَّائين التوّابون}(رواه الترمذي)، واتە: تێکڕای وەچەی ئادەم هەڵەکارن، چاکترین هەڵەکارانیش بۆلێی خوا گەراوانن.

---

[1] پاش بوونە کتێبیش هیچم نەبینی.

# دەستپێك

الحمدلله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم بارك على خاتم النُبـيين محمـد وآلـه أجمعين.

پێکەوە هەڵکردنو لەگـەڵ یـەك مـەدارکردنو، یەکـدی قبـوڵکردنو یەکـدی تەحـــەممولکردنی پێکهاتـــەکانی کۆمـــەڵگای مرۆڤـــایەتی بەگشـــتییو، هەرکۆمەڵگایەك بەتایبەتی، هەر لە تاکەکان(أفراد)ییەوە بگـرە، هـەتا دەسـتەو گرووپو کۆمـەڵو توێژو تەوژمو گەلەکان، مەرجی هـەرەگرنگو بنـەڕەتی سـا و سەلامەتیو تۆکمەییو بەردەوامییەتی، لە سۆنگەی ئـەوەوە، کـە نەکۆمـەڵگای مرۆڤـایەتییو، نە هیچ کۆمەڵگایەکی دیکەی گـەورە، یـان بچـووکیش، بـەبێ هەبوونی ئەندازەیەك لە تەباییو هاوکارییو دەستبار بۆ یەکدی گرتن، ناتوانێ نەك هەر کۆمەڵگایەکی ساغو تۆکمەبێت، بگرە ،تەنانەت هەر لە ژیانیشدا بـەردەوام بێت! ئینجا ئاشکراشە، کە بناغەو هەوێنی تەباییو هاوکارییو دەستبار بۆیەکدی گرتنیش بریتیە لە:

یەکدی قبوڵکردنو یەکدی تەحـەممولکردنو پێکـەوە ساچـاندنو مـەدارکردن، چونکە: تۆ هەتابوونی یەکێك نەسەلمێنیو، ئامادەنەبی تەحەمولی جیاوازییەکانی بکەی، هەرگیز ناتوانی لەگەڵیدا تەباو گونجاوییو هاوکارو دەستبارگری بی!

هەربۆیــەش خـوای کاربـەجێو زانـاو شـارەزا عزوجـل، لــە ئایــەتی ژمــارە سێزدە(١٣)ی سوورەتی (الحجرات) دا فەرمووویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ (الحجرات: ١٣).

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروستکردووەو، گێراومانن بە چەند گەلو تیرەیەك، تاکو یەکدی بناسنو پێکەوە هاوکاری بکەن، بێگومان بەرێزترتان لەلێی خوا، پارێزکارترتانە، بەڕاستی هەر خوا زانای شارەزایە.

خوای بەدیهێنەر لەم ئایەتە بەپێزەدا، بانگی سەرجەم مرۆڤایەتیی دەکاتو ئاگاداری دەکاتەوە، کە تاك تاکی مرۆڤەکانو تێکڕای مرۆڤایەتی، بەهەموو گەلو تیرەو هۆزەکانییەوە، ڕۆڵەی خێزان (أسرة)ێکنو لە بابو دایکێك وەپاش کەوتوون -کە ئادەمو حەوان سەلامی خوایان لێ بێ-. پاشان بەویستی کاربەجێیانەی خوا عزوجل، بەمەبەستییەکدی ناسینو هاوکاری پێکەوەکردن (بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەویو بەسەربردنی ژیانێکی مرۆڤانە) بۆ چەند گەلو تیرەیەکی ڕەنگو زمانو کلتوورو نەریت لەیەك جیاوازو جۆراو جۆر دابەشبوونە!

دوایی ئاگاداریان دەکاتەوە، کە: تاکە پێوەرو تەرازووی گەورەو بچووکیو گرانییو سووکی، بریتیە لە پارێزکاریی(تقوى)، نەك هەر شتێکی دیکەی وەك: ڕەنگ، زمان، ڕەچەڵەك، سامان، دەسەڵات ...هتد.

سەرەنجام لە کۆتاییداو بۆ ئەوەی ڕێی لافو گەزاف لە کەسانێك بگرێ، کە ڕەنگە بەهۆی پارێزکارییەوە خۆ بەسەر خەڵکیدا هەڵکێشن -کە ئەمە خۆی پێچەوانەو دژی تەقوایە- دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾، واتە: بەڕاستی هەر خوا زانیاریی تەواوی بە شتان هەیەو، هەرئەویش وەك پێویست،کەسەکان دەناسێو پێیان شارەزایە!

کەواتە:

خوای کاربەجێ ﷻ هەر لە ڕۆژی بەراوە، خواستی وابووە، کە مرۆڤایەتی دوای ئەوەی لە ڕووی بنەچەکەو ڕەچەڵەکەوە، لەسەرەتاوە لەبابو دایکێکو خێزانێکەوە هاتوەو، مرۆڤەکان هەموویان لەو ڕووەوە یەکسانن، دواتر دابەش ببن بۆچەند تیرەو هۆزو گەلێکی ڕەنگو زمانو کلتوورو دابو نەریت جیاوازو جۆراوجۆر، تاکو پاشان لەڕێی یەکدی ناسینو هاوکاری پێکەوە کردنەوە ، وەك باغو

گوڵزارێکی میوەو گوڵ زۆرو جۆراوجــۆر، کۆمەڵگایــەکی بەشــەری هەمــەڕەنگو جۆراوجۆر بنیات بنێن.

ئەمە لەڕووی حیکمەتو ئامانجی جۆراوجۆر بوونی دەنگو ڕەنــگو زمــانو، کلتووری تیرەو گەلە پێکهێنەرەکانی مرۆڤـــایەتییەوە.

هەروەها لــەو ڕووەشــەوە، کــە خــوای پــەروەردگار ﷻ ویســتی وابــووە، کــە مرۆڤـــەکان لە بواری عەقیدەو فیکرو ئیمانو کــوفرەوە - بــە حــوکمی ئــیرادەی ئازادانەی خۆیان- جیـــاوازو جۆراوجـــۆر بن، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ، إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ...﴾ (هود: ١١٨-١١٩)، واتە: ئەگــەر پــەروەردگارت ویســتبێی، هــەموو خەڵکی دەگێرا بە یەك کۆمــەڵ (بەڵام ئەوەی نەویستوە) وە بەردەوام لە راجیاییدا دەبن. مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بەزەیی پێدا بێتەوە (و ڕێنمایی بکات)، هــەر بۆئەوەش (کە جیاوازو جۆراوجۆر بن) دروستی کردوون...

هەروەها فەرموویەتی:

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ (یونس: ٩٩)، واتە: ئەگەرپەروەردگارت ویستبێی، (بــەزۆر ئیمــان بــە خەڵك بێنێ) تێکڕای ئەوانەی لەسەر زەوین، هەموویان ئیمانیان دەهێنا، جا ئایا (تۆ ئەی موحەممەد!) زۆر لەخەڵکی دەکەی، کە ببنە ئیماندار؟!

کەواتە: خوای پەروەردگاری کاربەجێ ﷻ ویســتی وابــووە، کــە مرۆڤـــەکان ئازادبنو بەخواستو و یستی ئازادانەی خۆیان ئیمان بێنن، یان ئیمــان نــەهێننو خۆیان چۆنیان حەزکرد وابکەنو، لەلایــەن خــوای بەدیهێنەریانــەوە هــیچ جــۆرە فشارێکیان لێ نەکرێ، وەك لە شوێنێکی دیکــەدا فەرمووی‌ــەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ..﴾ (الكهــف: ٢٩)، واتــە: بڵــێ: هــەق لــە پەروەردگارتانەوەیە، جاکێ حــەزدەکات، بــا بڕوابێنــێو، کــێش حــەزدەکات، بــا کافربێت...

جا لێرەوە دەگەینە ئەنجامگیرییەکی گرنگ:[1]

بابایەکی ئیسلامیی،ئەگەر چ بڕ لە ئایین و بەرنامەکەی تێگەیشتبێ، کە دەبینێ کتێبی خوا ئاوا بە ڕوونو راشکاویی، باسی یەکیەتی ڕەچەڵەكو بنەچەکەی مرۆڤایەتیی دەکاتو رایدەگەیەنێ، کە حیکمەتو ئامانجیدابەشبوونی بەشەر بۆچەند گەلو تیرەیەکی جیاجیاو جۆراوجۆر، بریتیە لە یەکدی ناسینو پێکەوە هاوکاربوونو، هیچ کەس بەهۆی ڕەنگو زمانو ماڵو سامانو ڕەگەزو ڕەچەڵەکەوە، پلەو ئیمیازی بەسەر کەس دانیە، بە هیچ رەنگێك ڕێ بەخۆی نادات و بەخۆی ڕەوانابینێ، بەهۆی ڕەنگو ڕەگەزو سامانو زمانو گەلو تیرەکەیەوە، لافو گەزاف بەسەر خەڵکی دیکەدا لێبداتو بەکەمتر لەخۆی تەماشایان بکاتو ...هتد.

هەروەها بابایەکی ئیسلامیی تێگەیشتوو لە ئایینەکەی، کاتێك دەبینێ قورئانی بەرێزی خوا عزوجل، ئاوا بەڕوونو راشکاویی جەخت لەسەر ئازادیی مرۆڤەکان دەکاتەوە لەبەرانبەر ئیمان هێنـ نداو، ،تەنانەت ڕێ بە پێغەمبەری خوا(محمد)یش ﷺ نادات، کە هیچ جۆرە تۆبزیکارییو گوشارێك بەکاربێنێ بۆ وادارکردنو ناچارکردنی خەڵکی بەئیمان هێنان، بابایەکی وا بەهیچ بیانوو پاساوێك ڕێ بەخۆی نادات، کە ،تەنانەت هەر بیریش لە پەنابردنە بەر توندوتیژییو زەبروزەنگ بکاتەوە بۆ فەرزکردنو سەپاندنی ئیمانو ئیسلام بەسەر کەسانێکدا، کە حەزناکەن ئیمان بێننو ڕوو لە خوابکەن!

ئنجا ئەو ڕاستییەی، کە ئێستا بەشێوەیەکی تیۆرییو مەبدەئیی قسەی لەبارەوە دەکەین، وەك ڕۆژی ڕوون لە مێژووی سێزدەسەدەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، بە درەوشاوەییو بەرجەستەکراوی دەیبینین، چونکە لەو ماوە درێژەی تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامییدا، دەیان جۆرە گەلو هۆزی جیاجیاو، چەندان ئایینو فیکرەی

---

[1] لە کتێبی (چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر رۆشنایی عەقڵ و وەحی دا) بەدرێژیی باسی (تەبایی و پێکەوەژیان)مان کردوە.

جۆراوجۆر توانیویانە، لە ژێر سایەو ڕکێفیدا، درێژە بە ژیانو بوونی خۆیان بدەنو بمێننو لەبەین نەچن، دیارە ،ئەگەرجاروبارێکیش هەندێك هەڵەوپەڵە لەو بــوارەدا ڕوویاندابێ، ئەوە بێگومان لەسۆنگەی لادان(إنحراف)ی هەندێك لە دەسەڵاتدارانەوە بووە لە حوکمو بڕیارەکانی شەریعەت و، شتێکی ئاشکراشە، کە ڕیزپەڕ(شاذ)، نەك هەر بنچینەی پێ هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو بوونی زیاتر ئیسپات دەکات.

باشــترین نموونــەش لــەو بــارەوە لــە مێــژووی کۆنــدا، (ئیســپانیا)ی ئێســتاو (ئەنــدەلوس)ی پێشــوویە، کــە لــەماوەی هەشــت ســەدە حــوکمی ئیســلامییدا نەصرانییەکانی ئەو وڵاتە - مەگەر ئەوەی بەئیرادەی ئازادانــەی خــۆی مســوڵمان بووبێ، ئەگەرنا- هەر لەسەر ئایینی خۆیــان ماونــەوەو، هــیچ کــەس بەدرێــژایی هەشت سەد (٨٠٠) ساڵ، ناچاریی نەکردن دەست لە ئایینە گۆڕراوەکــەی خۆیــان هەڵبگرن! کەچی کاتێك، کە حوکمو دەســەڵاتی ئیســلامیی لــەو وڵاتــەدا نــەما، هەرزوو نەصرانییەکان مسوڵمانانیان خستە بەردەم دوو شتەوەو سەرپشکیان کردن لەنێوان: بوونە نەصرانییو واز لە ئیسلام هێنا ن، یان کوژرانو سەربراندا!

سەرئەنجام ئەو هــەموو هــەزارەها مســوڵمانەیان، کــە چــەندان پشــتیان بــە مسوڵمانەتی لەو وڵاتەدا گوزەراندبوو، سەربڕی، یان لــە ئیســلام هەڵگێڕایــەوەو ژمارەیەکیشیان لێ ئاوارەو دەربەدەر کران، کــە ئەمانــەیان زۆر خــاوەن شــانسو بەختەوەربوون!!

لە مێژووی هاوچەرخیشماندا، قەڵاچۆکرانی ملیۆنان مسوڵمانانی ژێــر ســایەی شوومی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو، لەلایەن حوکمڕانانی کۆمۆنیستەوە، بەتایبەت (ستالین)، وە کوژرانو دەربەدەرکرانی هەزاران مســوڵمانی هیندســتان بەدەســتی هیندە گاپەرستو بتپەرستەکان و، قەتڵ و عام کرانی خەڵکێکی زۆری (بۆســنەو هەرسك)و (کۆسۆڤۆ)یی، بەدەســتی صــیربە نەصــرانییەکان و، خــاك زەوتکــرانو کوژرانو گیرانی - هەتا ئەم سەعاتەش بەردەوامی- مسوڵمانە فەلەسطینی یەکان، بەدەستی جوولەکە زایۆنییەکان... چەند نمونەیەکی زەقن لەوبارەوە.

ئنجا هەر لێرەوەش جیاوازی بنەڕەتی نێوان جیهانیێتی ئیسلام (عالمیة الأسلام)و جیهانگیریی (عولمة)مان بۆ دەردەکەوێ، چونکە هەرچی ئیسلامە، بەڵێ، دەیەوێ ببێتە سایەو سێبەری مرۆڤایەتییو، هەموو خەڵکی سەرزەوی لە دوایین نوسخەی هیدایەتی خوا، بەرنامە ڕاستو دروستو لەگەڵ فیطرەتدا گونجاوو دەستکاریی نەکراوەکەی بەهرەمەند بن، بەڵام نەك بە زەبروزەنگو سەپاندن، بەڵکو لە ڕێی بانگەوازکردنیانو تێگەیاندنو بەرچاو ڕۆشن کردنەوەو ئیقناع کردنیانو ئیمان هێنانی ئازادانەیانەوە، وەك دەقەکانی قورئانو سوننەت، بەراشکاویی ڕایانگەیاندوەو مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیش، تارادەیەکی زۆر بەرجەستەی کردوە.

بەڵام جیهانگیریی (Globalization) دەیەوێ بەزۆری زۆرداریی‌و، بەزەبری ئاگرو ئاسنو ترساندنو تەماع وەبەرنان (تخويف وتطميع)، دونیاو خەڵك بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، بیرۆکەو بەهایەکانی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێو، بەو جۆرەیان لێ بکات، کە خۆی حەزی لێیەو لەو قاڵبەیان بدات، کە پێشتر بۆیداڕشتوون، ئەوەش هەمووی بەمەبەستی دەسەڵات ڕانانی زیاترو، دەست بەسەرداگرتنی زیاتری خێروبێرەکانی سەرزەوی‌و ژێرزەوی!

هەڵبەتە هەرکام لەو دوو هەڵوێستەی (جیهانیێتی ئیسلام)و (جیهانگیریی)[1] یش بەر لە لەبەرچاوگرتنی بناغەی عەقیدەیی‌و فیکریی هەرکامێکیان، شتێکی سروشتی‌و چاوەڕوانکراوە، چونکە:

هەرچی ئیسلامە - وەك پێشتر باسمان کرد- وا تەماشای مرۆڤەکان دەکات، کە سەرجەم ڕۆڵەی یەك خێزاننو، بەمەبەستییەکدی ناسینو هاوکاری پێکەوە کردن، بۆ چەند گەلو تیرەیەك دابەش کراون و، هیچ کەس بە هیچ بیانووو پاساوێك بۆی نیە لافی پلەو ئیمتیاز هەبوون بەسەر کەسدا لێبدات و، مرۆڤەکان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ئازادکراونو، لەنێوان ئیمان هێنانو نەهێناندا، سەرپشك

---

[1] لە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا ئالقەیەکی سەربەخۆمان بۆ توێژینەوەی ئەم بابەتە تەرخان کردوە. بڕوانە: چاپی پێنجەم/ نوسینگەی تەفسیر.

کراون - بەمەبەستی تاقیکردنەوە - وە تۆبزییان لێنەکراوە، ئــەوە لەلایەکــەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، ئیسلام لەبەرانبەر دەوڵــەتو دەســەڵاتی خۆیــدا، خــەڵکی کردۆتە سێ بەش:

١. مسوڵمان.

٢. نامسوڵمانی تەباو گونجاو.

٣. نامسوڵمانی دژو ناکۆك.

کەواتە:

مەرج نیە هەرکەسێك مسوڵمان نەبووو نەهاتە نێو ئیسلامەوە، حەتمەن هــەر دژو دوژمن بێــت، بەڵکو دەگونجێ، کــە لاشــەڕو بــێ لایــەن (محایــد) بــێو، بــێ لایەنییەکەشی بەچەند شێوەیەك تەعبیری لێــدەکرێ، وەك: ســەرانە (الجزیــة) دان، شەڕلەگەڵ نەکردن (الموادعة)، پەیمان لەگەڵ بەستران (المعاهدة).

جا بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد،دەڵێین:

لەسۆنگەی ئەوەوە، کە ئیســلام واســەیری مرۆڤــەکان دەکــات، کــە خــوای کاربەجێ خۆی بۆ چەند گەلو تیرەیەك دابەشی کردوونو، لەبەرانبەر ئیمان هێنانو نەهێنانیشدا ئازادی کردوون، هیچ کاتێك نەك هەربەپێویست، بــەڵکو بەڕەواشــی نازانێ، کە بەهیچ جۆرێك دەستکاریی ڕەنگو زمانو ڕەگەزو ڕەچەڵەکیان بکات، یان لەسەر ئیمانو ئیسلام ناچاریان بکات، بەڵکو هەر بەوشێوەیەی، کە هەن لــە رووی ڕەنگو زمانو ڕەچــەڵەکەوەو، ئــارەزوو دەکــەن، کــە بــن لــەڕووی فیکــرو عــەقیدەوە، مامــەڵەیان لەگەڵدا دەکات.

هەڵبەتە هەر ئەوەش لە بەرنامەیەکی ڕەببانییو ئینسانیی وەك ئیسلام چاوەڕێ دەکرێ، ئایینێك، کە لەلایەن خواو پەروەردگاری هەموو خەڵکییەوە هاتوەو، ڕووی دەمیشی لەسەرجەم ئینسانەکانە بەبێ جیاوازیی، دیارە بەرنامەیــەکی وا کاتێــك دەسەڵاتی دەبێ، کەشو هەویی ژیانو گوزەرانێکی مرۆڤــانەی وا بۆ ئینسانەکان

فەراهەم دێنێ، کە لە بەزەیی‌و حیکمەت‌و دادگەری خوای پەروەردگار چاوەڕێ دەکرێ و، شایستەی مرۆڤێکیشە، کە خوا ئاوەدانکردنەوەی زەوەی پێ سپاردوەو کردوویەتە خەلیفەی خۆی: ﴿..هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ...﴾ (هود:٦١)، ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً...﴾ (البقرة:٣٠).

بەڵام بیرۆکەی جیهانگیریی، چونکە:

یەکەم: ڕەگ‌و ڕیشەو بنەمایەکەی بریتیە لە پاوانخوازیی‌و، خەڵك‌و دونیا کۆنترۆڵ کردن‌و کوێخایەتیکردن‌و خەڵك ژێردەست کردن.

دووەم: خەڵك لە بەرانبەر خۆیدا لە نێوان دوو شتاندا سەر پشك دەکات:

أ- تەسلیم بوون‌و ڕەگەڵ کەوتن‌و پەیڕەویی لێکردن.

ب- سەنگەر لێگیران‌و شەڕلەگەڵ کران.

واتە: جیهانگیریی بێ لایەن (محايد)، قبووڵ ناکات، بەڵکو دەڵێ: یان دەبێ لەگەڵم بی، یان دەبێ ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەو شەڕ بی! ئەمەش (جۆرج w بۆش) زۆر بە ڕوونی رایگەیاند، پاش ڕووداوی یازدەی ئەیلول، کە گوتی: (هەرکەسێك لەگەڵمان نەبێ، دژمانە!).

بەڵێ، لەسۆنگەی ئەوەوە جیهانگیریی- بە لەبەرچاوگرتنی سروشتی- ناتوانێ کە هەمیشە کەڵکەڵەی دونیا داگیرکردن‌و، کوێخایەتی بەسەرخەڵکیدا کردنی لە کەللەدا نەبێ‌و، هەوڵ نەدات دونیاو مرۆڤایەتیی، وەك تۆپێك لە چەنگ بگرێ‌و لەو قاڵب‌و بۆتەیەدا، لەقاڵبیان بدات، کە پێش وەخت بۆی سازکردوون، وەك ئێستا بە زەقیی لە هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتاری ئەمریکێی دەمڕاستی جیهانگیرییدا دەیبینین، هەربۆیەش هەندێك ناویان لە (عەولەمە) ناوە: (ئەمرەکە) واتە: بە ئەمریکاییکردنی دنیا !

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە رابرد، دەڵێم:

ئێستا، کە لە کوردستانو عیراقدا، وەك سەرجەم وڵاتـانی دیکـەی مسـوڵمان نشینی جیهانی ئیسلامیی، بەگشتیی دوو تەوژمی فیکریی‌و سیاسیی هـەن، کـە بـریتین لـە: تـەوژمی ئیسـلامیی‌و تـەوژمی عـەلمانیی. کـە ،ئەگەربمانـەوێ زۆر بەکورتی‌و ڕوونی پێناسەیان بکەین - بەبڕوای من - دەبێ بڵێین:

((تەوژمی ئیسلامیی، ئەو کۆمـەڵە خەڵکەن، کە دەیانـەوێ ژیـانو گـوزەرانی تـاکیی‌و خێزانیـی‌و کۆمەڵایـەتی‌و سیاسـیی‌و ئـابووریی و...هتـدی خۆیـانو کۆمـەڵگاکەیان لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتداو، لەسەر بناغەی شەریعەت ڕێك بخەنو بگوزەرێنن.))

وە:

((تەوژمی عەلمانی ئەو کۆمـەڵە خەڵکەن، کە دەیانەوێ ئاینو شەریعەتی خـوا لە ڕێکخستنی ژیانو گـوزەرانی تـاکیی‌و کۆمەڵایـەتیی‌و سیاسـیی‌و ئـابووریی و...هتدی خۆیانو کۆمـەڵگاکەیاندا، پرسی پێ نەکرێو حیسابی بۆ نەکرێ. مـەگەر لە چەند مەسەلەیەکی شەخصیی‌و ڕووحییدا!)) بڕوانە: ( الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي) د.كميل الحاج، ص:٣٧٣ (العلمانية والعلمنة) ( secularism and secularization).

شایانی باسیشە، کە هەرکام لە تەوژمی ئیسسلامیی‌و عـەلمانیی کـەمو زۆر، خاوەنی پێگەی جەماوەری خۆیانن‌و، بـەردەوامیش ڕێـژەی ئـەو پێگەیـەیان لـە هەڵکشینو داکشیندایەو، حاڵەتێکی وەستاوی نیە.

جا من پێم وایە، کە ئەم دوو تـەوژمە، هەرچەندە بەگشـتیی دژو پێچـەوانەی یەکن، بەڵام وێڕای خاڵـە جیاوازەکـانی نێوانیـان، چـەندان خـاڵی هاوبەشیشـیان لەنێواندا هەن، کە دەگونجێ ئەو خاڵە هاوبەشانەی نێوانیان، بکرێنـە پـردی پێـك گەیشتنو بناغەی تەبایی‌و هاوکاریی‌و دەستبار بۆ یەکدی گـرتن لـە زۆر بـواردا، بەشێوەیەك، کە لە جیاتی دژایەتییەکدی کردنو وزەو توانـای خـەڵكو وڵات بـە

فیرۆدان بۆ نەهێشتن، یان بێهێزکردنی یەکدی، پەناببرێتە بەر دان بـەخۆدا گـرتن‌و یەکـدی تەحـەممولکردن‌و سـەماحەت‌و سـینەفراوانی لـە خاڵـە جیاوازەکانـداو، یەکخستنی وزەو توانا جۆراوجۆرەکانیش، بۆ هێنانەدی خاڵ‌و ئامانجە هاوبەشەکان، گومانیشی تێدانیە، کە ئێمە لەم قۆنـاغ‌و هـەل‌و مەرجـە ناسـك‌و دژوارەدا، کـە کوردستان‌و عێراق‌و ناوچەکەو دونیاشی پێدارەت دەبن، لەهـەموو کاتێـك زیـاتر پێویستیمان بەتەبایی‌و هاوکاری‌و یەکڕیزیی هەیـە و، کۆمـەڵگای پێشـکەوتووو سەرکەوتووش ئەو کۆمەڵگایەیە، کە هەمیشە پێکهاتەکانی لە هەوڵی دۆزینەوەی هەرچی زیاتری خاڵ‌و ئامانجی ڕەوێی هاوبەشدا بـن، بەپێچەوانەشـەوە هەرگـەل‌و کۆمەڵگایەك - بەتایبەت لە ئاستی خەڵکی بڕیار بەدەستدا- بەردەوام سەرگەرمی پشکنین بێ بۆ دیتنەوەی خاڵی جیاوازی‌و زیاترو زەقکردنەوەیان‌و، فەرامۆشکردنی خاڵ‌و ئامانجە هاوبەشەکان، گـەل‌و کۆمـەڵگایـەکی دواکـەوتووو دۆڕاوە، چـونکە بەدەستی خۆی گۆڕی خۆی هەڵدەقەنێ‌و وزەو توانایەکانی خۆی لـە دژی ئاینـدەو بەرژەوەندی یەکانی خۆی بەکاردێنێ ،سەرئەنجام دەستی لەبنی هەمبانـەی بـەتاڵ دەردێنێ! شایانی باسیشـە، کـە ئامـانجی سـەرەکی نووسـینی ئـەم باسـە، وەك پێشتریش ئاماژەی پێکرا بریتیە لە: خستنە ڕووی خاڵە هاوبـەش‌و جیاوازەکـانی نێوان هەردوو تەوژمـی ئیسـلامیی‌و عەلمانیی‌و ڕوونکردنەوەی ئـەو ڕاسـتییە کـە: وێڕای هەبوونی چەندان جیاوازی گەورەو ڕیشەیی لـەنێوان تـەوژمی ئیسـلامیی‌و عـەلمانییدا، کۆمەڵێك خاڵ‌و ئامانجی هاوبەشیشیان لەنێوانـدا هـەن، لـە هـەموو بوارەکانی فیکریی‌و کلتووریی‌و سیاسیی‌و ئابووریی کۆمەڵایەتیی‌و نەتەوەییدا، کە دەگونجێ بکرێنە بناغەیەکی پتەو بۆ تەبایی‌و پێکەوە ژیان‌و هاوکاری نێوانیان و، سەرەنجام تۆکمەیی کۆمەڵگاو ئاوەدانی وڵات‌و بەختەوەری خەڵك.

لەکۆتایی ئەم (دەستپێك)ەشدا بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورت بە چەند مەسەلەیەك بکەم:

١. حاڵەتی ئاسایی‌و سروشتی خەڵکێکی مسوڵمان، ئەوەیە،کەجیهانبینی‌و عەقیدەو ڕەوشت‌و ئاکارو هەڵس‌و کەوتیان، هەڵقوڵاوی ئایین‌و بەرنامەکەیان بێ، کە ئیسلامە، بۆیە شتێکی نامەنتیقی‌و نەگونجاوە، کە کەسێك خۆی پێ مسوڵمان بێت‌و ڕووبکاتە سیکۆلاریزم، مەگەر لە یەکێکیان، یان هەردووکیان حاڵی نەبووبێ!

٢. وەك چۆن لەنێو تەوژمی ئیسلامییدا، وێڕای کەسانێکی هاوسەنگ‌و میانجی، کە زۆربەی هەرە زۆری تەوژمەکە پێك دێنن، هەندێك کەسی لادەرو تێپەڕێنەر لە سنوورەکانی شەریعەتیش هەن، لەنێو تەوژمی عەلمانیشدا، وێڕای کەسانێکی تێپەڕێنەر(متطرف)و کینەدار(حاقد) بەرانبەر بە ئیسلام‌و ئیسلامییەکان، هەندێك کەسی بە ویژدان‌و خاوەن مەنتیقیش هەن، کە بەداخەوە هەتا ئێستا کەمینەن‌و ئومێد وایە بەرەو زیادبوون بچن.

٣. ئیسلامییەکان ئایین‌و بەرنامەکەیان، کە لە قورئان‌و سوننەتدا بەرجەستەیەو لە زانیاریی‌و بەزەیی‌و کاربەجێیی خوای پەروەردگارەوە هاتوە، بەبێ هەڵەو پەڵە دەزانن، ئەم قەناعەتەشیان بەشێکە لە ئیمان‌و عەقیدەیان، بەڵام بێگومان خۆیان بەبێ هەڵەو خراپە نازانن‌و پێیان وانیە، کە هەمیشە هەق‌و ڕاستی لەلێی وانە، لەو مەسەلانەدا، کە دەقی شەرعی ڕاست‌و ڕاشکاویان لەسەرنیە، چونکە هەمیشە خۆ پێ لەسەر هەق بوون‌و ڕاستیی‌و هەق لەخۆدا کورت هەڵێنان، عادەتی فیرعەون‌و تاغوتەکانە، وەك فیرعەون گوتوویەتی: ﴿...مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ (غافر: ٢٩)، واتە: جگە لەوەی خۆم پیشانتان دەدەم، ڕێ نادەم هیچ ڕایەکی دیکەتان هەبێ، هەرچی منیش ڕێنماییتانی پێدەکەم ،هەر ئەوەیە ڕێی ڕاست! هەروەها خۆ پێ بێگوناهو خراپە بوون، پێچەوانەی چەندان دەقی قورئان‌و سوننەتە، بۆنموونە پێغەمبەر

ﷺ فەرموویەتی: {كل بني آدم خطاءٌ وخير الخطّائين التوابون} (رواه أبو داود)، واتە: هەموو وەچەی ئـادەم هەڵـەکارنو، چـاکترین هەڵـەکارانیش پەشـیمان بووەوانن.

دیارە لە زانیاریی‌و حیکمەت‌و بەزەیی ڕەها (مطلق)ی خوای بێ وێنەشەوە، تەنیا هەق‌و ڕاستیی‌و چاکەو خێری ڕەها پەیدا دەبـێ و، لـە مرۆڤـــە توانـا سنوورداره‌کانیشەوە، هەر بەرهەمی نیسبیی‌و لەقەدەر خۆیان چاوەڕێ دەکرێ، چونکە: (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ).

٤. بەدیلی تەبایی‌و هاوکاریی‌و ئیسلامیی‌و عەلمانییەکان، بریتیە لە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی و، بەبێ بەیەك ئاشـنابوونیش، تـەبایی‌و هاوکـاریی نایەتـەدی، کەواتە: باهەوڵ بدەین زیاتر پێك ئاشنا بین‌و چاکتر لـە بیروبۆچـوونی یەکـدی شارەزابین، نەك لەپشت پەردەی ڕەشـەوە، یـان لـەدوورەوەو لەسـەر بنـەمێی هەواڵ‌و زانیاریی هەڵەو بەدگومانیی، سەیری یەکـدی بکـەین، یـان بـەهۆی ڕەخنەو گلەیی مانەوە بەرانبەر بەکەسێك، یان چەندکەسێك، حوکمی سەلبیی گشـتیی بەسـەر خـەڵکێك‌و تـەوژمێك دا بـدەین، کـە بەداخـەوە ئـەوجۆرە هەڵوێستانە زۆرن!

ئێستاش کە هەتا ڕاددەیەك ئامانج‌و مەبەستی ئەم باسە ڕوونبۆوە، کۆتایی بەم (دەستپێك)ە دێنین، کە پێشەکی‌و ڕێ خۆشکردن بوو بۆ بابەتەکانی ئەم باسەو خوا یاربێ لە داهاتوودا بە زنجیرەیەکی چەند ئاڵقەیی دەخرێنەڕوو.

سبحانك اللهم و بحمدك،

أشهد ألا إله إلا انت، أستغفرك وأتوب إليك.

٧ی ڕەبیعی دووەمی ١٤٢٨ك

٢٤ی نیسانی ٢٠٠٧ز

هەولێر




# ئاڵقەی یەکەم:

## لە بواری بوونناسیی (معرفة الوجود) دا

خوێنەری بەڕێز!

خوا پشتیوان بێ لەم ئاڵقەی یەکەمەدا، هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەر بابەتی (بوونناسیی) هەرکام لە تەوژمی ئیسلامییو عەلمانیی، بـەڵام لـە سـەرەتاوە بـە پێویستی دەزانم، هەم پێناسەی (بوونناسیی) بکـەینو چـەمكو واتایەکـەی ڕوون بکەینەوە، هەم گرنگییو پێویستییەکەیشی بخەینەڕوو:

## ١- پێناسەی بوونناسیی:

بەكورتیو پوختی مەبەست لە (بوونناسیی)، كە (دنیابینی)یشی بۆ بەكاردێ،[1] چۆنیەتی ناسینو لێڕوانینی بوون (وجود)ە، بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو (الخالق والخلق)ەوە، بە جۆرێك كە مرۆڤ وەڵامێكی مەنتیقیو ڕاستو ڕوونی ئەو شەش پرسیارە خوارِسك(فطري)انەی چنگ بكەون، كە لە عەقڵو دڵیدا هەنو، (فەلسەفە)ش هەر لە بەرەبەیانی سەرهەڵدانییەوە، لە هەوڵی وەڵامدانەوەیاندا بووە، كە بریتین لە:

چی؟ كێ؟ چۆن؟ كەی؟ بۆچی؟ بۆ كوێ؟

واتە:

١- ئەم بوون (وجود)ە چییە؟

٢- كێ هێناویەتەدی؟

٣- چۆنی دروستكردوە؟

٤- كەی دروستی كردوەو كەی كۆتایی دێ؟

٥- بۆچی دروستی كردوە؟

٦- بەرەو كوێ دەچێو سەرەنجامی چی دەبێ؟

كەواتە:

(بوونناسیی) بریتیە لەوەی، كە مرۆڤ خۆیو دەوروبەرو بوونەوەرو خوای بەدیهێنەرو خاوەنی بناسێو، حیكمەتی دروستكرانی خۆیو بوونەوەرو ئاكامو سەرەنجامیان بزانێو، لە سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی ژیانی دنیا تێبگات و، لێی حاڵی ببێ، ئایا چ پایەو پلەیەكی لە بوونەوەردا هەیەو (مَحلّ الإعراب)ی چییەو چۆنە؟!

---

[1] بە ئینگلیزی (Antology) ئەنتۆلۆژیی، پێ دەگوترێ.

## ٢- گرنگیی و پێویستی بوونناسیی:

گرنگیی‌و پێویستی (بوونناسیی) وێڕای ئەوەی، کە وەڵامگۆو تینوێتی شکێنی عەقڵ‌و فیترەتی مرۆڤــە، لەوەدایە، کە مرۆڤــ ،ئەگەرمیزاجی تێـك نەچـوویێ‌و دووچاری نەخۆشی نیفاق‌و دوانەتیی (إزدواجیــة) نەبوویێ، هەمیشە بیرو بۆچوون‌و هەڵســوکەوت‌و هەڵوێســتەکانی هــەڵقوڵاوو زادەی تێڕوانینیــەتی لــە بــارەی (بوون)ەوەو، هەمیشە هەڵس‌و کەوت (تصـرّف)ی مرۆڤـــ، ڕیشـەکەی لـە زەوی تێڕوانینی (تصوّر)یدا دەڕوێ‌و بە کورتی: ئینسان چۆن بیر بکاتەوە، ئـاواش ڕەفتـار دەکات.

دیارە (بوونناسیی)و (بیروبڕوا) (عقیدة)ش هەرچەندە پەیوەنـدی پتـەویان لـە نێواندا هەیە، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە (بوونناسـیی) بناغــەی بیروبڕوایــەو هــیچ کاتێك هیچ جۆرە عـەقیدەیەك بە بێ جۆرە (بوونناسیی)یەك پەیدا نابێ، جـا ئـەو بوونناسیی‌و عـەقیدەیە ڕاست بن، یان هەڵە، بــەڵام چــەند جیاوازییەکیشـیان لــە نێواندا هەیە، چونکە (بوونناسیی) وەك پێشتر گوتمان بریتیە لە هەوڵدان بۆ ناسین‌و پەیپێبردنی (بوون) و، (بیروبڕوا)ش بریتیە لە (هەڵوێســت نوانــدن) لــە بەرانبــەر (بوون)دا بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراوەوە.

ئێستاش بە چاکی دەزانم بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی چەمك‌و واتای (بوونناسیی)و جیاوازی لەگەڵ (بیروبڕوا)دا، بەراوردێکی خێرایان لە نێواندابکەین:

١- (بوونناسیی) چۆنیەتی ناسینی (بوون)ە، بەڵام بیروبڕوا (عقیـدة) هەڵوێســت نواندنە لە بەرانبەر (بوون) دا.

٢- بیروبڕوا هەمیشـە پەیوەسـتە بــە بوونناســییەوەو، بــەبێ وی نابــێ، بــەڵام بوونناسیی بەبێ بیروبڕواش دەبێ.

واتە: بەبێ بوونناسییەکی ڕاست‌و دروست، بیروبڕوای ڕاست‌و دروست پەیـدا نابێ، بەڵام دەگونجێ مرۆڤــ بوونناسیی‌و دنیابینییەکی ڕاستی هەبێ، کەچی خاوەنی بیروبڕوایەکی پووچ‌و هەڵەبێ.

٣- هەرچەندە بیروبڕوا لە بووناسییەوە هەڵدەقوڵێ، بەڵام ئەوەی سەنگی مەحەكو پێوەری هەڵسەنگاندنی ئینسانە، بیروبڕوایە، نەك بووناسیی، چونکەوەك پێشتر گوتمان: بووناسیی هەڵهێنجراوو ڕەنگدانەوەی واقیعی بوونە، بەڵام بیروبڕوا بریتیە لە هەڵوێستی مرۆڤ لە بەرانبەر بووندا، کردەوەیەکە بە ویستو خواستی ئازادانەی خۆی هەڵی دەبژێرێ، ئنجا دیارە زانیارییەکیش، کە کردەوەو هەڵوێستی لەگەڵ نەبێ، بێ بایەخەو خاوەنەکەی لێی بەهرەمەند نابێ، بۆ نموونە: پزیشکێك، کە دەزانێ مەیخۆریی و جگەرەکێشان خراپو زیان بەخشن، بەڵام لێیان ناپرینگێتەوە، زانیارییەکەی بێ سوودە!

کەواتە:

بە بیروبڕوا، مسوڵمانو کافر لەیەك جیادەکرێنەوە، نەك بە بووناسیی، چونکە جاری وایە مسوڵمانێكو کافرێك وەك یەك (بوون)یان ناسیوەو دەزانن، کە خوایەکی بەدیهێنەرو پەروەردگار ئەم بوونەوەر (کَوْن)ەی هێناوەتەدیو سەرپەرشتی دەکات، بەڵام لەوەدا لە یەك جیادەبنەوە، کە مسوڵمانەکە لەگەڵ داخوازییەکان (مُقْتَضیات)ی بووناسییەکەیدا ڕاست دەکات و، ئەو تاکە بیروبڕوا ڕاستەی، کە لێی هەڵدەقوڵێ، دەیکاتە عەقیدەو هەڵوێستی خۆی، کەچی نامسوڵمانەکە مل بۆ وەرگرتنو تەبەننی کردنی ئەو ئەنجامو بەرهەمەی بووناسییەکەی نادات!

ئێستاش با سەرنج بدەین، داخۆ تەوژمی ئیسلامیی، خاوەنی چ جۆرە بووناسییەکەو، پاشانیش دەچینە سۆراخی جیهانبینی تەوژمی عەلمانیی (سیکۆلاریست):

## یەکەم: بوونناسیی تەوژمی ئیسلامیی:

وەك پێشتر گوتمان (بوونناسیی)، یان (دنیابینیی)، کە لە دێر زەمانەوە کاری هەرەگەورەو گرنگی فەلسەفە بووە، بریتیە لە هەوڵدان بۆ ناسینی بوون (وجود) لە میانەی وەڵامدانەوەی شەش پرسیارە خواڕسکەکانی مرۆڤـدا، کە ئاماژەمان پێیان کرد.

جا ئێستا با سەرنج بدەین، داخۆ ئیسلام چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە: خوای زاناو شارەزا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سووڕەتی (هود)دا فەرموویەتی:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە، کە ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژاندا دروستکردوون، ئەو کاتە بارەگا(عرش)ەکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی چاکترە،ئەگەربڵێی: بێگومان ئێوە پاش مەرگ زیندوو دەکرێنەوە! ئەوانەی بێ بڕوان دەڵێن: ئەمە جگە لە جادوویێکی ئاشکرا، چی دیکە نیە!

ئەگەربە وردی سەرنجی ئەم ئایەتە بە پێزە بدەین، هێڵە سەرەکییەکانی بوونناسیی ئیسلامیی تێدا بەدی دەکەین، با بزانین چۆن؟

پێشتر باسمان کرد، کە هەموو مرۆڤێك بە فیترەت ئەم شەش پرسیارەی لە عەقڵو دڵدا هەن:

ئەم بوونە:

١- چییە؟

٢- کێ هێناویەتەدی؟

٣- چۆن هاتۆتەدی؟

٤- کەی دەستی پێکردوەو کەی کۆتایی دێ؟

٥- بۆچی هێنراوەتەدی؟

٦- سەرەنجامی چییە؟

دەجا ئەم ئایەتە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەی لە خۆ گرتوە:

**١ و٢: پرسیاری یەکەم و دووەم: ئەم (بوون)ە چییەو کێ هێناویەتەدی؟!**

ڕستەی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ وەڵامیان دەداتەوەو رایدەگەیەنێ، کە (بوون) بە گشتیی دوو جۆرە:

أ- بوونەوەرێکی دروستکراو (كَوْنٌ مَخْلوق)، کە حەوت ئاسمانەکانو زەوی پێکهێنەرینی.

ب- خوای بەدیهێنەر (الله الخالِق) تبارك‌و تعالى، کە لە هیچ شتێکیدا وەك هیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێ: ﴿..لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَىۡءٌ..﴾ (الشورى: ١١).

شایانی باسیشە خوای کاربەجێ لە چەند ئایەتێکی قورئاندا، کە باسی بوونەوەر(كَوْن)ی کردوە، بە ئاسمانو زەوی، یان ئاسمانەکانو زەوی، یان حەوت ئاسمانەکانو زەوی، یان حەوت ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، پێناسەی کردوە، بۆ نموونە:

﴿ قَالَ رَبِّى يَعۡلَمُ ٱلۡقَوۡلَ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ..﴾ (الأنبياء: ٤).

﴿ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ؟ قُلِ ٱللَّهُ..﴾ (الرعد: ١٦).

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ..﴾ (الإسراء: ٤٤).

﴿ مَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى..﴾ (الأحقاف: ٣).

جا دیارە ئێمە هەتا ئێستا، جگە لەوەی لە ڕێی وەحییەوە پێمـان گەیشـتوە، شتێکی وا لە بارەی حەوت ئاسمانەکانـەوە -کـە بێگومـان زەویـش دەگرنـە نێـو خۆیان- نازانین، بـەڵام بـە بەڵگـەی فەرمایشـتی خـوا: ﴿..وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ..﴾ (الملك: ٥)، واتە: ئاسمانی نزیك - لـە ئێـوە- مـان بـە چـرایان (کـە مەبەست پێی ئەستێرەکانە) رازاندۆتەوە، وا پێدەچێ، کە هەرچی تـا ئێسـتا بـە دووربینەکان بینراوەو دەبینرا لە ئەستێرەو خڕۆکەو کەهکەشانەکان، هەموویان لە سنووری ئاسمانی یەکەم دابن، کە لە هەموو ئاسمانەکانی دیکە لێمانەوە نزیکترەو خواش فەرموویەتی ئاسمانی نزیکمان کردۆتە چراخان! وە شەش ئاسمانەکانی دیکە لە سەرووی ئاسمانی یەکەمەوەن، هەتا ئێستاش سنووری ئاسمانییەکـەمیش دیـار نیە!

لەبارەی وەسف و پێناسەی خوای بەرزو مەزنو بێ وێنەشەوە، قورئان زۆر شتی خستۆتە ڕوو، کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیانمان نیەو زۆر بە کـورتی ئامـاژە بـە چەند شتێك دەکەین:

١- خوا ﷻ تاك و بێ وێنەیەو هیچ شتێك وەك وی نیە:

وەك فەرموویەتی:

* ﴿..لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ...﴾ (الشوری: ١١).

٢- خوا تاكو بێ نیازو جێی نیازەو، کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووەو، بێ هاوەڵ و بێ هاوتایە:

وەك فەرموویەتی:

* ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ (الإخلاص: ١-٢-٣-٤).

٣- خوا خاوەنی هەموو ناوێکی هەرەچاكو، هەموو سیفەتێکی هـەرە بـەرزو پەسندە:

وەك فەرموویەتی:

* ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ (طه: ٨).
* ﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ (الروم: ٢٧).

٤- خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێ‌و دەتوانێ‌و ویستی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە:

وەك فەرموویەتی:

* ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (البقرة: ٢٣١).
* ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (البقرة: ١٤٨).
* ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ (البروج: ١٦).

٥- خوا ﷻ بەزەییەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوەو خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەتە:

وەك فەرموویەتی:

* ﴿ ...وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ (الأعراف: ١٥٦).
* ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ؟!﴾ (التين: ٨).

٦- حەوت ئاسمانەکان وزەوی‌و هەرچی تێیاندایەو هەموو شتێك خوا ﷻ بە پاك دەگرێ‌و ستایشی دەکات:

وەك فەرموویەتی:

* ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ (الإسراء: ٤٤).

٧- خوا ﷻ هەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێك‌و پێکی‌و وردەکاریی دروستکردووە‌و نارێکی‌و بێ یاسایی لە هیچ دروستکراوێکی خوادا نیە:

وەك خوا فەرموویەتی:

* ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ، ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾(الملك:٣-٤).
* ﴿ ..صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ (النمل: ٨٨).

* ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ.. ﴾ (السجدة: ٧).

**٣: پرسیاری سێیەم: ئەم بوونەوەرە چۆن دروستکراوە؟!**

ڕستەی: ﴿فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ تا ڕاددەیەك تیشكی دەخاتە سەرو دەریدەخات، كە خوای بەدیهێنەر لەماوەی شەش ڕۆژانــدا ئاسمانــەكانو زەوی هێناونــەدی، دیــارە مەبەستیش لەو شەش ڕۆژە، شەش قۆناغو شەش ماوە (مُـدَّة)یە لە كات، چونكە وشەی (يَـوْم) لە زمانی عەرەبیو لە بەكارهێنانی قورئاندا، ماوەیەكـە لــە كـات (زَمَن)و، مەرج نیە هەر دوازدە، یان بیستو چوار سـەعات بــێ، ئــەوەتا خــوای بەرزو مەزن ڕایگەیاندووە، كە ڕۆژ (یوم)ێك لە لیێی خوا ماوەكەی هەزار (١٠٠٠) ســاڵە: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ (الحــج: ٤٧)، هــەروەها ڕوونی كردۆتەوە، كە جۆرە ڕۆژێكی دیكە هەیە، كە فریشتەكانو جیبریـل تێیـدا بــەرەو خــوا بــەرز دەبنەوە،ماوەكــەی پــەنجا هــەزار (٥٠,٠٠٠) ســاڵە: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ (المعارج:٤).

شایانی باسیشە،كەزانایانی گەردووونناسییو توێژەرەوانی قورئان، قسەو باسی زۆریان لە بارەی ئەو شەش قۆناغە زەمەنییە كردوە، كە خوا ﷻ ئاسمانەكانو زەوی تێدا هێناونەدی، بەڵام لێرەدا دەرفەتی چوونە نێو درێژەی ئەو باسو خواسانەمان نیە.

هەروەها دەربارەی چۆنیەتی دروستكرانی ئاسمانەكانو زەوی، پێویستە ئاماژەش بەوە بكەین، كە خوای زاناو توانا ڕایگەیاندوە كە:

یەكەم: ئاسمانەكانو زەوی لە سەرەتاوەو بەر لەوەی ئەم حاڵەتو شێوەی ئێستایان پێ ببەخشرێ، پێكەوە جۆشدراو بوونو یەك پارچە بوون، بەڵام دوایی خوا لەیەكی جیا كردوونەوە، بێ ئەوەی لەیەكترازانی یــەكجارەكی ڕوویــدات: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا.. ﴾

(الأنبياء: ٣٠)، واتە: ئایا ئەوانەی بێ بڕوان نازانن، کە ئاسمانەکانو زەوی پێکەوە جۆشدراو بوون!، پاشان لە یەکمان پچڕاندن..!

دیارە (فتق)یش هەڵتۆقینی بەشێکی شتێکە بێ ئەوەی بە یـەکجاریی جیابێتەوە، (زەوی)یش هەرچەندە لە ئاسمان بە گشتییو (کۆمەڵەی خۆر) بە تایبەت جیابۆتەوە، بەڵام چونکە بە هێزی کێشندە (جاذبیـة) پێکـەوە گرێدراون، لەیەکترازانی تەواو ڕووی نەداوە!

دووەم: ئاسمان (واتە تێکرای بوونەوەر) کەرەسەی سەرەتایی دروستبوونی دووکەڵ (دُخَان) بووە: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴾ (فصلت: ١١)، واتـە: ئنجـا (خـوا) ویسـتی ئاسمـان دروستبکات، کە لە حاڵەتی دووکەڵدا بوو، بەوو بە زەوی فەرمـوو: چار و ناچار پەیدابن! ئەوانیش گوتیان ئەوە بە ملکەچـی هاتینـە دی. شـایانی باسیشـە،کەهەم یـەك پارچـەبوونی ئاسمانـەکانو زەوی‌و، پاشـان لەیـەك جیابوونەوەیان و، هەم لە حاڵەتی گازدا بوونی بوونەوەر، پێش هاتنە سەر ئەم شێوەیەی ئێستێی، دوایین ئەنجامە، کە زانیاریی فیزیاو گەردووناسیی پێی گەیشتوە، هەرچەندە هەتا ئێستا، هـەر وەك بـیردۆزە (نظریـة)یـەك تەماشا دەکرێن.

## ٤: پرسیاری چوارەمیش: ئەم (بوون)ە کەی هێنراوەتە دی؟!

ڕستەی: ﴿وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ ﴾ ئاماژەیەك بە وەڵامـەکـەی دەکـات، چونکە بەپێی ئەم فەرمایشتەی خـوای بـێ وێنـە، کاتێـك بـووە، کـە (بـوون)ی بەرجەستە لە ئاسمانەکانو زەویدا، نەبووەو بێجگە لە بارەگا(عَرْش)ی لەسەر ئـاو وەستاوی خوا ﷻ، هیچ شتێکی دیکە نـەبووە، کەواتـە: بوونـەوەر سـەرەتایەکی هەیەو هەربوو (أزلي) نیە، بەڵام بێگومان، هەتا ئێستا عەقڵو زانیاری مرۆڤـ نەیتوانیوە پەی بە سەرەتای دروستبوونی بوونەوەرو تەمەنی تێپەڕیوی بەرێ!

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٥١)ی (الكهف)یشدا خوای پەنهانزان ئاماژەی بەو ڕاستییە کردوە، کە مرۆڤـــەکان سـەرەتاو چۆنیەتی دروسـتبوونی ئاسمانـەکانو زەویو خۆشیان - کە مەبەست ڕووحەکانیان، یان دروسـتبوونی بـابو دایکیـان (ئادەمو حەوا)یە- نازانن و لێی ئاگادار نەکراونەتـەوە: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ..﴾.

شایانی باسیشە،کەکاتی کۆتایی هـاتنی (بوونـەوەر)یش وەك سـەرەتایەکەی، دیسان شتێکی پەنهانو نەزانراوەو، مەتەڵێکی هەرگیز هەڵنەهێنراوەو، جگە لـە خوای زانای ئاشکراو پەنهان، هیچ کەس ،تەنـ نەت کۆتاییو سەروەری پێغەمبەران (محمد) ﷺ و گەورەسـەرۆکی فریشـتەکان (جبريـل)یش، هیچیان لـەو بـارەوە نەزانیوە! وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَاۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَ ..﴾ (الأعراف: ١٨٧)، واتە: لە بارەی (کاتی هاتنی) قیامەتـەوە لێـت دەپرسـن، کـە کـەی - کـاتی - لەنگـەر گرتنیـەتی؟ بڵـێ: زانیارییەکەی بەس لـە لێـی پەروەردگارمـەو، بێجگـە لـە خـۆی، هـیچ کـەس (کاتەکەی) ئاشکرا ناکات..

هەروەها لەو فەرمایشتەشدا، کە (بخاري ومسلم) لە (عمر بن الخطاب)ەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێراویانەتەوەو بە فەرمودەی جیبریل ناسراوە، پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی پرسیـ ری جیبریل دا، کە لەبارەی ڕۆژی قیامەتەوەیە فەرموویـەتی: {مـا المسئول عنها بأعلم مـن السـائل!}، واتـە: پرسـیارلێکراو پێـی زانـاتر نیـە لـە پرسیارکەر! یانی منیش لەتۆ زیاتری لێ نازانم.

**٥: پرسیاری پێنجەم: ئەم بوونەورە بۆچی دروستکراوەو حیکمـەتی خوا لە خولقاندنیدا چییە؟!**

ڕستەی: ﴿لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾ وەڵامی دەداتەوەو خـوای خـاوەنی بوونەوەرو ژیان (الكون والحياة) بە ڕوونی ڕایدەگەیەنێ، کە تێکرای بوونەوەر بـەو

پانو پۆڕیی‌و زەبەلاحیی‌و بە سەرجەم پێکهاتەکانییەوە، لە ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەوەی تێیاندایەو، هەرچی دەکەوێتە نێوانیانەوە، گۆڕەپانێکە بۆ تێدا تاقی کرانەوەی مرۆڤــو چند سازکراوە!

چونکە خوای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی دروستکرانی ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژاندا کردوە، یەکسەر فەرموویەتی: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردوەی چاکترە!

شایانی باسیشە ئەم ڕاستییە، بە چەند شێوازێکی دیکەش لە قوڕئانێدا خراوەتە ڕوو، بۆ نموونە:

* ﴿خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا...﴾ (الملك: ٢)، واتە: ئەو کەسەی مەرگ‌و ژیانی هێناونەدی، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی چاکترە!..
* ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ (الكهف: ٧)، واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە بۆیمان گێراوە بە ڕازانەوە، تاکو تاقییان بکەینەوە، کامەیان کردەوەی چاکترە!
* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ﴾ (الإنشقاق: ٦)، واتە: ئەی مرۆڤ ! بێگومان تۆ هەتا دەگەیە پەروەردگارت ،ڕەنجدەری‌و پێشی دەگەی (واتە: بە بەرهەمی ڕەنجەکەت).

کەواتە: (بوونناسیی ئیسلامیی) پێمان دەڵێ، کە ئاسمانەکانو زەوی‌و هەرچی دەکەوێتە نێوانیشیانەوە، بۆ ئەوە دروستکراون، کە مرۆڤیان تێدا تاقی بکرێتەوە، ئنجا ئەوە، کە هەتا ئێستا وەك پێویست بۆمان دەرنەکەوتوە، کە ئایا پەیوەندی سەرجەم ئاسمانەکان بە ژیانی ئێمەوە چییەو چۆنە؟! هیچ لەو مەسەلەیە ناگۆڕێ، چونکە خوای خاوەنی ئاسمانەکانو زەوی‌و ئاگادار بە نهێنییەکان، ئەو ڕاستییەی پێراگەیاندوین و، هەواڵ‌و موژدەشی پێداوین، کە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ، هەرچی

زیاتر نهێنییەکانی بوونەوەرمان پیشـان بـدات: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْأَفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ .. ﴾ (فصلت:٥٣).

واتە: لەمەودوا نیشانەکانی (پەروەردگاریتی) خۆمانیان لـە ئاسۆیەکانو لـە خودی خۆیشیاندا پیشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە (قورئان) هەقە..

کەواتە: دوورنیەو زۆریش نێزیکە، کە لە داهاتوویەکی دوور، یان نزیکداو لـە ئەنجامی گەشەکردنی زیاتری زانستدا، پەیوەنـدی سـەرجەم حـەوت ئاسمانـەکانو پێکهاتەکانیان، یان زۆربەیان بە ژیانو گوزەرانی دوونیایی مانەوە ڕوونبێتەوە.

## ٦: پرسـیاری شەشـەم و کۆتـایی: ئـەم بوونـەوەرە بـەرەو کـوێ دەچێ و سەرەنجامی چی دەبێ؟!

ڕستەی کۆتایی ئایەتەکە تیشك دەخاتەسەر وەڵامەکەی:

﴿ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾.

چونکە خوای بێ وێنەو تاك لەم ڕستە قورئانییەدا دەیخاتەڕوو، کە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە بـێ بڕوایـەکان رابگەیـەنێ، کـە پـاش مـەرگ زینـدوو دەکرێنەوەو دەچنە قۆناغێکی دیکەی ژیانەوە، ئەوان هیچیان پێ نیە لە بەرانبەر ئەم ڕاستییەدا، کە وێڕای هەواڵدانی وەحیو شـەرع، عـەقڵو فیتڕەتـی سـاغیش دەیخوازن، جگە لە تۆمەتی جادوو (سحر) پاڵدانە لێی قورئانو پێغەمبـەری خـوا ﷺ!

ئنجا لە زۆر شوێنی دیکەی کتێبی بەپێزی خوادا ﷻ ئـەو ڕاسـتییە مەزنـەی زیندوو بوونەوەی دوای مردنو، هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت خراوەتە ڕوو، بۆ نموونە:

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴾ (الروم: ٨).

واتە: ئایا لەبەرخۆیانەوە بیریان نەکردۆتەوە! (تاکو دڵنیابن)، کە خوا ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەوەی نێوانیانی بەهەق وحیکمەت‌و بۆکاتێکی دیاری کراو نەبێ، دروست نەکردوون، کەچی (لەگەڵ ئەوەشدا) زۆربەی خەڵکی بڕوایان بە دیداری پەروەردگاریان نیە!

کەواتە: دوای ئەم قۆناغەی ژیانی مرۆڤــو جند لەسەر زەوی، کە هەموو ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەوەی نێوانیشیانی پێوە پەیوەستە، قۆناغێکی دیکەی ژیان هەیە، کە بە دیداری خوا گەیشتنی تێدا دێتەدی، خوای پەروەردگار ئەو حیکمەتەی ناو ناوە هەق (حق) و، خستوویەتەڕوو، کە تێکڕای بوونەوەر بە هەموو پێکهاتەکانییەوە بۆ هاتنەدی ئەو هەقە هێنراونەتەدی.

شایانی باسیشە،کەخوای تاك‌و پاك ڕوونی کردۆتەوە، کە لە قۆناغی داهاتووی ژیانی مرۆڤــدا، دیمەن‌و شێوەی بوونەوەر دەگۆڕێ‌و، بە جۆرێکی دیکەی گونجاو لەگەڵ ژیانی مرۆڤــ لەو قۆناغەدا دێتەدی، وەك فەرموویەتی:

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ (إبراهيم:٤٨).

واتە ئەو ڕۆژەی، کە زەوی‌و ئاسمانەکان بۆ حاڵەتێکی دیکە دەگۆڕرێن‌و، بۆ خوای تاکی مل پێکەچکەر دێنەڕوو.

جا خوێنەری بەڕێز!

ئەمە کورتەیەکی گوشراو بوو لە بارەی (بوونناسیی ئیسلامیی)یەوەو، وەڵامی ئیسلام بۆ ئەو شەش پرسیارە گەورەو گرنگەی، کە لە دێر زەمانەوە فەلسەفە هەوڵی وەڵامدانەوەیانیداوە، بەڵام هەرکاتێك بەشەر بە دووریی گرتن لە وەحی خوا ﷻ ویستبێتی وەڵامیان بداتەوە، گیرۆدەی هەڵەو خلیسکانی سەیرو بێڕەزا بووە!

ئێستاش با بچینە سەروکاری تەوژمی عەلمانیی‌و بیرۆکەی سیکۆلاریزم‌و بزانینداخۆ خاوەنی چ جۆرە بوونناسیی‌و دنیابینییەکن!

## دووەم: بووناسیی تەوژمی عەلمانیی:

لە ڕاستیدا تەوژمی سیکۆلاریست (علماني)و سیکۆلاریزم، بە پێچەوانەی تەوژمی ئیسلامیی‌و ئیسلامەوە، خاوەنی (بووناسیی)و (دنیابینی)یەکی سەربەخۆو ڕوون نین! هەر بۆیەش عەلمانییەکان لە بواری (بووناسیی)دا بۆ دوو پێڕی سەرەکی‌و چەندان وردەپێڕ دابەش بوونە،دوو پێڕە سەرەکییەکەش بریتین لە: ماتریالیستەکان (المادّیون)و ئایدیالیستەکان (المثالیّون)، کە هەردووکیشیان دژو پێچەوانەی یەکدین‌و، بە درێژایی مێژووی فەلسەفە، هەر هەراو کێشەو مشت‌و مڕیان بووە، بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییە بکەم، کە ئیسلام هەرچەندە، تا ڕاددەیەك خاڵی هاوبەشی لەگەڵ هەرکام لە ماتریالیزم‌و ئایدیالیزمدا هەن، بەڵام هیچ کامیان نیەو لە هەردووکیان جیاوازە، وەك لە وتووێژی دووەمی کتێبی (ئیسلام‌و ڕێچکان)داو لە ژێر ناوونیشانی: (ئیسلام ئیسلامە نە ئایدیالیزمەو نە ماتریالیزم)دا ڕوونم کردۆتەوە[1].

جا هەڵبەتە تەبەننی کرانی هەرکام لە فەلسەفەکانی ماتریالیزم‌و ئایدیالیزم لە لایەن سیکۆلاریستەکانەوە، بە کۆن‌و تازەو ڕۆژئاوایی‌و ڕۆژهەڵاتییانەوە، شتێکی ڕوون‌و بێ چەندو چوونەو مشت‌و مڕ هەڵناگرێ، بەڵام بۆ زیاتر دڵنیایی‌و بەرچاو ڕوونیی، با سەرنجی پێناسەی هەردوو وشەی: عەلمانییەت‌و بە عەلمانیی کردن بدەین:

(د.کمیل الحاج) خاوەنی: (الموسوعة الميسَّرة في الفكر الفلسفي والأجتماعي- عربي، إنجليزي) ط١، ٢٠٠٠، ص:٣٧٣، لە پێناسەی (العلمانية والعلمنة) (Secularism and Secularization)دا، گوتوویەتی:

-کە دیارە ئێمە ئەوەی مەبەستمانەو لێی وەردەگرین‌و لە پێشەوەش دەقە عەرەبییەکە وەك خۆی دێنین‌و پاشان دەیکەینە کوردی-:

---

(١) بڕوانە: چاپی سێیەم، نووسینگەی تەفسیر -٢٠٠٦-.

((كلمة (علمانية) وضعت عند العرب في أواسط القرن التاسع عشر في مقابل (Laicisme) بالفرنسية و(Secularism) بالأنجليزية.

....ومفهوم العلمانية نشأ في فرنسا بوجه خاص و تطوَّر لِيُصْبِحَ فكرة سياسية تَولَّدت عن فصل الكنيسة عن الدولة..

أما العلمنة (Secularization) فهي التطبيق العملي لتلك النظرية في الواقع السياسي و الأقتصادي والأجتماعي والثقافي (والميل المتزايد في البشرية للتصرّف بمعزلٍ واستقلال عن الدين والدينيّ) كما يقول الباحث الأنجليزي شادويك (Chadwick)، فالعَلْمنة تعني: (اللاّديني) على وجه الدِّقّة، وهي تكتفي بنفي أيِّ دور (للإلهي) أو (الديني) في تنظيم شئون المجتمع العامة كالأدارة والسياسة والأقتصاد والتعليم والثقافة، والإبقاء على هذا التنظيم فالعلمنة بمعناها الشامل، فلسفة تنطوي على محاولة لأدراك العالم الماديّ بوصفه معقولاً... وعلى إمكانية إدراكه، وبالتالي تغييره دون حاجة للقوى الفوقية السَّماوية والدينية.

وتُعْتَبَر الماركسية والليبرالية من أهمِّ فلسفات العلمنة وجزءاً جوهرياً من كل تحوّلاتها وخياراتها المتُاحة أمام المجتمعات الحديثة.

فالعلمنة لا تعني الألحاد أو المادية، بل إبعاد الدين عن ميدان تنظيم المجتمع الإنساني وشئونه السياسية والأقتصادية والأجتماعية على أن يحفظ له دوره الأساسي في المجالين الروحي والأخلاقي.

وفي أوروبا حيث نشأت العلمانية نجِدُ أَنَّ تياراتها الفكرية والفلسفية تنطوي تحت تيَّارين متضادَّين هما الماديّة والمثالية، ومع ذلك فأن اتباع هذين التيارين عَلْمانيون، يستوي في ذلك ديكارت أبو المثالية في الفكر الأوروبي الحديث وكنط صاحب المثالية النقدية، أو هيغل أكبر المثاليين في التأريخ أو فولتير وكندروسية وماركس وداروين وهكسلي من روّاد الفكر المادي الحديث.))

واتە:((وشـەی (عـەلمانییـەت) لـە نێوەڕاسـتەكانی سـەدەی نـۆزدەوە لەلایـەن عـەرەبەوە لە بەرانبەر (لائیكیزم)ی فەرەنسیو (سیكۆلاریزم)ی ئینگلیزییەوە دانرا.

.. چەمکی عەلمانییەت بە تایبەت لە فەڕەنسا سەری هەڵداو گەشەی کرد، تاکو ببێتە بیرۆکەیەکی سیاسیی، کە لە جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت پەیدابوو..

بەڵام بە عەلمانییکردن (سیکۆلاریزەیشن) ئەوە جێبەجێ کردنی کردەیی ئەو بیردۆزەیە لە واقیعی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و کلتوورییدا (وە ئارەزوویەکی پەرەسەندووی مرۆڤایەتییە بۆ هەڵس و کەوت کردن، دوورو سەربەخۆ لە ئایین و ئایینی)، وەك لێکۆڵەرەوەی ئینگلیز (شادویك) گوتوویەتی.

کەواتە: بە عەلمانییکردن، کتومت یانی (بێ دینایەتی) کە دەیەوێ هەموو ڕۆڵێکی (خوایی) یان (دینی) لە ڕێکخستنی کارو باری کۆمەڵگادا وەك بەڕێوەبردن و سیاسەت و ئابووریی و فێرکردن و کلتوور، نەهێڵێ و، ئەو ڕێکخستنە ببێتە شتێکی بەشەریی ڕووت.

کەوابێ بە عەلمانییکردن بە واتایە گشتییەکەی، فەلسەفەیەکە ئەوە دەگرێتە خۆی، کە هەوڵبدرێ بۆ پەیپێبردنی جیهانی ماددیی، وەك شتێکی ماقوڵ و فامکراو،بە گونجاو زانینی ئەو پەیپێبردنە و سەرەنجامیش گۆڕینی، بێ پێویستی هەبوون بە هێزە ئاسمانییە سەرووەکان و ئایینییەکان.

مارکسیزم و لیبرالیزم، گرنگترین فەلسەفەی بە عەلمانییکردنن و پێکهێنەرێکی بنەڕەتی هەموو گۆڕانکارییەکانی و بوارە ڕێ پێدراوەکانی لە بەردەم کۆمەڵگا تازەکاندا.

بۆیە بە عەلمانییکردن بێ بڕوایی و ماددیگەریی ناگەیەنێ، بەڵکو دوورخستنەوەی ئایینە لە ڕێکخستنی کۆمەڵگای بەشەریی و کاروبارە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانیدا، لەگەڵ پاراستنی ڕۆڵە سەرەکییەکەی لە هەردوو بواری ڕووحی و خوو ڕەوشت دا.

ئەو ئەورووپییەی، کە عەلمانیەتی تێدا پەیدا بوو دەبینین، کە تەوژمە فیکریی و فەلسەفییەکانی بەگشتیی، لە ژێر دوو تەوژمی دژ بەیەکدا کۆدەبنەوە، کە بریتین

لە: (ماددیگەریی‌و ئایدیاگەریی)، کەچی شوێنکەوتوانی هەرکام لەم دوو تەوژمە سیکۆلاریستن و،لە عەلمانیی بوونیاندا (دیکارت)ی رابەری ئایدیالیزم لە هزری نوێی ئەوروپادا و، (کانت)ی رابەری ئایدیالیزمی ڕەخنەیی، یان (هیگل) گەورەترین ئایدیالیست لە مێژوودا، یان (فۆلتێر)و (کەندرۆسیە) و(مارکس)و(داروین) و(هکسلی) لە رابەرانی بیری ماددیگەریی هاوچەرخ، وەك یەکن‌و یەکسانن لە سیکۆلار بوونیاندا)).

ئێستاش بۆ ئەوەی بەرچاو ڕوونیی زیاترمان هەبێ لە بارەی هەرکام لە بیرۆکەی (ماددیگەریی) و(هزرگەریی)یەوە، کە سیکۆلاریستەکان (دنیابینی) خۆیانیان لێوە هەڵهێنجاون، با پێناسەیەکی کورتیان بکەین:

## یەکەم: ماددیگەریی (**المادّية**) Materialism:

لە: (الموسوعة الميَّسرة في الفكر الفلسفي والأجتماعي) (ص ٥١٢) دا بەمجۆرە پێناسەی وشەی: (ماددیگەریی) کراوە:

((المادية (Materialism): هي بمعناها الفلسفي: النزعة القائلة بأن كل ماهو موجودٌ هو مادِّيٌ، أو يعتمد كلِّية في وجوده على المادة، وهذا الرأي يشمل قضيتين: القضيَّة الميتافيزيقية العامة التي تنتهي إلى نتيجة مؤدّاها أنْ لا وجود إلاّ لنوع أساسي في الواقع هو النوعُ المادِّي، والقضية الثانية التي هي أكثر تخصيصاً، ألا وهي أن الكائنات الإنسانية والمخلوقات الحيَّةَ الأخرى ليست كائنات ثنائية مُركَّبة من جِسْمٍ مادّيٍ وروح لا مادِّيةٍ، وإنما هي اساساً جِسْمِيَّةٌ في طبيعتها...))

واتە: ماددیگەریی (ماتریالیزم) بە واتا فەلسەفییەکەی بریتیە لەو بۆچوونەی کە دەڵێ: هەر شتێك کە هەیە ماددییە، یان بوونەکەی تەنیا بە ماددەوە پەیوەستە، جا ئەم رایە دوو مەسەلان دەگرێتەوە:

یەکەم: مەسەلەی میتافیزیکی گشتیی، کە ئەنجامەکەی بریتیە لەوە: جگە لە شتی ماددیی هیچ جۆرە شتێکی دیکە بوونی نیە لە واقیع دا.

مەسەلەی دووەم: کە تایبەتی ترە بریتیە لەوە کە: نە مرۆڤـــەکانو نە سەرجەم دروستکراوە زیندەوەرەکانی دیکە، شتی دوانەییو لێکدراو نـین لـە جەسـتەیەکی مادییو گیانێکی نامادییی، بەڵکو هەر لە بنەڕەتـەوە بـە سروشـت جەسـتەی ڕووتنو هیچی دیکە...

## دووەم: هزرگەریی [المثالية] Idialism؛

ئەمیش لە سەرچاوەی پێشوو، (ص ٥٣٢) دا ئاوا پێناسەی کراوە:

((المثالية (Idialism)، كلمة (Idialism) مشتقة من كلمة (idia) أي فكرة أو تصور في العقل، أو حتى مثال مفارق، ويمكن تعريف المثالية بأنّها نزعـة فلسـفية تجعل من الأفكار والتصورات طريقـاً إلى معرفـة الأشـياء (الـديكارتيّون) وبهـذا المعنى تقابل المذهب التجريبيّ، وأحيانـاً تُحَـلُّ الأفكـار محـل الأشـياء مـع حـذف الأشياء المادِّيـة (بَركلـي)، وبهـذا المعنـى تُقابِـلُ الماديـة، وأحيانـاً تَتَّحِـدُ الأفكـار والأشياء إتّحاداً لا يَدَعُ فَرْقاً بين فِكرٍ واقع (هيغل)، وبهذا المعنى تقابِلُ الواقعية، وأحياناً تكون الأفكار مُثُلاً مُفارِقَة على أنَّها الأشياء في ذاتها (أفلاطون)، وبِهذا تُقابِلُ عالم الحِسِّ أو الظّاهر، وتَلْتَقي هذه الإتجاهات في نقطةٍ أساسية، وهي: البَـدْءُ بالأفكار قبل الأشياء...))

واتە: هزرگەریی (ئایـدیالیزم)، وشـەی (ئایـدیالیزم) لـە وشـەی (ئایـدیا)وە وەرگیراوە، کە بە مانای بیرۆکە، یان لە عەقڵدا وێناکراو، یان ،تەنانەت وێنەیەکی جیا، دێ.

دەگونجێ (بە چوار جۆر) پێناسەی هزرگەریی بکرێ:

یەکەم: کە بگوترێ: بیروڕایەکی فەلسەفییەو، بیرۆکەو وێناکردنـەکان دەکاتـە ڕێباز بەرەو ناسینی شتەکان، (وەك دیکارتییەکان دەیانگوت)، بەم مانایە پێچەوانەی ڕێچکەی ئەزموونگەرییە.

دووەم: هەندێك جاریش بیرۆكەكان جێی شتەكان دەگرنەوە، وێڕای لابردنی شتە ماددییەكان، (وەك بەركلی گوتوویەتی)، بەم واتایە دژو پێچەوانەی ماددیگەرییە.

سێیەم هەندێك جاریش بیرۆكەكانو شتەكان بە شێوەیەك یەكدەگرن، كە جیاوازی لە نێوان هزرو واقیعدا نامێنێ، (وەك هیگل گوتوویەتی)، بەم مانایەش پێچەوانەی واقیعگەرییە.

چوارەم: هەندێك جاریش بیرۆكەكان دەبنە وێنەی سەربەخۆو جیا وەك شتی سەربەخۆ لە خودی خۆیاندا (وەك ئەفلاتوون گوتوویەتی)،بەم واتایەش پێچەوانەی دنیای بەرهەست، یان ڕواڵەتییە.

سەرجەم ئەم ڕێڕەوانەی هزرگەریی لە خاڵێكی بنەڕەتیدا یەك دەگرنەوە، كە بریتیە لە: دانانی بیرۆكەكان لە پێش شتەكانەوە...

هەڵبەتە بە سەرنجدانێكی خێرای هەركام لە بیرۆكەی ماددیگەریی (ماتریالیزم)و هزرگەریی (ئایدیالیزم)یش، بۆمان دەردەكەوێ، كە هیچ كامیان (بوونناسیی)[1] و(دنیابینی)یەكی نەك ڕاستو دروست، بگرە مەیلەو ڕاستیش نین!

چونكە هەرچی (ماددیگەریی)یە، تێكرای (بوون) لە (مادده)دا كورت هەڵدێنێو پێی وایە، جگە لە ماددەو ڕواڵەتەكانی هیچ شتێكی دیكە بوونی نیەو، ماددەش هەربوو (أزلي)یەو كەس دروستی نەكردوە و..هتد!

ئاشكراشە، كە لەسەر بناغەی تێڕوانینی بیرۆكەیەكی وا، ناگونجێ وەڵامی شەش پرسیارە خوارسكەكان بدرێتەوە، بەڵكو بیرۆكەی ماتریالیزم پەیڕەوانی خۆی دەخاتە تاریكییەكی ئەنگوستەچاوی بێڕەزای ئەوتۆوە، كە سەرتاپای

---

(١) تێبینی: هۆكاری بەكارهێنانی زاراوەی (بوونناسیی) وێڕای (دنیابینی) ئەوەیە، كە وشەی (دنیابینی) لەچاو (بوونناسیی) چەمك و واتایەكی گچكەو تەسكە و بەس دروستكراوەكان (مخلوقات) دەگرێتەوە، بەڵام (بوونناسیی) گشتگیرەو هەموو بوون (وجود) بە بەدیهێنەر و بەدیهێنراوەوە دەگرێتەوە.

بوونیاندادەگریٚ، بگرە رابردووو داهاتووشیان وایان لیٚ دیٚ، ڕاست وچەپی خۆیـان نەناسن!

بەڵیٚ مرۆڤـــی ماددیی (ماتریالیست)، نە خاوەنی بوونــەوەر دەناســیٚ و، نــە دەزانیٚ حیکمەتو هۆی دروستبوونی چی یەو، نە دەزانیٚ خۆیشی لە کویٚوە هاتوەو چۆنو بۆچیو بۆ کویٚ دەچیٚ و..هتد!

بەکورتی:

بابای ماددیی لە خودی خـۆیو لــە بوونــەوەرو دەوروبەریشـیدا، بیٚجگــە لــە ماددەی بیٚ گیانو بەرهەست، هەست بەبوونی هیچ شـتیٚکی دیکــە ناکـات، نــە ڕووح، نە جند، نە فریشتە، نە خوا ﷻ! وەك خوا ﷻ لە ویٚنا (تصـویر) کردنــی حاڵو باڵی کافراندا فەرموویــەتی: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ (النور: ٤٠).

واتە: یان وەك کەسیٚکە لە نیٚو چەند تاریکاییەك لە دەریایــەکی قـوڵدا، کــە شەپۆڵیٚك دایدەپۆشیٚو لە سەرووشیەوە شـەپۆڵیٚکی دیکــە هەیــەو لــە ســەرووی ویشەوە هەور هەیە، کۆمـەڵیٚك تاریکی لەسەر یەك کەڵەکە بوو، بە جۆریٚـك، کــە ئەگەردەستی دەربیٚنیٚ (و تەماشای بکات) هەر نزیکیش نیە ببینیٚ، هەرکەسیٚك خوا ڕووناکیی نەداتیٚ، لە هیچ شویٚنیٚکی دی چنگی ناکەویٚ.

هەرچی هزرگەریی (المثالية)یشە - کە هەرچــەندە چــەند جۆریٚکــە، بــەڵام بــە سیٚبەرو خەیاڵ، یان لانی کەم بە کەم وکورت ســەیرکردنی مــاددە و، بــە ئەســڵ داذ نی هزر (فکر)و ویٚنە (مثـال)، خاڵی هاوبەشیانە -، سەرەرای ئەوەی،کــە لــە سۆنگەی ئەو جۆرە تیٚڕوانینەیەوە بۆ ماددەو غەیری ماددەو بوونەوەرو خوا ﷻو جەستەو ڕووح، کە زیاتر لە وڕیٚنەو خەیاڵ دەچیٚ، هەتا قسەی عــەقڵو مــەنتیق، بەڵیٚ،، سەرەرای ئەوەش، ئەمیش لە بەردەم شەش پرسیارە خواڕسکەکاندا، هــەر کلۆڵو دەستەپاچەیەو،حاڵی لە حاڵی ماتریالیزم چاکتر نیە!

چونکە فەلسەفەی ئایدیالیزمیش بە هەموو جۆرو شێوەکانییەوە، بە درێژایی مێژوو - هەرچەنددانی بە بوونی خواو ڕووحو دیوی نادیار (غیب)ی دنیادا هێناوە- بەڵام نەیتوانیوە نەپێناسەیەکی ڕاستو شایستەی خوا ﷻ بکاتو، نە چۆنیەتی وجۆری پەیوەندی بەدنیاو مرۆڤەوە دیاری بکات و، نە وەڵامێکی ڕاستو مەنتیقی هیچ کام لەو شەش پرسیارەش بداتەوە، کە وەڵامدانەوەیان کاکڵەو جەوهەری (بووناسیی)یەکی ڕاست، پێکدێنێ!

جا هەرچەندە زۆرێك لە سیکۆلاریستەکان پێیان وایە، کە بیرۆکەی ئایدیالیزم لە ماتریالیزم، لە ئیسلامەوە نزیکترە، بەڵام بێگومان ئەم قسەیە بە ڕەهایی ڕاست نیە، چونکە ئیسلام نکوولیکردنی ماددیگەریی لە غەیری (ماددە)ی چەند بەلاوە هەڵەیە، نکوولیکردنی هزرگەرییشی لە (ماددە)یان بە سێبەرو خەونو خەیاڵ دانانی، هێندە پێ هەڵەیە و،ئەگەرلە هەندێك شوێنی قورئانیشدادیوی نادیار (غیب)ی بوونەوەر پێش دیوی بینراوو ڕواڵەتی خراوە: ﴿..عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ..﴾ (الحشر:٢٢)، لە هەندێك شوێنی دیکەشدا، دیوی بینراوو بەرهەست، پێش دیوی نابەرهەستو بینراو خراوە: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ﴾ (الحاقة:٣٨-٣٩).

ئنجا لە ڕاستیدا لە مەسەلەی خواناسیی (معرفة الله)دا، دان بە بوونی خوادا هێنان چەندە گرنگە، ناسینیشی بە شێوەیەکی ڕاستو دروست، هێندە گرنگە، چونکە بەبێ ناسینی خواﷻ بە شێوەیەکی ڕاستو دروستو، لەبەر ڕۆشنایی ناوو سیفەتە هەرەچاكو پەسندەکانیدا، دانپێداهێنانی بوونەکەی - کە لە خودی خۆیدا شتێکی خواڕسکە - هیچ بەرهەمێکی ئەوتۆی نیە لە ژیانی مرۆڤداو، نابێتە هۆی پەیدابوونی هیچ گۆڕانکارییەکی ئیجابیی!

هەر بۆیەش زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئایەتی ژمارە (٨٣)ی سووڕەتی (غافر) لە بارەی هەندێك لە فەیلەسووفە یۆنانییەکانەوە دەدوێ، لە کاتێکدا، کە (عیسا) ﷺ پەیامی خوای بۆ هاتو دەستیکرد بە بانگەواز بۆلای

خوا ﷻ ، ئەوانیش گوێ بیستی بوون، لەبەر سەرسام (مُعْجَبْ) بوونیان بەو تۆزە فەلسەفەو زانستەی، کە لەلایان بوو، بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون:

﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾

واتە: جا کاتێك پێغەمبەرانیان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە چوونە لایان، بەوەندە زانیارییەی، کە لەلایان بوو دڵخۆش (وسەرسام) بوون،سەرەنجام سزای ئـەوە، کـە گاڵتەیان پێدەکرد، دەوریدان.

کەواتە: ئەو دوو فەلسەفەو دنیابینییەی، کەکاتی خۆی ڕێچکەی بێدینایەتی (سیکۆلاریزم) لە شوێنی تێداسەرهەڵدانیدا پەنای پێبردوون‌و تەبەنی کردوون، هیچ کامیان ئەوەیان لە باراندا نیە، کە وەڵامگۆی پرسیارە خواڕسـکەکانی سروشـت‌و ناخی مرۆڤــ بن‌و بگونجێ پێیان بگوترێ: (بوونناسیی)یەکی ڕاست‌و دروست.

ئنجا لێرەدا دەگونجێ یەکێك بپرسێ: ئەدی بەرانبەر بەکەسانێك چی دەڵێــی، کە بڕوایان بە هیچ لەو دوو فەلسەفەو دنیابینییە (واتە ماددیگەریی وهزرگەریی) نییەو خۆیان -وێڕای سیکۆلاریست بوون- بە وابەستە بە (بوونناسیی) ئیسلامیی دەزانن؟!

لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدادەڵێم: خوا یاربێ لە ئاڵقەی دووەمــی ئــەم زنجـیرە باسەدا، وەڵامی ئەو پرسیارەو پرسیارگەلێکی دیکەی لەو بابەتە دەدەینەوە.

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا، کە رابرد، دەتوانین بڵێین:

یەکەم: عەلمانیەت (سیکۆلاریزم) بە پێچەوانەی ئیسلامەوە - کە وەك پێشـتر خستمانە ڕوو، بوونناسیی‌و دنیابینییەکی ڕوونی هەیە، کە لێیــەوە هــەڵقوڵێوە- خاوەنی یەك جۆرە بوونناسیی‌و دنیابینی دیارو ڕوون نیە لێیەوە هاتبــێ، بــەڵکو پاش سەرهەڵدانی وەك بیرۆکەیەك‌و ڕێڕەو (إتجاه)ێك، لـە کاردانــەوەی واقیعێکـی خراپ‌و شپرزدا، کە لەسۆنگەی بەسەر خـەڵك‌و کۆمـەڵگادا دەسـتەڵات رانـانی، ئــایینی تێکــدراوو شــێوێنراو (مُحرّف ومُشَوَّه)ی مەســیحی لــە کڵێســاو چــینی

ئەکلـــیرۆس بەرجەستەکراودا - وەك لە ئاڵقەی دووەمدا ئەو سەرگوزەشتەیە باس دەکەین-، پەنای بردووە بۆ هەرکام لە ماددیگەریی (ماتریـالیزم)و ئایدیاگـەریی (ئایدیالیزم)، کە دوو دنیابینی دژو پێچەوانەی یەکدینو، پشتی پـێ بەسـتوونو تەبەنێی کردوون!

کەواتە: سەرەتا سیکۆلاریزم وەك عەقیدەو هەڵوێستێك بە شێوەی کاردانـەوە پەیدابووەو، پاشان وەك پاساودانەوە (تبریر)ی بوونی، هانای بـۆ ئـەو دوو جـۆرە دنیابینییە دژ بەیەکە بردوە!

شایانی باسیشە هەرکام لە: (ماتریالیزم)و (ئایدیالیزم) تێڕوانینی هەڵەو پووچن لە بارەی بوون (وجـود)ەوە، چـونکە یەکـەمیان (بـوون) لـە (مـاددە)دا کـورت هەڵدێنیو، دان بە غەیری ماددەو ڕواڵەتەکانیدا نـ هێنێ، دووەمیشـیان مـاددەو ڕواڵەتەکانی زیاتر وەك خەیاڵو سێبەرێك بۆ جیهـ نی ئایدیاو مەعنەویی تەماشـا دەکات!

دیارە هەرکام لەو دوو تێڕوانینەش، لەگەڵ عەقڵو زانیـارییو واقیعـدا تێـك دەگیرێن، ((لەو بارەوە دەتوانی سەرنجی هەرکام لە: (دەبەرێك راچوونی ئیسـلامو رێچکان) وتووێژی یەکەم: (سـەلماندنی بـوونی خـوا)و وتوویـژی دووەم: (ئیسـلام ئیسلامە نە ئایدیالیزمە نە ماتریالیزم) چـاپی سـێیەم، نووسـینگەی تەفسـیر -٢٠٠٦-، وە (خواناسـیی، ئـایین، ئیمـان) چـاپییەکەم، نووسـینگەی تەفسـیر -٢٠٠١-، وە (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) بەرگی دووەم، نووسینگەی تەفسیر -٢٠٠٧-، بدەی)).

دووەم: عەلمانییەت چ لـە حاڵـەتی پشـت بەسـتنی بـە فەلسـەفەو دنیـابینی ماددیگەریی، چ ئایدیاگەرییدا ،بەواتایەکی دیکە: چ لە حاڵەتیدان نـەهێنانی بـە بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو، چ لە حاڵەتیـدان پێداهێنانیـدا، عـەزمی لەسەر ئەوە جەزم کردوە، کە نابێ (خوا) ﷻ لەڕێی وەحیو ئایینەکەیەوە دەسـت

وەربداتە ژیانو گوزەرانی مرۆڤــ ، ،ئەگەرگریمان هەر دەخالەتیشی کرد، نابێ لــە جوغزو لایەنی مەعنەویی‌و ئەخلاقیی بچێتەدەرێ!

جا بێگومان نەك هەر سەیر نیە، بەڵکو شتێکی مەنتیقییە بــۆ کەسـێك، کــە بڕوای بە غەیری ماددە نیەو دان بە بــوونی خوایــەکی بەدیهێنــەرو پــەروەرگاردا ناهێنێ، بڵێ: دەبێ مرۆڤــ تەنیا بۆ خۆی چۆنیەتی ژیانو گــوزەرانی خــۆی ڕێــك بخاتو، نابێ هیچ کەس‌و شتێکی دیکە دەست لە کاروباری وەربدات، بەڵام شــتی ســەیروبێ جــێ‌و نامــەنتیقی ئەوەیــە، کــە دان بــە بــوونی خــوای بەدیهێنــەرو پەروەردگارو خاوەنی بوونەوەرو مرۆڤــدا بهێنرێ، کەچی بگوترێ: نابێ خوا هەقی بەسەر مرۆڤــ و ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانییەوە هەبێ‌و، بەهیچ جۆرێك دەســتی تێوەربدات، مــەگەر لە بوارێکی تەسك‌و کەمبەردا!!

## پوختەی قسان:

تەوژمی ئیسلامیی خاوەنی یەك بوونناسیی‌و دنیابینی ڕوونو ئاشکرایە، کــە وەڵامێکی ڕوونو راشکاوی شەش پرسیارە خواڕسکەکان دەداتەوە و، لــە مرۆڤـــ حاڵی دەکات، کە:

ئەم (بوون)ە چی یەو چۆنەو، کێ بەدیهێنەروخاوەنی بوونەوەرەو، کەی‌و چۆنو بۆچی دروستی کردوەو، سەرەنجامی چۆن دەبێ‌و بۆ کوێ دەچێ؟!

پاشان ئەم بوونناسیی‌و دنیابینییە، دەبێتە سەرچاوەی هەڵقوڵینی یــەك جــۆرە بیرو بڕوا (عقیدة)ی ڕاست‌و ڕوون، کە وەك ئــەنجامێکی مــەنتیقی لێیــەوە پەیــدا دەبێ.

بەڵام تەوژمی عــەلمانیی، هەر لە سەرەتاوە پشت بەستوو نەبووە بە بوونناسیی‌و دنیابینییەکی سەربەخۆی ڕوونو دیار، کە بــۆی بووبێتــە سەرچــاوەیەك‌و لێیــەوە

هەڵقوڵێبێ، بەڵکو لە پێشدا بیرۆکەی سیکۆلاریزم‌و بێدینایەتی، وەك کاردانەوە (ردّفعل)ی واقیعی خراپ‌و لاری کۆمەڵگایەك، کە ئایینی شێوێنراوو تێکدراوی مەسیحیی‌و دام‌و دەزگای کڵێسا تێیدا باڵادەست بووە، سەریهەڵداوە و، پاشان بۆ پاساودانەوەی خۆی، جارێك پەنای بردۆتە بەر دنیابینی ماددیگەریی‌و، جارێکی دیکەش هانای بۆ دنیابینی ئایدیاگەریی بردوە.

ئنجا وەك پێشتریش لە پێناسەکردنی ماددیگەریی (ماتریالیزم)و هزرگەریی (ئایدیالیزم)دا بۆمان دەرکەوت:

١- هەردووکیان لەوەدا یەکسانن، کە زادەو بەرهەمی بیرو هۆشی مرۆڤن و، مرۆڤیش زۆر لەوە بچووکترە، کە وەك پێویست نەك هەر بوون (وجود) بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو (خالق ومخلوق)ەوە بگرە، تەنانەت خۆیشی بناسێ‌و پەی بەنهێنییەکانی ببات!

بۆیە هەرگیز ناگونجێ مرۆڤ سەرچاوەی هەڵقوڵینی (بووناسیی)یەکی ڕاست‌و واقیعی بێت‌و تاکە کەسێك، کە شایستەی ئەوە بێت، خوای بەدیهێنەرو خاوەنی بوونەوەرە، کە هەموو نهێنییەکانی دەزانێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (الفرقان: ٦)، واتە: بڵێ ئەو کەسە ناردوویەتە خوارێ - مەبەست قورئانە- کە نهێنی ئاسمانەکان‌و زەوی دەزانێ، بێگومان ئەو، لێبووردەی بەبەزەییە.

٢- هەردووکیان لەوەدا بەهەڵەداچوون، کە هەرکامێکیان دیوێك‌و لایەنێکی (بوون)ی بینیوەو (ماددیگەریی)، تەنیا ماددەو ڕواڵەتەکانی بینیوەو (هزرگەریی)یش بەس دیوی مەعنەویی‌و نابەرهەست! بەڵام (بوون) بە گشتیی، بۆ دوو لایەنی نابەرهەست (غیر محسوس)و بەرهەست (محسوس)، دابەش دەبێ، وەك خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ وَمَا لَا

تُبْصِرُونَ﴾ (الحاقة: ٣٨-٣٩)، واتە: نەخێر، سوێند دەخۆم بەوەی، کە دەیبینن‌و بەوەش، کە نایبینن...

٣- ئنجا ، ئەگەر گریمان یەکێك بیەوێ ئەو دوو (دنیابینی)یە دژ بەیەکەش پێکەوە کۆبکاتەوە!! دیسان هەر بێ سوودە بۆ گەیشتن بە (بوونناسیی)یەکی ڕاست‌و واقیعی، چونکە هەڵەو کەلێنی ئەو دوو جۆرە دنیابینییە، تەنیا لەوەدا نیە، کە یەکیان (بوون) لە (ماددە)داو، ئەوی دیکەیان لە (هزر)دا کورت هەڵدێنێ! بەڵکو وێڕای ئەوەش، کەلێن‌و کونی دیکەیان زۆرن، کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیانمان نیەو کورتەکەی ئەوەیە، کە هەردووکیان لەبەردەم شەش پرسیارە فەلسەفییە خوارسکەکاندا دەستە پاچەن‌و، وەڵامێکی مەنتیقی‌و ئیقناعکەریان پێ نیە.

لە ئاڵقەیداهاتووشدا - خوا پشتیوان بێ- تیشك دەخەینە سەر بیرو بڕوای هەرکام لە تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و، چۆنیەتی پەیدا بوونیان لە بوونناسیی‌و دنیابینییەکانیانەوە.

## ئاڵقەی دووەم:

## له بواری بیروبڕوا (**عقیدة**) دا

**خوێنەری بەڕێز!**

**دووەمین بوار، کە بە پێویستی دەزانم بەراوردی نێوان تەوژمی ئیسلامییو عەلمانیی تێدا بکەین، بریتیە لە بواری بیروبڕوا.**

پێشتریش باسمان کرد، کە (بوونناسیی) بریتیە لە هەوڵدان بۆ ناسینی (بوون) بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو (خالق ومخلوق)ەوە، کە زانایانی بـواری فەلسـەفەو (علم الکلام) زاراوەی: بوون پێویست (واجب الوجود)یان بۆ خوای بەدیهێنـەر و، بـوون گونجاو (ممکن الوجود)یان بۆ دروستکراوەکان (بوونەوەر) بەکارهێناوە، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە عـەقڵ، بوونی خوا بە پێویست دەزانێو دەڵێ: ناگونجێ بەدیهێنراوێکی ڕێكو پێك (مخلوق منظَّم) هەبێو، بەدیهێنەرێکی ڕێکخەر (خالق مـنظِّم)ی نەبێ، بەڵام پەیدابوونو بوونی بوونەوەر بە هەموو پێکهاتەکانییەوە، بە شتێکی گونجـاو (ممکن) دەزانێ، چونکە دەگونجا نەبێ! بەڵێ، هاتنەدی دروستکراوەکان لە خـودی خۆیاندا، لەگەڵ هاتنەدییان، یەکسانن، ئەگەرخوای بەدیهێنەر ﷻ ویستی لەسەر بوو بێنەدی دروستیان دەکاتو،ئەگەرنەشیویست هەر لە حاڵەتی نەبوون (عَـدَمْ)دا دەمێننەوە!

هەربۆیەش مووسا عليه السلام لە وەڵامی فیرعەوندا، کە لێـی دەپرسـێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ؟!﴾ (طـە: ٤٩)، واتە: ئەدی پەروەردگاری ئێوە کییە، ئەی مووسـا؟! دەفـــــەرموێ: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ (طـــە: ٥٠)، واتـــــە: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە، کە بوونی بە هەمـوو شتێك داوەو پاشان ڕێڕونیشـی کردوە - واتە بەرنامەی بەڕێوەچوونی بۆ دیاریکردوە-.

وەك دەبینین مـووسا عليه السلام پەیدابوون (حدوث)و بەڕێکی بەڕێوەچوون (اهتداء)ی دروستکراوەکانی، کردۆتە بەڵگەو پێناسەی خوای پەروەردگار، بە واتایەکی دیکە: مووسـا عليه السلام لـەوەڵامی فیرعـەونـدا، هــەردوو یاســای عــەقڵیی بەڵگەنەویسـت (بدیهي): هۆکاریی‌و ڕێكو پێکی (السَّببيَّة والنظام)ی بەکارهێناون، کە یەکەمیان دەڵێ: (پەیداکراو بێ پەیداکەر نابێ) و، دووەمیشیان دەڵـێ: (ڕێـك وپێـکی بـێ ڕێکخەر نابێ).

دیارە ئەم وەڵامەی مووسا ﷺ وێڕای ئامانجە سەرەکیەکەی، کە پێناسەی خوای پەروەردگارەو بەڵگە لەسەر هێنانەوەیەتی، ئامانجێکی دیکەشی پێکاوە، کە بریتیە لە بەڵگەهێنانەوە لەسەرئەوە، کە ڕەوا نیە، بێجگە لە خوای خاوەن‌و پەروەردگار، هیچ کەسی دیکە بەرنامەی ژیانی مرۆڤدابنێ، چونکە خوا ﷻ وەك چۆن (بوون)و (چۆنیەتی بەڕێوەچوون)ی بە هەموو دروستکراوێك بەخشیوە، دیارە مرۆڤیشی - کە هەموو بوونەوەری بۆ مەیسەر کردوە- لەو یاسایە هەڵنەواردوەو ڕیزپەڕ نەکردوە، بۆیە بە پێغەمبەرانی هەڵبژاردەیدا -علیهم الصلاة والسلام- بەرنامەو ڕێنمایی خۆی بۆ ڕەوانە کردووە!

بەڵام بیروبڕوا (عقیدة) کە ئەنجام‌و بەرهەمی مەنتیقی (بوونناسیی)یە، ئەوە بریتیە لە هەڵوێست نواندن لەبەرانبەر بووندا.

جا شایانی باسە، کە هیچ کاتێك (بوونناسیی) یان (بوونەوەرناسیی) و (بیروبڕوا) لەیەك دانابڕێن، مەگەر مرۆڤ تووشی نەخۆشی نیفاق‌و دوانەتیی (إزدواجية) بووبێ‌و عەقڵ‌و دڵی لەیەك ترازابن!

بەڵام پێویستە بزانرێ، کە مەبەست لە: پێکەوە پەیوەست بوون‌و لەیەك دانەبڕانی بوونناسیی‌و بیروبڕوا، ئەوە نیە، کە خودی (بوونناسیی) بەس بێت بۆ هاتنەدی (بیروبڕوا)، بەڵکو تەنیا مەبەست ئەوەیە، کە هەموو جۆرە (بیروبڕوا)یەك چاوگێکی بوونناسیی تایبەتی سەربەخۆی هەیە، کە ڕەگ‌و ڕیشەو بنکەکەی لە زەمینەی ویدا دەڕوێ‌و، وەك چۆن دیوار لەسەر بناغە هەڵدەچنرێ، ئاوا لەسەری بنیات دەنرێ.

ئێستاش دەچینە سەروکاری خستنەڕووی بیروبڕوای هەرکام لە تەوژمی ئیسلامیی وعەلمانیی:

## یەکەم: بیروبڕوای تەوژمی ئیسلامیی:

بەرلەوەی دەست بکەین بە خستنەڕووی (بیروبڕوا)ی ئیسلامیی، بە پێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورت بە سێ مەسەلان بکەم:

١- (بیروبڕوا)ی ئیسلامیی، کە تاکە (بیروبڕوا)ی ڕاستو دروستە، لە بنەڕەتەوە ئەنجامو بەرهەمی سروشتیو مەنتیقی ڕاستەوخۆی (بوونناسیی) ئیسلامییەو، هەرکەسێك لە بڕیارو حوکمی عەقڵ لانەدات، مادام بەو شێوەیە تەماشای (بوون) بکات،کە پێشتر خستمانەڕوو، پێویستە (بیروبڕوا)ی ئیسلامییش تەبەنی بکات، هەرچەندە -وەك پێشتر باسمان کرد- لەڕووی خواستو ویست (مشیئة وإرادة)ەوە ئازادەو توانای کردنو نەکردنی هەیە.

٢- چەمكو واتای وشەی بیروبڕوا (عقیدة) لە چەمكو واتای وشەی بڕوا (إیمان) فراوانترەو،وشەی عەقیدە، وێڕای پایەکانی ئیمان، کە قورئانو سوننەت دیارییان کردوون، چەند دیدو بۆچوونو هەڵسوکەوتو ئاکارێکی تایبەتیش دەگرێتەوە، کە ئەوانیش هەر لە قورئانو سوننەتەوە هەڵهێنجراون.

(شایانی باسیشە،کەبەندە بەرگی (١)ی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت) دا)م تەرخان کردوە بۆ پێناسەی: (ئیمان وعەقیدە)و بەرگەکانی (٢ و٣ و٤ و٥)یش بۆ توێژینەوەی پایەکانی ئیمان و، بەرگی (٦)یشم بۆ ڕوونکردنەوەی دیدو بۆچوونو هەڵوێستو ئاکارەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست، تەرخان کردوون).[1]

٣- وەك چۆن تاکە (بوونناسیی) ڕاستو دروست هەر ئەوەیە، کە لە وەحی پارێزراوو دەستکاریی نەکراوی لە قورئانو سوننەتی خواو پێغەمبەردا بەرجەستەکراودا خۆی دەنوێنێ، کە بریتییە لە: (بوونناسیی ئیسلامیی)،

---

[1] ئەو کتێبە بە هەر شەش بەرگەکەیەوە لەلایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ کراوە.

چونکە جگە لە خوای بەدیهێنەرو خاوەنی بوونەوەر، هیچ کەسی دیکە وەك پێویست، نەبەخوا ﷻ ئاشنایەو نە بەدروستکراوەکانیشی شارەزایە، بەهەمان شێوەش تاکە (عقیدة)ی ڕاستو بێ خلتەش هەر ئەوەیە،کەلەسەر بناغەی ئەو (بووناسیی)یە بنیات نراوەو، لە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا دا ﷺ بەیان کراوە، کە (عەقیدەی ئیسلامیی)یە، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی، پەیوەندی بە خوا ﷻ و دروستکراوەکانیو دنیاو دوارۆژو پەنهانو ئاشکراوە هەیە و، ئیمانو عەقیدەش زانیارییەکی جێی دڵنیاییو دوور لە گومانو دوودڵیی پێویستەو، بێجگە لە خوای پەروەردگاریش هیچ کەس ئەو جۆرە زانیاریی و شارەزاییەی لەو بوارانەدا نیە.

ئێستاش هەوڵ دەدەین بە کورتیو پوختی (بیروبڕوا)ی ئیسلامیی بخەینەڕوو:
وەك گوتمان (بیروبڕوا)ی ئیسلامیی بە گشتیی دوو بەشە:
أ. پایەکانی ئیمان.
ب. چەند دیدو هەڵوێستو ئاکارێکی تایبەت.

سەرەتا، باسەرنجێك لە پایەکانی ئیمان بدەین:

## أ- پایەکانی ئیمان:

خوای زاناو شارەزا ﷻ کە باسی ئیمانی کردوە، پێنج پایەی بۆ دیاری کردوون کە بریتین لە:
ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکانیو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرەکانی ﷺ وەك لە ئایەتی ژمارە (١٧٧)ی (البقرة)دا فەرموویەتی:
﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ .. ﴾.

واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە، کە ڕووتان بکەنە لای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکەکاریی پیشەی کەسێکە،کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دواییو فریشـتانو کتێـبو پێغەمبەران هێنابێ..

پێغەمبەری خواش ﷺ وێڕای ئەم پێنج پایە، بڕوا هێنان بە قەدەریشـی وەك پایەیەکی ئیمان باسکردوە، وەك لەو فەرمایشتەدا هاتوە، کە (مُسلم) لە (عمر بن الخطاب)ەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە، کاتێك کـە لـە وەڵامـی پرسـیاری (جبریل)دا: {أَخْبِرْنِي عن الإيمان!} لەبارەی ئیمانەوە هەواڵم پێ بدە! دەفـەرموێ: {أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورُسُلِه واليوم الآخر، وبالقدر خيره وشرِّه}، واتە: (ئیمان ئەوەیە) کە بڕوا بە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبـەرەکانیو ڕۆژی دواییو بە قەدەر، چاکیو خراپی بێنی.

دیارە (ئیمان بە قەدەر)یش هەردەچـێتەوە نێـو ئیمـان بـە خـوا ﷻ، چـونکە بڕواهێنان بە قەدەرو قەزای خوا، بریتیە لە بڕواهێنان بە زانیاریو ویستو تواز و کاربەجێیی خوای پەروەردگارو، ئەمانیش هەموویان سیفەتی بـەرزو بـێ وێنـەی خوان.

ئێستاش با لە سێ خاڵاندا تیشك بخەینە سەر ئیمان و پایەکانی:

## ١- پێناسەی ئیمان:

(ئیمان) بەگشتییو بەتایبەتی ئیمان بە خوا ﷻ بریتیە لـە: زانـینو بەڕاسـت زانینی عـەقڵو، خۆشویستنو پەسندکردنو گەردن بۆ کەچکردنی دڵو دەروونو، دان پێداهێنانی زمانو کردەوەو پابەندیی جەستەو ئەندامەکان.

واتە: کاتێك (ئیمـان) دێتـەدی، کـە هـەرکام لـەو چـوار پێکهێنـەرەی تێـدا بێنەدیو، ئیمان پەکی لەسەر یەك یەکیان کەوتوەو پێویسـتە هـەموویان وێکـڕا بێنەدی، ئەوجار ئەو ئیمانە دێتەدی، کە خوای بەرزو مەزن پێویستی کردوە، وەك خوا لەسەر زمانی بەندەکانی فەرموویەتی: ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ... ﴾ (آل عمران: ١٩٣)، واتـە: پەروەردگارمان! ئێمە گوێبیستی

بانگکەرێك بووین، کە بانگی دەکرد بۆ ئیمان، کە: ئیمان بە پەروەردگارتان بێنن! ئێمەش ئیمانمان هێنا.

ئنجا با یەکی بەلای کەمەوە، بەڵگەیەکی قورئانی لەسەر هەرکام لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان بێنینەوە:

١- زانین‌و بەڕاست زانینی عەقڵی (العلم والتصديق العقلي):

خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ .. ﴾ (محمد: ١٩)، واتە: دەجا بزانە، کە بێجگە لە خوا، هیچ پەرستراو نین..

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ (المائدة: ٨٣).

واتە: کاتێك ئەوەیان بیست،کە بۆ پێغەمبەر نێردراوەتە خواریْ، چاوەکانیانت بینی فرمێسکی لێ هەڵڕژا، بەهۆی ئەوەوە، کە هەقیان ناسی، دەڵێن: پەروەردگارمان! ئیمانمان هێنا، دەجا لەگەڵ گەواهییدەراندا بماننوسە.

کەواتە: یەکەمین بنەماو پێکهێنەری ئیمان بریتیە لە زانین‌و ناسینی هەق، هەقێك، کە لە خواو پێغەمبەرەکەیداو لەوەدا، کە بۆی ناردۆتەخواریْ بەرجەستەیە.

٢- خۆشویستن ‌و پەسندکردن‌و گەردن بۆکەچکردنی دڵ‌و دەروون:

خوای بە بەزەیی ﷻ فەرموویەتی:

﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ ... ﴾ (الحجرات: ٧).

واتە: بەڵام خوا ئیمانی لەلا خۆشەویست کردن‌و لەدڵتاندا ڕازاندیەوە..

وە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴾ (النساء: ٦٥).

واتە: نەخێر، بە پەروەردگارت (سوێند)، ئیمان ناهێنن هەتا لەوەدا، کە تێیدا کەوتوونە کێشەوە، تۆ نەکەنە دادوەر، پاشان هەست بـە هـیچ جۆرە سەغڵەتییەك نەکەن بەهۆی بڕیارەکەتەوە و، بەتەواویی گەردن کەچ نەبن.

کەواتـە: ئیمـان ئەوەیە،کەلـەدڵو دەروونـی خاوەنەکەیـدا شـیرینو خۆشەویستو ڕازاوە بێت و، هەرکەسێك لە ناخییەوە تەسلیمو گەردن کەچی خواو پێغەمبەرو بەرنامەو حوکمو بڕیارەکانیان نـەبێ، بـە خـاوەن ئیمـان دانانرێ!

٣- دان پێداهێنانی بە زمـ ن:

خوای پاكو تاك فەرموویەتی:

﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦ فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا هُمۡ فِي شِقَاقٖۖ فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ (البقرة:١٣٦-١٣٧).

واتە: بڵێن ئیمانمان بە خوا هێناو بەوە، کە بۆلامـان نێرراوەتـە خـوار، بەوەش، کە بۆلای ئیبراهیمو ئیسماعیلو وئیسحاقو یـەعقووبو ئەسـبا نێرراوەتە خوار و، بـەوە کـە بـە مووسـاو عیسـا دراوەو، بـەوە، کـە بـە پێغەمبەران دراوە لە پەروەردگاریانەوە، جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانو، ئێمە بۆ ئـەو (خـوا) گـەردن کەچـین. جـا ،ئەگەرئـەوانیش ئیمانیان هێنا بەوێنەی ئەوە، کە ئیمانتان پێ هێناوە، ئـەوە ڕای ڕاسـتیـ ن گرتوە..

کەواتە: دان پێداهێنان (إقـرار)ی زمانیش بە هەموو ئەو شتانەدا، کـە پێویستە دانیان پێدا بهێنرێ، بەشێكو پێکهێنـەرێکی ئیمانـەو، خـوا بـە ئیمان ناوی بردوە.

٤- کردەوەو پابەندیی جەستـەو ئەندامـەک ن:

خوای بەرزو بێ هاوتا فەرموویەتی:

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُوْلَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (النور: ٤٧).

واتە: (دەغەڵەکان) دەڵێن: ئیمانمان بە خواو بە پێغەمبەر هێنـ و فەرمانبەرین، پاشان کۆمەڵێکیان پاش ئەوە پشت هەڵدەکەن، ئەوجۆرە کەسانە ئیماندار نین.

کەواتە: بە کردەوە پابەند بوون بە بەرنامەی خواوە ﷻ و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی، بەشێكو پێکهێنەرێکی دیکەی بنەڕەتی ئیمانەو، خوای کاربەجێ بابای پشت هەڵکردوو لادەر لە ئایینو بەرنامەکەی خۆی، بە تایبەت لە بواری حوکمو سیاسەتدا - وەك لە سیاقی ئایەتەکاندا ئاشکراو ڕوونە- بە بێ ئیمان وەسف کردوە.

پوختەی مەبەست لە پێناسەی ئیماندا، بۆ نموونە: ئیمان بە خوا ﷻ:

ئەوەیە،کەسەرەتا مرۆڤ بە عەقڵو هۆش، بەو جۆرەی کە (وەحی) ڕاستو نەگۆڕراوی خوا - کە لە قورئانو سوننەت دا بەرجەستەیە- خستوویەتە ڕوو، خوا ﷻ وەك تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنو، تاکە پەرستراو (إلـه)و ناوبراو بە هەموو ناوێکی هەرەچاكو وەسفکراو بە هەموو سیفەتێکی هەرە پەسند بناسێ و، پاشان بە دڵو دەروون بە تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنو پەرستراوی خۆی قبووڵی بکات و، ئەوپەڕی خۆشویستنو بە گەورەگرتنو لێترسانو مل بۆ کەچکردنی بۆی هەبێ و، ئنجا بە زمانیشدان بەو ڕاستییانەدا بێنێ و، دوایـیش بە کردەوەو هەڵوێست بیخاتەڕووو ئیسپاتی بکات - بەهۆی پابەندیی بە بەرنامەی خواوە- کە تەنیا خوا بە پەروەردگارو پەرستراوی خۆی دەزانێ.

## ٢- چۆنیەتی پێكەوە پەیوەست بوونی پایەكانی ئیمان:

پایەكانی ئیمان وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك، هەموویان پێكەوە پەیوەستن‌و پایــەی یەكەمیشیان، كە گەورەترین‌و گرنگترینیشیانە، چەق (مركز)ی سەرجەم پایەكانی دیكەیەو هەموویان لە دەوری وی دەسووڕێن.

چونكە ئیمان بە خوا ﷻ ڕاستەوخۆ ئیمان بــە دیــدار (لقــاء)ی خــوا داخــواز دەكات لە ڕۆژی دواییداو، ئیمان بە خواو بەدیدار شادبوونیشی پاڵ بە مرۆڤــەوە دەنێ، كە لە بیری ئەوەدا بێ بەجۆرێك ژیان‌و گوزەرانی دنیای بەرێتە سەرێ، كــە خوا ﷻ لێی ڕازی بێ‌و لە كاتی بە دیدار شادبوونیدا ســەری بــەرزو ڕووی ســوور بێــت، دیــارە ئــەوەش بــەوە مەیســەر دەبــێ، كــە ژیــان‌و گوزەرانەكــەی بــەپێی بەرنامەیەك بەرێ بكات، كە خوا بۆی دیاری كردوە، كە لە كتێب‌و بەرنامەكەیدا بەرجەستەیە، ئاشكراشە، كە ناگونجێ مرۆڤــەكان هەركامیان ڕاستەوخۆ كتێــب‌و پەیام‌و بەرنامەی خوا وەربگرێ، بەڵكو خوا ﷻ لە ڕێی چەند بەندەیەكیدانســتەو هەڵبژاردەیەوە، كە پێغەمبەرانن - عَلَيهِمِ الصلاة السَّلام - ئــەو كــارەی كــردوە، ئنجا پێغەمبەرانیش لەڕێی فریشتە پاك‌و بێ هەڵــەو پەڵــەكانی خــواوە كتێــب‌و بەرنامەكانی خوایــان وەرگرتــوون، وەك خــوا فەرموویــەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴾ (الحج: ٧٥)، واتە: خوا لــە فریشتان‌و لە خەڵكی، ڕەوانەكراوانێك هەڵدەبژێرێ ،بێگومان خوا بیسەری بینەرە.

كەواتە: ئیمان بە خوا ﷻ، ئیمان بە دیداری خــواو ڕۆژی دوایــی دەخــوازێ، ئیمــان بــە خــواو بــە ڕۆژی دوایــیش، ئیمــان بــە فریشــتەكانی خــواو كتێــب‌و بەرنامەكانی‌و پێغەمبەرەكانی، دەخوازێ.

ئەمە لە بارەی پێكەوە پەیوەست بوونی سەرجەم پایەكانی ئیمانەوە.

لەبارەی سووڕانەوەی سەرجەم پایەو بنەڕەتەكانی ئیمانیشەوە، لــە ســووڕگەی یەكەمین‌و گەورەترین پایەی ئیماندا، كە بڕوا بە خوا بوونە، دەڵێین:

خوا ﷻ بە هەندێك لە فریشتە پاكو چاكەكانی خۆیدا، كتێبو بەرنامەكانی خۆی بۆ چەند ئینسانێكی شایستەو هەڵبژاردە - كە پێغەمبەرانن عَلَيهِم الصلاة السَّلام- ڕەوانە كردوون، كە نوێنەران (سُفَراء)ی نێوان خواو بەندەكاننی لە مرۆڤو جند، تاكو ڕێنماییيان بكەن بەرەو جۆرە ژيانو گوزەرانێك، كە بەندايەتی (عبودية) خۆيانی بۆ خوا تێدا ئیسپات دەكەن و، خۆيان وا لێدەكەن، كە شايستەی بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خواو بە ديدار گەيشتنی بن.

## ٣- چۆنیەتی بنیات نرانی بیروباوەڕی ئیسلامیی لەسەر بناغەی بوونناسیی ئیسلامیی:

پێشتر باسی (بوونناسیی) ئیسلامییمان كردو، پێویست ناكات بۆ ڕوونكردنەوەی چۆنیەتی بنيات نرانی (بیروبڕوا)ی ئیسلامیی، لەسەری، لێرە دووبارەی بكەينەوە، بەڵام پوختەكەی دەخەينەوە ڕووو دەڵێين:

خوا ﷻ بەديهێنەرو خاوەن پەروەردگاری بوونەوەرە بە هەموو پێكهاتەكانييەوە، كە حەوت ئاسمانەكانو زەویو ئەوەیە،كەدەكەوێتە نێوانيانەوەو بە مەبەستی تێدا تاقيكردنەوەی مرۆڤ و جند، بە ڕێكو پێكترين شێوە لە نەبوونەوە هێناويەتەدی و، كاتێكيشی دیاری كردوە، كە تێيدا بازاڕەكەی دەپێچێتەوەو كۆتايی پێدێو قۆناغێكی ديكە دەست پێدەكات،كە قۆناغی قيامەتو ڕۆژی دواييیەو، بڕوادارانی چاكەكار بە بەهەشت پاداشت دەدرێنەوەو بێ بڕوايانی خراپەكاريش بە دۆزەخ سزا دەدرێن.

چۆنيەتی هەڵقوڵينی بیروبڕوای ئیسلامییش، لەم جۆرە (بوونناسیی)یە بەم شێوەيە:

لە سۆنگەی ئەوەوە، كە خوا - جلّ وعلا - بەديهێنەرو خاوەنی بوونەوەرو ژيانو ئينسانەو، ئينسانيشی بۆیە دروست كردوە، كە لەم ژيانە دنياييیەدا تاقی بكاتەوەو، تاقيكردنەوەكەشی لە جێنشينايەتی (خِلافة) كردنی خوادا لەسەر زەوی

خۆی دەنوێنێ، بۆیە عەقڵی تەواوو فیترەتی ساغو مەنتیقی ڕاست، ئەوە دەخوازن، کە ئینسان ئیمان بە خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی بوونەوەر بێنێو بەندایەتی بۆ بکاتو لەخۆی ڕازی بکات، تاکو سەرەنجامو پاش کۆتایی هاتنی ژیانی دنیا، سەربەرزانە بە دیداری شاد بێتو شایستەی ئەوە بێ، کە ژیانی هەتا هەتایی لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانیدا، پێ ببەخشێ، دیارە ئەو بەندایەتی بۆ خواکردنو بەوجۆرە ژیانی دنیا گوزەراندنەش، بەبێ ئایینو بەرنامەیەکی تایبەتی لە خواوە ڕەوانەکراو مەیسەر نابێ.

خوای بەبەزەیی لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ !﴾ (فاطر: ٣).

واتە: ئەی خەڵکینە! چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، ئایا جگە لە خوا، بەدیهێنەرێکی دیکە لە ئاسمانو زەوییەوە بژێوتان دەدات؟! بێجگە لەوی هیچ پەرستراو نین، بەرەو کوێ لادەدرێن؟!

ئنجا ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، مادام تێکڕای بوونەوەر هەر لە گەردیلەکانەوە بگرە، تا کەهکەشانەکان، هەمووی ملکەچی خوایەو بەوپەڕی ڕێكو پێکی و بەپێی ئەو سیستەم (نظام)ە بەڕێوەدەچێ، کە بۆیدانراوەو بە موو لێی لانادات،پێویستە مرۆڤیش وەك چۆن لەبەشە لەویست بەدەر (لا إرادي)ەکەیداملکەچی سیستەمی خوایە،لەوبەشەی هەڵسوکەوتو ژیانو گوزەرانیشی،داکەکۆنترۆڵی ویستو خواستیەتی، پابەندو گەردن کەچی ئەو بەرنامەیە بێت،کە بە هۆی فریشتەکانییەوەو لەڕێی پێغەمبەرەکانییەوە بۆی ڕەوان کردوە، تاکو دەنگێکی بۆڕو نەشاز نەبێ لەنێو کۆڕسی بوونەوەردا، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ؟!﴾ (آل عمران:٨٣).

واتە: ئایا بەرنامەیەکی دیکە، جگە لە هی خوا دەخوازن! لە حاڵێکدا، کە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان، چارو ناچار ملکەچی وینو بۆ لای ویش دەگێڕرێنەوە؟!

ئنجا با سەرنجێکی خێراش بدەینە بەشی دووەمی بیروبڕوای ئیسلامیی:

## ب- چەند دیدو هەڵوێست و ئاکارێکی تایبەت:

کە دیارە ئەمانیش هەر هەڵقوڵاوی شەریعەتو میوەو بەرهەمی ئیمانن‌و، وەك پایەکانی ئیمانیش عەقڵو فیترەتی ساغ داخوازییان دەکەن:

١- پابەندیی بە شەریعەتەوە لە وردو درشتی ژیانو، گوزەرانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیدا.
وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (الجاثية: ١٨).

٢- ڕێز لێگرتن‌و خۆشویستن‌و شوێن پێ هەڵگرتنی هاوەڵانی دڵسۆزو بنەماڵەی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ (خوایان لێ ڕازی بێ).
وەك خوای تاك‌و پاك فەرموویەتی: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ..﴾(التوبة: ١٠٠).

٣- ڕێز لێگرتن‌و پشتگیریی کردنی زاناو پێشەوایانی ڕەسەن.
وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ..﴾ (المجادلة: ١١).

٤- گرنگیی دان بە تەزکیەی نەفس‌و خۆڕازاندنەوە بە خەسڵەتە بەرزو پەسندەکان‌و، خۆ بژارکردن لە خوو خدەو سیفەتە نزم‌و پەستەکان.

وەك خوای بەرزو بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾ (الشمس: ٧-٨-٩-١٠).

٥- هەڵبێژیی و بانگەواز بۆ چاكەو فەرمان بە چاكە كردن و ڕێ لە خراپە گرتن.
وەك خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران: ١٠٤).

٦- ڕەچاوكردنی هاوسەنگیی (إتّزان)و، خۆ پاراستن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان (الإفراط والتفريط).
وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟...﴾ (هود:١١٢).

٧- دڵسۆزیی و بە تەنگەوە بوون (النُّصح) بۆ خواو، كتێبەكەی و پێغەمبەرەكەی و كاربەدەستانی مسوڵمانان و تێكڕای خەڵكی.
وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {الدين: النَّصيحة، قُلنا لِمَنْ؟ قـال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعـامَّتهم} (رواه مسلم).

٨- بە مسوڵماندانانی هەركەسێك خۆی بە مسوڵمان پیشـاندا، مەگـەر كـوفری ئاشكراو بێ پێچ و پـەنای لـێ ببینـرێ، كـە ببێتـە مایـەی هەڵوەشـانەوەی مسوڵمانەتییەكەی.
وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ (النساء: ٩٤).

٩- چاكەكارو هاوكاربوون لەگەڵ هـەموو ئـەو نامسـوڵمانانەدا، كـە لەگـەڵمـان تەبان و دژایەتی دین و ژینمان ناكەن.

وەك خــوای چــاكەكار فەرموویــەتی: ﴿..وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ..﴾ (المائدة:٢)، وە فەرموویەتی: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ (الممتحنة: ٨).

١٠- ئامادەیی هەمیشە بۆ جەنگ‌و جیهاد لە پێناوی خواداو بەخشینی سەرو ماڵ.

وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ (الحجرات: ١٥).

جا خوێنەری بەڕێز!

ئەمەی ڕابرد، كورتەیەك بوو لـەبارەی (بیروبـڕوا)ی ئیسـلامییانەی تـەوژمی ئیسلامیییەوە، ئاشكراشە، كـە (بیروبـڕوا)ی هەركەسـێك‌و كۆمـەڵێك، بناغـەو هـەوێن‌و هـەناوی كەسـایەتییانەو، سەرچـاوەو كانگـای سـەرجەم بیروبۆچـوون‌و هەڵوێست‌و كردارو ڕەفتاریانە.

خواش یاربێ، باسیداهاتوومان توێژینەوەی (بیروبڕوا)ی تەوژمی عەلمانییە.

## دووەم: بیروبڕوای تەوژمی عەلمانیی:

خوێنەری سەنگین!

لە سۆنگەی ئەوەوە، کە (بوونناسیی) یان (بوونەوەرناسیی)و (بیروبڕوا) پەیوەندییەکی توند وتۆڵیان پێکەوە هەیەو، (بیروبڕوا) بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە (بوونناسیی)یەوە هەڵدەقوڵێ و، وەك پێشتریش باسمان کرد، تەوژمی عەلمانیی خاوەنی یەك (بوونەوەرناسیی)و (دنیابینی) سەربەخۆو ڕوون نیە، بۆیە خاوەنی بیروبڕوایەکی یەکگرتوو (مُوَحَّد)و سەربەخۆش نیە، بەڵکو پەیڕەوانی سیکۆلاریزم گەلێك جۆرە بیروبڕوای جیاجیاو هەندێك جار دژ بەیەك‌و ناکۆکیان تەبەننی کردووە‌و، دەتوانین بڵێین: بیرۆکەی سیکۆلاریزم هەمیشە - لە بواری بیروبڕوادا- لەژێر کاریگەریی پاشینەی فیکریی ئەو خەڵك‌و کۆمەڵگایانەدا بووەو هەیە، کە لە نێوانیاندا سەری هەڵداوە، ئەوەتا وێڕای قوتابخانەکانی تەوژمی مرۆڤگەرایی (Humanism) کە داکۆکییان لەسەر ڕێزو پایەو مافەکانی مرۆڤ دەکرد، هەرکام لە نازیّتی (Nazi) (هیتلەر)و شۆڤینیزم (Chaavinisme)ی (مۆسۆلێنی)و ستالینیزم (Stealinism)ی (ستالین)یش، کە هەتا سەر ئێسك دەمارگیریی‌و بەرچاوتەنگیی‌و خۆپەسندیی‌و خەڵك بەکەم سەیرکردنیان تێدا بەرجەستە بوو بوو، توانیویانە بچنە ژێر چەتری سیکۆلاریزمەوە!

گومانیشی تێدا نیە، ڕێچکەو بیرۆکەیەك ماتریالیزم‌و ئایدیالیزم‌و دیکتاتۆریی‌و دیموکراسیی‌و خواناس‌و خوانەناس و...هتد، بتوانن لەژێر چەترو سێبەریدا کۆببنەوە، دیارە خاوەنی بیروبڕوا (عقیدة)یەکی زۆر سەیرو بێ سەرەوبەرەیەو، ئەو قسە فۆلکلۆرییە ئەفسانەییەمان دێنێتەوە یاد، کە دەربارەی ڕۆژگاری حوکمڕانیی (موحەممەدی مەهدی) دەڵێ: (گورگ‌و مەڕ پێکەوە ئاوێ دەخۆنەوە)!

ئێستاش دوای ئەم ڕوونکردنەوە گشتیی یە لە بارەی (بیروبڕوا)ی تەوژمی سیکۆلاریستەوە، با بچینە سەر ئەسڵی مەبەست‌و، بزانین سیکۆلاریستەکان

خاوەنی چ جۆرە (بیروبڕوا) یەکن،و چ جـۆرە هەڵوێسـتێکیان لـە بەرانبـەر بـوون (وجود)دا هەیەو، چۆن چۆنی هەڵس وکەوت لەگەڵ خاوەنی بوونەوەرو، بوونەوەرو ژیان،و ئینسان،و ئایین،و دنیاو دواڕۆژدا دەکەن؟!

پێشتر باسمان کـرد، کـە سـیکۆلاریزم (العَلْمانیـة) لـە سـەرەتاو لـە شـوێنی سەرهەڵدانیدا، لە بـواری (بووناسـیی)دا، بـە شـێوەیەکی گشـتیی هـەرکام لـە ماددیگەرایی (المادّیة)و ئایدیاگەرایی (المثالیـة)ی تەبەننی کردوون،و، هەندێك لـە پێڕەوانی ماتریالیست،و هەندێکیشیان ئایدیالیست بوونە.

جا لێرەوە دەڵێین:

ئەو بەشەی تەوژمی عەلمانییەت،کە (دنیابینی) ماددیگەراییان هەڵبژاردووە، (بیروبڕوا)یەکەیان ئاشکرایە، چونکە:

کەسێك پێی وابێ (بوون) لە ماددەو ڕواڵەتەکانیدا کورت هەڵاتوە،و، بوونەوەر هیچ کەس بەدیهێنەرو خاوەن،و سەرپەرشتیاری نیەو، ژیانیش بەس ئەم قۆناغـەی دنیایە،و هیچ قۆناغی دیکەی ژیان بە دوای ئەم ژیانە زەمینییەدا نایـەن! بـەڵێ، بابایەکی وا، بێگومان بیروبڕوایەکەی- هەرچەندە پـووچ،و بـێ بەڵگەیـە-، بـەڵام شـتێکی ڕوونـە هـەر لـە ڕێـوە، ڕێـی لـە بـاس،و خواسـی خـوا ﷻ و وەحـی،و پێغەمبەرایەتی،و کتێب،و بەرنامەو ڕۆژی دوایی و...هتد گرتوە،و، هیچ حسابێکی بۆ غەیری ماددەی بەرهەست نەکردوە.

جا ئەم جۆرە سیکۆلاریزمە دەگونجێ بـە سـیکۆلاریزمی گشـتگیر (العَلمانیـة الشاملة)، یـان سـیکۆلاریزمی سروشـتیی/ماددیی (العلمانیـة الطبیعیة/المادیـة) ناوبنێین، چونکە -وەك یەکێك لە شارەزایان لە پێناسەکردنیدا گوتوویەتی:-

((ئەو جۆرە سیکۆلاریزمە تێڕوانینێکی گشتگیرە بـۆ بوونـەوەر، بـە هـەموو ئاست،و بوارەکانییەوە، کە نەك تەنیا ئایین لە دەوڵەت،و لە هەندێك لایەنی گشتیی ژیان جیادەکاتـەوە، بـەڵکو لـە سـەرەتاوە هـەموو بـەها ئـایینی،و ئـەخلاقیی،و مرۆیییەکان لە سەرجەم لایەنەکانی ژیانی گشتیی دەپچڕێنێ، پاشان لە کۆتاییـدا

لە تێکڕای لایەنەکانی ژیانی تایبەتیش، هەتا وای لیدا، کە بە تەواویی پیرۆزیی لە بوون (مرۆڤــو سروشت) دادەڕنرێ...))[1]-.

کەواتە: ئەم جۆرەی سیکۆلاریزم،وا لە شوێنکەوتوانی دەکات،کە لە (بوون)دا، جگە لە ماددەو لە خۆیاندا، جگە لــە جەســتەو لــە ژیــانی تــاکیی‌و خێزانیــی‌و کۆمەڵایەتییاندا، جگە لە تێرکردنی غەریزەکان، شتێکی دیکە نەبینن!

بەڵام بەشی دووەمی تەوژمیی عەلمانیی، کە (دنیابینی) ئایدیاگەراییان پەسند کردوەو، کەم‌و زۆر، دان بە بوونی خواو جیهانی ئەودیو سروشــت (میتافیزیــك)و ڕووح‌و ئایین‌و ئەخلاق‌و ڕۆژی دواییدا دێنن، دەتوانین بڵێین:

بەگشتیی (بیروبڕوا)یەکەیان ئەم خاڵانەی خوارێ، هێڵــە ســەرەکییەکانی پێــك دێنن:

١- دانهێنان بەوەدا، کە بوونەوەر دروستکراو (مخلوق)ەو، بەدیهێنەرو خاوەنێکی هەیە.

٢- دانهێنان بەوەدا، کە مرۆڤــ وێڕای جەستە لە گیان (روح)یش پێکهاتوە.

٣- دانهێنان بەوەدا، کە بەگشــتیی، ژیــانی تــاکیی‌و خێزانیــی‌و کۆمەڵایــەتی مرۆڤــ، پێویستی بە جۆرێك لە ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو پەسند هەیە.

٤- نکوولیی کردن لە دەست تێوەردانی کلێساو پیاوانی ئایین لە ژیان‌و گوزەرانی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و خەڵك‌و دەوڵەت.

٥- پێداگیریی لەسەر ئەوە، کە خوا ﷻ، یان هەر هیچ بەرنامەو ئایینێکی بــۆ ڕێنمایی ئینسان‌و ڕێکخستنی ژیانی نەناردوە، یان ئەگەر ناردبیشی، تایبەتە بەلایەنی ڕووحیی‌و شەخسییەوەو، هــیچ پەیوەنــدیی بەلایــەن‌و بوارەکــانی دیکەی ژیان‌و گوزەرانەوە نیە.

---

(١) بڕوانە: (العلمانيـة الجزئيـة والعلمانيـة الشـاملة) د.عبـدالوهاب الميسـيري، ج٢ ص٤٧٢، ط٢/٢٠٠٢.

دەشتوانین ئەم جۆرە لە سیکۆلاریزم، بە سیکۆلاریزمی بەشیی (العلمانية الجزئية) ناوبنێین، کە یەکێك لە شارەزایان ئاوا پێناسەی کردوە:

(عەلمانییەتی بەشیی) تێڕوانینێکی بەشیی (رِؤية جزئية)یە بۆ واقیع، کە تەنیا دنیای سیاسەت‌و، جاری واشە (ئابووریی)یش دەگرێتەوەو بەزۆریی بە: (جیاکرنەوەی کلێسا لە دەوڵەت) تەعبیردەکرێ، مەبەستیش لە کلێسا، سەرجەم دامەزراوە تایبەتییەکانیەتی و، مەبەست لە دەوڵەتیش، دەزگا جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتە...))[1].

دیارە خاڵی هاوبەشی نێوان هەردوو جۆرەکەی سیکۆلاریزم‌و، هەردوو بەشەکەی تەوژمی عەلمانیی ئەوەیە، کە مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ژیان‌و گوزەرانی خۆی لە هەموو ئاست‌و بوارەکاندا، هیچ حیسابێك بۆ خواو ئایین نەکات‌و، تەنیاو تەنیا پشت بە عەقڵ‌و تواناو ئەزموونەکانی خۆی ببەستێ‌و، لە جوغزی قاوغ‌و قەپێلکی خۆی نەچێتەدەرێ‌و، هەمیشە سەری بەرەوخوار (زەمین) شۆڕبکاتەوەو، بە هیچ جۆرێك بەرەو سەرێ (ئاسمان) بەرزی نەکاتەوە!

هەر بۆیەش جۆن هۆلیۆك (John Holyooke-1817-1906) کە یەکەمین کەسە، چەمك‌و واتای وشەی سیکۆلاریزمی وەك زاراوەیەکی سیاسیی‌و فەلسەفیی‌و کۆمەڵایەتی هاوچەرخ دارشتوە، لە پێناسەی سیکۆلاریزم دا گوتوویەتی:

((بریتیە لە قەناعەت هەبوون بەوە، کە دەگونجێ حاڵ و باڵی مرۆڤ لە میانەی ڕێیە ماددییەکانەوە چاك بکرێ، بێ ئەوەی مەسەلەی ئیمان بهێنرێتە گۆڕێ‌و بە چاك، یان خراپ باس بکرێ))[2].

---

(١) بڕوانە: (العلمانية الجزئية والعلمانية الشاملة) د.عبدالوهاب المسيري، ج٢ ص٤٧١، ط٢/٢٠٠٢.

(٢) بڕوانە: (العلمانية تحت المجهر) ص١٢، ط١ -٢٠٠٠-، د. عبدالوهاب الميسيري، و د. عزيز العظمة.

هەروەها فەرهەنگی (ویبستر Webster) ص٢٠٥٣، بە هەمان شێوە پێناسـەی کردەوەو، سەرجەم فەرهەنگەکانی دیکەش، قسـەکانیان هـەر لـەو سـوورگەیەدا دەخولێنەوە، بۆ نموونە، بڕوانە هەرکام لـە: (الموسـوعة السياسـية) ج٤ ص١٧٩-١٨٠، پیتی (ع)، وە فەرهەنگی (دائرة المعارف البريطانية) وشەی (Secularism)، وە فەرهەنگی (أوكسفورد Oxford) وشەی (Secular)، وە (المعجم الدولي الحديث) وشەی (Secularism)، بڕوانە: (العلمانية)ی سفر عبدالرحمن الحوالي، کە پێناسەی هەموویانی بە درێژی هێناوە.

جا خوێنەری بەڕێز!

ئێستا، کە هەتا ڕاددەیەك (بیروبڕوا)ی تەوژمی عەلمانییمان بە هەردوو ڕەوتی ماددیگەرایی‌و ئایدیاگەراییەوە، بۆ ڕوون بۆوە، بە پێویستی دەزانم تۆزێك تیشك بخەینەسـەر سەرگوزەشـتەو چـۆنیەتی‌و هۆکارەکـانی سـەرهەڵدانی بیرۆکـەی سیکۆلاریزم‌و، بیانووو پاساوەکانی پەنا وەبـەربردن‌و پێـوە هۆگربـوونی خـەڵکی ڕۆژئاوا بەو ڕێچکەیەوە، دیـارە دوای ئـەوەش، بادەدەینـەوە سـەرباس‌و خواسـی سیکۆلاریزم لە وڵاتانی مسوڵمان نشیندا، کـە ئایـا بیـانووو پاسـاوەکانی چین‌و سەرەنجامی چۆن دەبینین؟!

## سەرگوزەشتەی سەرهەڵدانی سیکۆلاریزم لە ڕۆژئاوا دا:

هەر لەو ڕۆژەوە، کە خوای کاربەجێ مرۆڤـی لەسەر زەوی نیشتەجێکردو بـە جێنشینی خۆیداناو ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمینی پێ سپارد، وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا..﴾ (هود: ٦١)، واتە: ئەو (خـوا)، ئێـوەی لـە زەویدا پێگەیاندوەو، ئاوەدان کردنەوەکەیشی بە خۆتان سپاردوە!

بەڵێ،، هەر لەو ڕۆژەوە گفتی پێدا، کە ڕێنمایی‌و بەرنامەی تایبەتی خۆی بـۆ ڕەوانە بکات‌و، وێڕای پێبەخشینی عەقڵ‌و فیترەت‌و هەستەوەرەکان، لەڕێی وەحی‌و پەیامی خۆشییەوە هاوکاریی بکات، تاکو بتوانێ ژیـانی زووتێپـەڕی دنیـای بـە شێوەیەك بەسەرببەرێ، هەم مرۆڤـایەتیی، خۆی بپارێزێ‌و، هەم بەندایەتی خۆیشی

بۆخوا ئیسپات بکات، سەرەنجام بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دوارِۆژ بۆ خۆی مسۆگەر بکات، بە هۆی دەرچوونی لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیاو ڕازیکردنی خوای بەبەزەیی‌و بەخشندەیەوە، وەك خوای بەرزو مەزن لەکاتیدابەزاندنی ئادەم‌و حەوا -عَلَيهِما السَّلام- و ئیبلیسدا لە بەهەشت‌و ئاسمانەوە بۆ سەرزەوی، پێی فەرموون:

﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴾ (طه: ١٢٣).

واتە: فەرمووی هەردوولاتان وێکڕا دابەزن (بۆ سەرزەوی)، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، جا هەرکات لە منەوە ڕێنمایی‌تان بۆ هات، ئەوە هەرکەسێك شوێن ڕێنمایی من بکەوێ، نە سەرگەردان دەبێ‌و، نە بێ مرادو شپرزەحاڵ..

ئیدی هەر لەو ڕۆژەوە،کە خوای کاربەجێ، پەیتا پەیتا بە پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خۆیدا ڕێنمایی‌و بەرنامەکانی خۆی بۆ مرۆڤ‌و جند ناردوون، لە هەر چاخ‌و ڕۆژگارەدا بەگوێرەی پێداویستییان‌و بە پێی هەل‌و مەرجیان، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾ (فاطر: ٢٤).

واتە: ئێمە بە هەق تۆمان بە موژدەدەرو ترسێنەر ڕەوانەکردوە، هیچ گەل‌و کۆمەڵێکیش نەبووە، کە ئاگادارکەرەوەیەکی تێدا نەنێردرابێ.

ئیدی بەو جۆرە نێررانی پێغەمبەران - عَلَيهِم الصَّلاة والسَّلام- بە کتێب‌و پەیامەکانی خواوە بەردەوام بوو، وەك زنجیرێکی نەپساو، هەتا نۆرە گەیشتەسەر عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ)، کە وەك سەرجەم پێغەمبەرەکانی دیکەی بەنی ئیسرائیل، تایبەت بوو بە گەلی جوولەکە (یهود)ەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ ﴾ (الصف: ٦).

واتە: کاتێك عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی وەچەی ئیسرائیل (یعقوب)! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان، تەوراتی پێش خۆم بە ڕاست دادەنێمو، موژدەشتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك، کە لە دوای مندا دێت، ناوی ئەحمەدە..

ئنجا شایانی باسیشە،کەعیسا ﷺ لە سۆنگەی ئەوەوە، کە تەنیا بۆ جوولەکەکان نێررابوو، ئەوانیش ئەو (توراة)ەی، کە کاتی خۆی بۆ مووسا ﷺ نێررابوو بەرنامەیان بوو، بۆیە خوای زاناو توانا فەرمانی پێکرد، کە بە تەوراتەوە پابەند بێت، ئەوەندە هەیە لە سۆنگەی ئەوەوە، کە جوولەکەکان لە هەندێك شوێن دەستکاریی تەوراتیان کردبوو، زۆریش گیرۆدەی ڕۆچوون (غُلُوٌّ)و زیادەڕۆیی بووبوون، لە بواری ماددیی‌و دنیاگەراییدا، لەبەر ئەوە خوا ﷻ (إنجیل)یشی بۆ عیسا نارد، کە هەم هەڵەو پەڵەکانی جوولەکە ڕاست بکاتەوە و، هەم لەڕووی دنیاگەرییشەوە سەریان بشکێنێتەوەو، قیامەتیان بیربخاتەوەو لایەنی ڕووحیی‌و ئەخلاقیی‌و تەزکیەشیان تێدا ببووژێنێتەوە، وەك خوای بێ وێنە لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ (الزخرف: ٦٣)، واتە: کاتێك عیسا بە بەڵگەکانەوە هات، گوتی: حیکمەتم بۆ هێناون و، هاتووم، کە هەندێك لەوەی تێیدا کەوتوونە کێشەو ڕاجیاییەوە، بۆتان ڕوون بکەمەوە، دەجا پارێز لە خوا بکەن‌و بە قسەم بکەن!

کەواتە: هەر لە بنەڕەتەوە پەیام‌و بانگەوازەکەی عیسا ﷺ ،وەك هی سەرجەم پێغەمبەرانی دیکەی پێش خۆی - عَلَيهِم السَّلام- گشتگیر نەبوو، بەڵکو تایبەت بوو بە گەل‌و کۆمەڵگایەکی دیاری کراوەوە، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە کتێبەکەی عیسا - کە ئەویش لە ئەسڵدا یەك ئینجیل بوو، بەڵام پاش گۆڕرانی، کرا بە چوارو بگرە زیاتریش - بەرنامە (شریعة)یێکی وای نەگرتبوە

خۆی، کە ،تەنانەت لەو سەروحەدەشدا، بتوانێ ژیان وگوزەرانی خەڵك ڕێك بخات، چ جای دوای گۆڕران‌و دەستکارییکرانی‌و بۆ کۆمەڵگاو خەڵکی دیکەش!!

دیارە هۆکارەکەیش هەر ئەوە بوو، کە خوا ﷻ ئینجیلی بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەو پەڵەی جوولەکەکان‌و هێنە نەوە سەرڕاستەهێڵیان، ناردبوو، نەك بۆ ئەوەی بکرێتە بەرنامەیەکی سەربەخۆی ژیان‌و گوزەران، وەك نەصرانییەکان کردیان، لە کاردانەوەی جوولەکەکان‌و چەوساندنەوەیان بۆ عیساو پەیڕەوانیشی!

ئنجا ئەوە هەمووی لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە:

عیسای کوڕی مەریەم‌و شوێنکەوتووەکانی، هەر لە سەرەتاوە کەوتنە بەر پەلامارو ئازارو ئەشکەنجەی ڕۆمانە بتپەرستەکان و، ئەو جوولەکانەش، کە ئیمانیان پێ نەهێنا، بەهەموو شێوەیەك ئاگری ئاژاوەی نێوان ڕۆمان‌و نەصرانییەکان خۆش دەکرد، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە پەیڕەوانی مەسیح ﷺ ناچار بوون، پەنا بەرنەبەر ژیانی ڕەبەنیی‌و لە چیاو چۆڵ‌و ئەشکەوتەکان خەریکی دینداریی خۆیان بن.

ئیدی ئەم حاڵە درێژەی کێشا،هەتا سەرەتای سەدەی چوارەمی زایینی، کە تێیدا (قسطنطين) قەیسەری گەورەی ڕۆم - کە لە (٢٨٠) لە دایك بووەو لە (٣٣٧) مردووە- هاتنە نێو نەصرانییەتی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام پاش ئەوەی چەندان کۆبوونەوە ئەنجام دران‌و، سەرەنجام جۆرێك لە سازش‌و ڕێککەوتن لە نێوان بتپەرستێتی (وثنية) ڕۆم‌و نەصرانییەتی مەسیح ﷺ پێکهات‌و، ڕۆمە بتپەرستەکان دەستبەرداری ئەو ژمارە زۆرەی پەرستراوە (آلهة)کانیان بوون و، لە بەرانبەریشدا نەصرانییەتیش دەستبەرداری یەکتاپەرستیی (توحید) بووو لەسەر سێ پەرستراو (الآلهة الثلاثة) کە: (خواو عیساو جیبریل)ن‌و بە (الأب، الإبن، الروح القدس) واتە: باب، کوڕ، گیانی پیرۆز، ناویان دێنن، ڕێککەوتن! وەك لە:

(الكتاب المقدَّس، العهد الجديد) (إنجيل متَّى) الأصحاح/٢٨، لەژێر ناوونیشانی: (يسوع يظهر لتلاميذه) دا ئەم قسەیە پاڵدراوەتە لای عیسا:

((نِلْتُ كل سُلطانٍ من السَّماء والأرض. فاذهبوا وتَلْمِذوا جميع الأمم وعَمِّدوهم باسم الأب والإبن والروح القُدُس..)) واتە: هەموو دەسەڵاتێكم لە ئاسمان‌و زەویـدا وەرگرتوە، دەبڕۆن‌و تێكڕای ئۆممەتان بكەنە قوتابی و بەناوی: باب‌و كوڕو گیـانی پیرۆزەوە لە ئاویان هەڵكێشن.

بەڵام هیچ گومانی تێدا نیە، كە نە عیسا ﷺ و، نـە هـیچ پێغەمبـەرێكی دیكەش، بێجگە لە خواپەرستیی، خەڵكیان بۆ پەرستنی هیچ شتێكی دیكە بانگ نەكردوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ مَاكَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ .. ﴾ (آل عمران: ٧٩)، واتـە: هیچ كەسێك بۆی نەبووە، كە خوا كتێب‌و حیكمەت‌و پێغەمبەرایەتی پێ ببەخشێ، كەچی بە خەڵكی بڵێ: لەجیاتی خوا ببنە بەندەی من..

(درابەڕ) مێژووزانی ئەمریكایی لە كتێبـی (ئـایین‌و زانیـاری)دا لـەو بـارەوە گوتوویەتی:

((بە كاریگەریی ئەو مونافیقانەی، كە پلەو پایەی گەورەو گرنگیان لە دەوڵەتی ڕۆمییدا بە ئەستۆوە گرتبوون‌و، بە ڕواڵەتیش خۆیان بە نەصـڕانیی پیشـان دەدا، بتپەرستیی‌و شیرك هاتە نێو نەصڕانییەتەوە، هەرچەندە، نە ئەوان‌و، نە ،تەنانەت قوستەنتینیش، هیچ گرنگییان بە ئایین نەدەداو، ڕۆژێك لـە ڕۆژان بـۆی دڵسـۆز نەبوون... بەڵام ئەو ئیمپڕاتۆرەی، كە كۆیلەی دنیا بووو بیروبڕوای ئایینی پێ هیـ نەبوو، لەبەر بەرژەوەندی خۆی‌و بەرژەوەندی دوو حیزبە ناكۆكەكە - نەصـڕانیی‌و بتپەرست - بەچاكی زانی، كۆیـان بكاتـەوەو لێكیـان بـدات، ئنجـا ،تەنانـەت نەصڕانییە مەبدەئییەكانیش، نكوڵییان لەم نەخشەیەی نـەكردو، ڕەنگـە پێیـان وابووبێ، كە ئایینە تازەكە ،ئەگەربێت بە بیروبڕوا دێرینە بتپەرستییەكان متوربە

بکرێ، گەشەدەکاتو ڕۆژێکیشدا، کە ئایینی نەصرانیی سەرەنجام خۆی لە چڵکو چەپەری بتپەرستیی قوتار بکات!))[1].

جا بەو بۆنەیەوە بووە، کە یەکێك لە مێژوونووسان گوتوویەتی:

((نەصرانییەت ویستی ڕۆم بکاتە نەصرانیی، بەڵام خۆی بوو بە ڕۆمیی)) ((أرادت النصرانية أن تُنَصِّرَ الرُّوم، ولكنَّها تروَّمَتْ هي!)).

کەواتە: لە لایەکەوە ئایینی نەصرانیی، لە خودی خۆیدا خاوەنی بەرنامە (شريعة)ێك نەبوو، کە توانای ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانی خەڵکی هەبێ، لە لایەکی دیکەشەوە، عەقیدەکەی لە خوابەیەکگرتن (توحيد الله)و یەکتاپەرستییەوە گۆڕا بۆ شیركو سێ پەرستاوێتی، وەك خوا لە بارەی نەصرانییەکانەوە فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ..﴾ (المائدة: ٧٣)، واتە: بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە! کافر بوون..

کەوابێ: ئایا نەصرانییەت چی بۆ ماوەتەوەو چاری چییە؟!

پیاوانی کڵێسا لە بەردەم ئەو واقیعەدا، کە باسمان کرد، دەستەوئەژنۆ دانەنیشتنو، دوو شتیان کردن:

یەکەم: بۆ چارەسەری کێشەی نەبوونی شەریعەت، هەم پەنایان بردەبەر کەلەپووری ڕۆمانییو ئیغریقیی و، هەم بڕیارەکانی خۆیشیان، کە زادەی عەقڵو هۆشو هەواو ئارەزووی خۆیانو دەسەڵاتدارەکانی دیکە بوون، لە خەڵکی کردە ئایینو یاسا، بۆ ئیقناع کردنی خەڵكو شەرعاندنی ئەو هەڵوێستەشیان، پەنایان بردەبەر چەند قسەیەکی هەڵبەستراوی وەك ئەمە، کە گوایە عیسا عليه السلام بە (بطرس)ی گوتوە: ((أنت صَخْرٌ وعلى هذا الصَّخْر سأَبْني كنيستي. وقوات الموت

[1] (١) بڕوانە: (العلمانيون والإسلام)ی (محمد قطب) ص١٤، کە لێیەوە نەقڵ کردوە.

لَنْ تَقْوى عليها وسأُعطيك مفاتيح ملكوت السَّموات فما تَرْبِطـهُ في الأرض يكـون مربوطاً في السماءِ، وما تَحُلُّه في الأرض يكون مَحْلولاً في السماء))[1].

واتە: (تۆ تاشەبەردی! لەسەر ئـەم تاشـەبەردە، کڵێسـایەکەم بنیـات دەنـێم، هێزەکانی مەرگیش دەرەقەتی نایەن! کلیلەکانی موڵکی ئاسمانـەکانت دەدەمـێ‌و هەرچی تۆ لە زەوی بیبەستیتەوە،لە ئاسمانەکانیش دەبەسترێتەوە، هەرچییەکیش لەسەر زەوی بیکەیەوە، لە ئاسمانەکانیش دەکرێتەوە)!

هەر لەسەر ئەم بنەڕەتە (پاپا نیقـولای یەکـەم) کـاتی خـۆی بەیاننامەیـەکی دەرکرد، کە تێیدا هاتبوو:

((بێگومان کوڕی خوا، کڵێسایەکی بنیات ناوەو پەترۆسی ڕەسـوولی کردۆتـە یەکەمین سەرۆکی، ئەسقەفەکانی ڕۆماش دەستەڵاتەکانی پەترۆسیان بە زنجیرەیەکی بەردەوامی نەپساوە بە میرات گرتوە، هەر بۆیەش پاپا - نوێنـەری خـوا لەسـەر زەوی- پێویسـتە سـەروەریی‌و دەسـتەڵاتی هــەرە بـاڵای بەسـەر تێکـڕای مەسیحییەکاندا هەبێ، چ حوکمڕان بن چ خەڵك‌و میللەت!))[2].

بەڵێ،، بەمجۆرە کڵێساو پاپاو دارودەستەکەی، خۆیان لە خەڵکی کردە سێبەرو نوێنەری خواو، بڕیارەکانی خۆیشیانیان لێ کردنە ئـایین‌و شـەریعەت‌و، ئـەوجۆرە سیستەمەی حوکمڕانییـان داهێنـا، کـە بـە حـوکمڕانیی ئـایینی (تیۆکراسـی) (الثیوقراطیة) ناوبانگی دەرکردوەو، دواتر لەژێر ڕکێفیدا خەڵکی ڕۆژئاوا هـەزارو یەك بەڵاو نەهامەتییان بەسەر هات!

دووەم: بۆ چارەسەری کێشەو قەیرانـەکانی هـەڵقوڵاو لـەو بیروبـڕوا (عقیـدة) داهێنراو (مبتـدع)و، لەگـەڵ عـەقڵ‌و فـیترەت‌و مەنتیقـدا دژو پێچـەوانەیەدا،

(١) بڕوانە: (إنجيل متى) الأصحاح السادس عشر (١٩، ٢٠)، (الكتاب المقدس) العهد الجديد، ص٣٦.

(١) بڕوانە: (قصة الحضارة) ويل ديورانت، ج١٤، ص٣٥٢.

دەمڕاستانی نەصرانییەتو کلێسا، بە سەرۆکایەتی (پاپا) خۆ بە نوێنەرو سێبەری خوا زانەکان، پەنایان بردەبەر گاڵەدانی دەرگای عەقڵو داخستنی دەروازەکانی گفتوگۆو، ،تەنانەت پرسیارکردنیش لەبارەی هەموو باسو بابەتەکانی بواری عەقیدەو، بگرە تێکڕای ئەو شتانەی، کە لە کتێبەکانی تەوراتو ئینجیلەکانو سەرجەم ئەو کتێبو نامانەدا هاتوون، کە بە: پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ (العهد القديم والعهد الجديد) ناسراونو بە هەموویان دەوری دوو هەزار لاپەڕەن!

دیارە حیکمەتی ئەوەش ئاشکرایەو بیروبڕوای هەڵەو ئەفسانەیی، بەهۆی پرسیارو وەڵامو وتو وێژەوە، عەورەتو کەمو کورپییەکانی دەکەونە گۆڕێو کەشف دەبن!

ئنجا هەر لێرەشەوە مەتەڵی پێکهێنانیدادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش)مان بۆ هەڵدێ، بە تایبەت، پاش ئەوەی هەندێك لە ئەورووپییەکان بە ئیسلام ئاشنا بوونو دەستیان کرد بە موتالاَ کردنی کتێبەکانی زانایانی ئیسلام، کە وەرگێڕرابوونە سەر زمانەکانی خۆیانو بەرەبەرە بەرچاویان ڕۆشن بۆوە و، کەوتنە تێبینیو سەرنج خستنەڕووو ڕەخنەگرتن لەبارەی ئایینی نەصرانییو هەڵسو کەوتی پاپاو کلێساو دارو دەستەکەیەوە!

ئاخر پێم نالێی ،ئەگەرلە ڕێی دەرگای بیرکردنەوەو وتو وێژو پرسیار کردنداخستنەوە نەبێ، چۆن چۆنی کلێسای نەصرانییەت دەتوانێ ڕەواییو ڕاستیی ئەم شتانە بسەلمێنێو، خەڵکی قەناعەت پێ بێنێ:

١- بیرۆکەی سێبەرو نوێنەری خوا بوونو حوکمڕانو سەروەری باڵای خەڵك بوونی (پاپا) لە بواری حوکمو سیاسەتدا.

٢- بیرۆکەی پەرستنی عیساو جیبریل (روح القدس)و مەریەمیدایکی، لە بواری عیبادەتدا.

٣- بیرۆکەی سێ خوایی (ثالوث)و سێ پەرستراویی لە بـواری عەقیـدەدا، جـ سەیر ئەوەیە،کەنەصرانییەکان دەڵێن: ئەو سێ خوایە، لە هەمان کاتدا، کە (سیانن) هەر یەکیشن، واتە: هەم سێن و هەم یەکیشن!!

وەك خاوەنی کتێبی: (النصرانية نشأتها التأريخية وأصول عقائدها) د. عرفان عبد الحميد فتاح[1]، کە پاش گێڕانەوەی کێشەو مشتو مـڕی زۆری نێوان نەصرانییەکان لەبارەی عیساوە دەڵێ: سەرەنجام گەیشتنە ئـەوە، کـە بڵێن:

((سەیید مەسیح، دوو سروشتی خوایی و بەشەریی هەن و، یەکتایی خواو سیان بوونی پێکەوەن و، خوا لە خود(جوهر)ی خۆیدا یەکەو لە کەسـەکان و ئوقنوومەکانیدا سێ نە، هەرکام لەو سێیانەش، بێ سەرەتایەو بێ نیازە لـە ـەیری خۆی و، هیـ کام لەو سێیانە پێش ئەوی دیکەیان نەکەوتوە))!!

٤- بیرۆکەی عەشای ڕەببانی (العشاء الربّاني)، کـە دەڵـێ: هەرکەسـێك لـەو کاتـەدا لـەو نـان (خُبْـز)ە بخـوات، ئـەوە گۆشـتی عیسـای خـواردوە، هەرکەسێکیش لەو شەڕابە بخواتەوە، ئەوە خوێنەکەی نۆش کردوە!! -دیارە ئەو (ئێوارە خواردنە) بۆنەیەکی ساڵانەی نەصرانییەکانە[2]-.

٥- بیرۆکـەی لەخاچـدران (صَـلْب)ی (عیسـا) عليه السلام بـۆ سـڕینەوەی گوناهـە مێژووییەکەی (ئادەم) عليه السلام، کە لە درەختە قەدەغەکراوەکـەی بەهەشـتی خـوارد، سـەرجەم ئـەو گوناهانـەی، کـە نەصـرانییەکان، هـەتا قیامـەت دەیانکەن!!

---

(١) ص١٤٧.
(٢) بڕوانە: الكتاب المقدّس: العهد الجديد، (إنجيل متّـى)، الأصحاح (٢٦)، (عَشـاءُ الـربّ)، ص٥٤.

ئاخر بابە ئادەم‌و دایکە حەوامان (سەلامی خوایان لێ بێ)، هەزاران ساڵ بەر لە لەدایك بوونی عیساو دایکی هەڵەیەکیان کردبێ، یان نەصرانییە خۆ بە شوێنکەتووی مەسیح زانەکان، سەدان هەزار ساڵ دوای وی گوناهو خراپە بکەن، چۆن‌و بۆچی، دەبێ عیسا لەسەر ئەوە هەڵبواسرێ‌و ببێتە قۆچی قوربانیی‌و بەلاگێڕەوەو لە گوناهو خراپە پاککردنەوەیان؟!!

٦- بیرۆکەی پسوولەی لێخۆشبوون (صكّ الغفران) بە گوناهباراندان، لە لایەن پاپاو قەشەکانەوە، پاش ئەوەی لە بەردەمیاندادان بە گوناهەکانیاندا دێنن‌و، ئەوانیش چونکە وەکیلی خوان - نەك هەر بۆ دنیا بۆ قیامەتیش!- بڕیاری لێخۆشبوون‌و پاکبوونەوەیان بۆ دەردەکەن‌و، بۆ دڵنیاییشیان پسوولەیەکیان پێدەدەن!!

شایانی باسیشە،کەئەو پسوولەیە بە بەلاش نەبووەو، کاتی خۆی پارەیەکی موفتی لە لایەن فرۆشیارەکانییەوە لە کڕیارە گوناهبارو تۆبەکارەکان، لە بەرانبەردا وەرگیراوە!، هەتا (مارتن لوثر) ڕابەری جوولانەوەی چاکسازیی‌و (پروتستانت) لە دژی وەستایەوەو لە ساڵی (١٥٥١ز)دا لە لایەن (المجمع الكنسي)یەوە هەڵوەشێنرایەوە[1].

٧- بیرۆکەی (کەهانە) کە بابای (کاهن) دەبێتە تکاکار (شفیع)و دەلاڵ لە نێوان خواو بەندەکاندا بەهۆی ئەوەوە، کە لە لایەن پاپاو کڵێساوە دەستی بەسەر داهێنراوەو هێزو دەستەڵاتێکی ڕووحیی پێدراوە!

کە دیارە ئەمەش جۆرێکی دیکەی شیرك‌و پەرستنی غەیری خوایە لە نەصرانییەتدا، هەر بۆیەش کاتی خۆی ئەم مەسەلەیە یەکێك بووە لە هۆکارەکانی تێکگیرانی جوولەکەو نەصرانییەکان، چونکە جوولەکەکان ئەو

---

(١) بڕوانە: (النصرانية: نشأتها التأريخية وأصول عقائدها) د. عرفان عبد الحميد فتاح، ط٢ ٢٠٠٥، (سرّ التوبة والإعتراف بالذنوب وغفران الخطايا) ص٢٢٥-٢٢٧.

**مەسـەلەیان بـە پێچـەوانەی خوابەیـەکگرتن (توحیـد) دانـاوە، بێگومـان هەرواشە!**[1]

**هەروەها چەندان بیرۆکەو شتی دیکەی ئەفسانەیی دژ بە عەقڵو زانستو واقیع؟!!**

**جا خوێنەری بەڕێز!**

**لێرەدا کۆتایی بە بەسەرهاتو سەرگوزەشـتەی سـەرهەڵدانی سـیکۆلاریزم لـە ڕۆژئاوا دێنین، خوایاربێ لـە باسـیداهاتوومان‌دا تیشـك دەخەینـە سـەر بابـەتی: هۆکارەکانی ڕوو وەرگێڕانی خەڵکی ڕۆژئاوا لە کڵێساو ڕوو وەرچەرخاندنیان بەرەو سیکۆلاریزم.**




(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، سەرباسی (رسامة الكهنة Holy Orders) ص٢٢٨، کە یەکێکە لە باسەکانی: (الفصل الثامن: الأسرار السّبعة في المسيحية).

# هۆكارەكانی ڕوو وەرگێڕانی خەڵكی ڕۆژئاوا
# له كلێساو ڕوو وەرچەرخاندنیان بەرەو سیكۆلاریزم

خوێنەری بەڕێز!

دوای ئەوەی لــە باســی پێشــوومانداا، تیشــكمان خستەســەر سەرگوزەشــتەی چۆنیەتی پەیدابوونی ڕێچكەی عەلمانییەت، له وڵاتانی ڕۆژئاوادا، جێ لێژكردنی بە ئایینی نەصرانییو كلێساو دامو دەزگایەكانی لە نێو كۆمەڵگادا، بە پێویستی دەزانم، ئەمجارە تیشك بخەینە سەر هۆكارە سەرەكییەكانی سـەرهەڵدانی دیـاردەی (بێدینایەتیی)و بوونی بە جێدار (بدیل)ی ئایینی نەصرانیی له ڕۆژئاوا.

دیارە ئەو هۆكارانەش زۆرو جۆراوجۆرن، بەڵام ئێمە هەوڵـدەدەین لـە حـەوت خاڵاندا بە كورتی، سەرەكییەكانیان بخەینەڕوو:

### ١- هۆكاری فیكریی:

ئەمیش پێویستە دابەشی بكەین بۆ چەند بڕگەیەك:

١- لەیەك دابڕینی دینو ژین:

بەڵێ،، هەر لە سەرەتاوە - پاش عیسا ﷺ، ئایینی نەصرانیی لە زۆربەی بوارو لایەنەكانی ژیانو گوزەرانی كۆمەڵگا دابراو بووە، چونكە هەر لە خودی خۆیدا، ئەوەی لە باردا نەبووە، بە تایبەت دوای ئـەوەی دەسـتكاریی كـراوەو گۆڕراوە، كە وەك سیستەمێكی هەمەلایەنەو گشتگیر، كۆمەڵگا وەبەرخۆی بگرێو (إستیعاب)ی بكات!

بەڵگەش لەو بارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

لە هەرکام لە ئینجیلەکانی: (متَّی/٢٢)و (مَرْقُس/١٢)و (لوقـا/٢٠)دا ئـەو قسەیە پاڵدراوەتە لای عیسا ، لە کاتێکدا،کـە جوولەکـەکان لـە بـارەی سەرانەوە لێی دەپرسن: ئایا دروستە بە قەیصەری ڕۆمی بدەن؟! گوتوویەتی: (إدفعوا إذاً ما للقيصر للقيصر، وإلى الله ما لله)، واتە: کەواتە ئەوەی هی قەیسەرە بیدەنە قەیسەرو، ئەوەی هی خواشە بیدەنە خوا.

دیارە ئەمەش هەمان شتە، کە دواتر ڕێچکەی سیکۆلاریزم تەبەنی کـردو عیبادەتو سیاسەت، یان ڕاستتر بڵێین: دینو ژینی لەیەك دابڕین.

٢- بە زۆر خەڵك کردنە نەصرانیی:

دیارە زۆرو فشار بەکارهێنانی کڵێساو پیاوەکـانی، بـۆ سـەپاندنی ئایینـە شێوێنراوەکەیان بەسەر خەڵکدا، کاتی خۆی دیاردەیەکی زەقو بەربڵاو بـووەو، چەندان جار بۆتە مایەی شەڕو کوشتاری بێڕەزای وا، کە هەزاران کەسـی تێـدا چووە، واش پێدەچێ پاپاو قەشەکان، قسەیەکی بە زمانی عیساوە هەڵبەستراوی وەك ئەم دەقەی خوارەوەیان کردبێتە بەڵگەی شەرعییو قانوونیی ڕەفتارەکەیان:

((فأجابه السيِّد: أُخرج إلى الطرقات والدروب وأَلْـزِم النـاس بالـدخول حتـى يمتلىء بيتي))[1]، واتە: سەیید (مەسـیح) وەڵامیدایـەوە: بچـۆ بـەڕێو بـانو کۆڵاناندا بگەڕێو بە تۆبزیی خەڵکی بێنە ژوورێ، هەتا ماڵەکەم پڕ دەبێ!

بۆیەش گوتم واپێدەچێ قسەیەکی ئاوا پاسـاوو بیـانووی ئـەو هەڵوێسـتو ڕەفتارەی کڵێسا بووبێ، چونکە (غي هارشير Guy Haarscher) خاوەنی کتێبی (العلمانية La Laicite) ئەو قسەیەی بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر ئەو ڕەفتارەی کڵێسا[2].

---

(١) بڕوانە: الكتاب المقدس، العهد الجديد (إنجيل لوقا/١٤).

(٢) بڕوانە: ص١٩،ط١/٢٠٠٥.

٣- گۆڕینی خوابەیەکگرتن (التوحيد)، کە خاڵی هاوبەشی هەموو پێغەمبەرانە بە شیركو سێ پەرستراوێتی: (باب‌و کوڕو گیـانی پـیرۆز) وەك پێشـتریش باسمـان کردو، دەقی ئەو قسەیە، کە لەو بارەوە پاڵدراوەتە لای عیسا هێنامانەوە، کە لە (إنجيل متَّى/٢٨) دا هـاتوەو (الأب، الإبـن، الـروح القـدس)، هەرسـێکیان پێکەوە وەك یەك کراون بە سەرچاوەی پیرۆزی بەخشین‌و شایستەی پەرستران.

٤- داهێنانی کۆمەڵێك بیرۆکەو ڕەفتاری ئەفسانەییو پووچ: کـە پێشـتر باسمـ ن کردن،کە هیچ عـەقڵێك بۆی هەزم ناکرێن، مـەگەر بڕیاریدابێ بیر لە هیچ شتێك نەکاتەوەو، وەك سەبەتە هەرچی تێبکەن وەری بگرێ![1].

٥- تەبەننی کرانی تێڕوانینی( ئەڕستۆ) بۆ خوا، لە لایەن کلێساوە:

تێڕوانینی (ئەڕستۆ)ش بۆ خوا ﷻ بە کورتی ئەوەیە،کـەخوا پـاش ئـەوەی بوونەوەری دروست کردوە، وەك سـەعـاتێك کە قوڕمیشی دەکـەیو خـۆی کـار دەکات، ئاوا خستوویەتە گـەڕو وازی لێهێنـاوەو، بۆخـۆی کاردەکـاتو هـیـ پێویستی بە سەرپەرشتی کردنی خواﷻ نیە![2].

دیارە ئەم جۆرە تێڕوانینەش بۆ خوا، بۆ جۆری پەیوەندی لەگەڵ بوونـەوەرو مرۆڤـدا، باشترین بیانووی عـەلمانییەتە، کە بڵـێ: پێویسـتـە مرۆڤــ بۆخـۆی بەرنامەی ژیانی خۆیدابنێ!

بەڵام خوای پەروەردگار لە دوایین کتێبی خۆیو تاکە فەرمایشتی سەلامەت ماوو دەستکاریی نەکراوی خۆی (قورئان)دا، لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴾ (المؤمنون: ١٧)، واتە: حەوت

(١) بڕوانە: (النصرانية: نشأتها التأريخية وأصول عقائدها) الفصل الثامن، (الأسرار السَّبعة في المسيحية) ص٢١١-٢٣٣.

(٢) بڕوانـە: (موسـوعة الفلسـفة) مـادة: أرسـطوطاليس، ص١٠٤-١٠٦، ط ١٩٨٤، د. عبدالرحمن بدوي.

ئاسمانمان لە سەرووتانەوە دروست كردوون و، ئێمە لە دروستكراوی خۆمان بــێ ئاگا نین!

٦- تەبەننی كرانو بە بەشێك لە ئایین دانرانی زۆرێك لــە كەلــەپوورو فەلســەفەو كلتووری ئیغریقو ڕۆمان، بۆ پڕكردنەوەی بۆشاییيە زۆرەكانی ئایینی نەصڕانیی گۆڕراو:

هەڵبەتە هەر شتێكیش زادەو بەرهەمی فیكرو هۆشی بەشەربێ، هەرچــۆن بێ هەڵەوكەمو كوڕیی تێدەكەوێ، جا لە ســۆنگەی ئــەوەوە، كــە كلێســا ئــەو شتانەی كردبوون بە بەشێك لە ئایینی نەصڕانیی، هەڵەو ناڕاست دەرچوونیان، كرا بە بەڵگەی هەڵەو ناڕاستیی ئایینەكەو پەندی (بووكمان گەلێك جوان بوو، بالووكەشی لە لێوێ هات!)ی بەسەردا چەسپا و، خەڵكەكە نەك هەر لە كلێساو پاپاو قەشەكان، بگرە هەر لە خودی عیساو ئایینەكەیشی كەوتنە دوودڵیــیو گومانەوەو، بگرە هەندێكیان سەریان كێشا بۆ زەندەقەو ئیلحادیش!

## ٢- هۆكاری زانیاریی:

هۆكــارێكی دیكــەی ســڵەمینەوەی خــەڵكی ڕۆژئــاوا لــە نەصــڕانییەتو كلێسایەكەیو ڕووكردنە عەلمانییەت، ئەوە بوو، كە كلێسا كۆســپو لەمپــەرێكی گەورە بوو، لە بەردەم گەشەكردنو بەرەوپێش چوونی زانستداو، پاپــاو قەشــەكان دژایەتییەكی سەرسەختانەی هەر بیروبۆچوونێكی تازەیان دەكرد، كە لەگەڵ كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدّس)دا بە هەردووك بەشی كۆنو نوێیەوە، تێك دەگیرا!

جا لە سۆنگەی ئەوەوە، كە لە لایەكــەوە كلێســا بــۆ پڕكردنــەوەی بۆشــاییيە فیكریيو سیاسییو یاساییيەكانی خۆی، بەشــێكی زۆری كەلــەپوورو فەلســەفەی یۆنانی بە گشتییو (ئەرِستۆ)ی بە تایبەتی تێكەڵ بە ئایین كردبــوو، لــە لایــەكی دیكەشەوە پاپاو دارو دەستەكەی لەسەر بنەمای خۆ بە سێبەرو وەكیلی خوا زانین، قسەو بۆچوونەكانی خۆیانیان لە خەڵكی كردبوو بە ئایینو شتێكی پیرۆز (مقدَّس)و

دوور لە هەڵە! بۆیە تێکگیرانی ئەو جۆرە ئایینەو عەقڵی ساغو زانستی ڕاست، لە زۆر حاڵاندا شتێکی مسۆگەر بوو.

هەر بۆیەش هەر لەو کاتەوە، کە (کوپرنیکوس-١٤٧٣-١٥٤٣) باسی ئەوەی کرد، کە زەوی چەقی بوونەوەر (مرکز العالم) نیەو جووڵەی هەیە، تێکڕای ئەو زاناو شارەزایانەی، کە پشتگیریی قسەکانی ئەویان دەکرد، یان قسەو بۆچوونێکی لەو جۆرەیان هەبوو، کەمو زۆر کەوتنە بەر پەلاماری کڵێساو پیاوەکانییەو، سەرەنجام (برۆنۆ) بە زیندوویی سووتێنرا و، (ڕۆجەر بیکۆن) پازدە ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوەو (گالیلۆ)ش بە پەلەپرووزە فریای تۆبەو پەشێمانیو دەستی پاپا ماچکردن کەوتو خۆی قوتار کرد، لەسەر ئەوە، کە گوتبووی: زەوی خڕەو دەخولێتەوەش!

دیارە هەمیشەش، خەڵکی عاقڵ، لە هەرکەسێك بێزار دەبن، کە پشتگیریی نەزانییو ئەفسانە بکاتو دژی زانیارییو زانست بێت.

## ٣- هۆکاری شارستانیی و بەرەوپێشچوونی ژیان:

هۆکارێکی دیکەی بێزرانی کڵێساو ئایینە شێوێنراوەکەی لە بەرچاوی خەڵكو، ڕووکردنە بێدینییان لە ڕۆژئاوا، ئەوە بوو، کە پیاوانی کڵێسا، کە بە چینی ئەکلیرۆس (طبقة الأكليروس) ناسرابوون، بە هۆی ئەو پاشکەوتنو جموودە فیکرییەوە، کە گیرۆدەی بوو بوونو، ئەو هەستیاریی (حسياسية)ە ،کە لە بەرانبەر هەموو شتێکی تازەدا بۆیان دروست بوو بوو، بەربەستێکی مەحکەمیان لە خۆیان دروست کردبوو، لە بەردەم گەشەکردنی ژیانو بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگادا، لە هەر لایەنێکەوە بوایە: فیکریی، زانستیی، ئابووریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی...هتد، بۆیە سەرەنجام خەڵکەکە ناچار بوون، بۆ ئەوەی ژیانو گوزەرانی خۆیان بەرەوپێش بەرنو، خۆیان لەو قەیرانو کێشە گورچك بڕانە دەرباز بکەن، کە خەریك بوو فززەیان لێ ببڕن، لەو کڵێساو ئایینە هەڵگەڕێنەوە، کە توند توند گرتوونیو دەیەوێ بەرەو دوایان بگێڕێتەوە! لەو بارەوە دەتوانی سەرنجی کتێبی: (حكمة الغرب)ی (برتراند راسل) بدەی، ج٢، ص١٧و ٤٠و ٤٥و ٥١،

ترجمة: د. فؤاد زكريا، کە بـاش تیشـکی خستۆتەسـەر جووڵانـەوەی چاکسـازیی ئایینیی‌و فەلسەفیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و تەکاندانی زانسـت‌و ئـەدەب لـە لایەکەوەو، بوونە کۆسپ‌و لەمپەری کڵێساش لەڕێی ئـەو کـاروانی گۆڕانکـاریی‌و بەرەوپێشچوونەدا لە لایەکی دیکەوەو، سەرەنجامیش تێشکان‌و هەرەسهێنانی!

بەڵێ، هەرکەسێك بیەوێ ڕەوڕەوەی قەتاری مێـژووو بەرەوپێشچـوونی ژیـان، ڕاگرێ، بۆی ڕاناگیرێ‌و، خۆیشی دووچاری شێلران‌و پلیشانەوە دەکات!

## ٤- هۆکاری سیاســیی:

هەروەها هۆکاری سیاسییش، دەورێکی کاریگـەری هـەبوو لـە پەرەسـتاندنی دیاردەی بەرەو عەلمانییەت چوون‌و لە کڵێسا دوورکەوتنەوەی خەڵکیـدا، ئـەویش دوای ئەوەی، کە کڵێسـا لە کەوڵی خۆی دەرچووو، بیردۆزەی دوو شمشێر ( Theory of the Two Swords)ی گۆڕی، بۆ بیردۆزەی یـەك شمشـێر ( Theory of the One Sword) مـەبەستیش لە بیردۆزەی دوو شمشێر، ئەوەیە،کەکۆمەڵگا دوو دەسـەڵاتی ئایینی‌و مەدەنیی بەڕێوەی دەبەن و، بیردۆزەی یەك شمشێریش ئەوەیە،کەیەك لایەن - کە پاپایە- هەردوو دەسەڵاتەکە بەدەستەوە بگـرێ‌و ئیمپراتـۆرو پادشـایەکان، هەتا مۆڵەتی پاپا وەرنەگرن، مافی حوکمڕانییان نەبێ!

شایانی باسی ئەم جۆرە سیسـتەمەش لـە مێـژووی سیاسـیی ئـەوروپادا، بـە بیردۆزەی مافی خوایی بۆ پادشایەکان: (Divine Right of The Kings) ناسراوە[1].

ئاشکراشە، کە حاڵ‌و باڵی خەڵکی، بەدەست سیستەمێکی تاکڕەوانەی خۆ بـە سێبەرو وەکیلی خوا زانی، بێ بەرنامە (شريعة)وە، چۆن دەبێ!

هەڵبەتە ئەم سیستەمەش هەمان ئەو سیستەمەیە، کـە بـە حـوکمی ئـایینی (تیۆکراسی) ناسراوەو، هەندێك کەس پێیان وایە حوکمی ئیسلامییش، هەر هەمان شتە! بەڵام نێوانیان ئاسمان‌و ڕێسمانە، وەك لە باسەکانیداهاتوودا دەیخەینەڕوو.

---

(١) بڕوانە: (موسوعة العلوم السياسة) ج١، مادة: (حق الحكم الألهي).

### ٥- هۆکاری ئابووریی:

ئەمیش لەو بارەوە، کە باسمانکرد، ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا، چونکە ڕۆژگارێك وای لێهاتبوو، کە پاپاو قەشەکان پاش قۆرخ کردنی دەسەڵاتی سیاسییو ڕووحیی، بوو بوونە خاوەنی موڵكوماڵو زەویو زارێکی زۆرو، سەربارەش باجو خەراجی زۆریان لەسەر خەڵکدانابوو، لەوەش زیاتر سۆخرەو بێگارێکی لە ڕاددە بەدەریشیان پێ دەکردن، هەرکەسێکیش لاملیی کردبایە، وێڕای سزاو ئازاری سەخت، مۆری لە خواو ئایینو کڵێسا هەڵگەڕانەوەیشی بە نێوچاوانەوە دەنرا!

(درابەر) لە کتێبی (زانیارییو ئایین)دا، لەو بارەوە قسەی ڕاهیبێك بە ناوی (جرۆم) دێنێتەوە، کە گووتوویەتی:

((ژیانو گوزەرانو نازو نیعمەتی قەشەکان بە جۆرێك بوو، کە هی حوکمڕانو دەوڵەمەندەکان لە چاو هی ئەوان، هەر هیچ نەبوو، پاپایەکان زۆر خراپ ڕەوشتیی ن نزم بوو بوو، تەماعو خۆشەویستی سامان، تەواو دڵیداگیر کردبوون و، تێکڕای سامانو داهاتی فەڕەنسا، بەشی مەسرەفی پاپایەکانو تێرکردنی ئارەزووەکانیانی نەدەکرد)).

ئنجا وەك گوتراویشە: (برسیەتی، ڕەگی هاری پێوەیە)و، هەرکەسێك چاوی لەوە بێ، کە لەسەر حیسابی بژێوی خەڵك عەیشو نۆش بکات، دەبێ بزانێ ڕۆژێك دێ ئەو ڕابواردنەی لێ دەکەنە ژارەمار!

### ٦- هۆکاری شەڕو کوشتاری نێوخۆ بەهۆی دەمارگیریی و بوونی یەکدی قبووڵ نەکردنەوە:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی کاریگەر بوو، بۆ لە ئایینی نەصڕانیی سڵەمینەوەی خەڵکی ڕۆژئاواو، ڕوو لە عەلمانییەت کردنیان، چونکە بۆ ماوەی زیاتر لە دووسەد ساڵ شەڕو کوشتاری زۆر لە نێوان (کاثولیك)و (پرۆتستانت)دا ڕوویدا، کە ڕووباری خوێنیان لە بەین هەستاو ملیۆنان کەس کوژران، ئەمە لە لایەکەوەو، لە لایەکی

دیکەشەوە، نەصرانییەکان بە گشتیی جوولەکەکانیان چەوساندەوەو بەلای زۆریان بەسەر هێنان، ئیدی سەرەنجام ئەو هەموو شەڕو کوشـتارە تایەفییــە نێوخۆیــەی وڵاتانی ڕۆژئاوا، خەڵکەکەی بە گشتیی بێزار کردو ئاییني لە بەرچاو بێزراندن[1].

**٧- هۆکاری کۆمــەڵایەتیــی:**

ئەمیش کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە ڕەواج پێـدانی ڕێچـکەی دنیاگـەرایی (Secularism)و دوورکەوتنەوەی خەڵکی ڕۆژئاوا لە کڵێساو ئایینە شێوێنراوەکەی، چونکە لە لایەکەوە پاپـاو قەشـەکان خـەڵکیان هـان دەدا بـۆ ژیـانی ڕەبـەنیی و گۆشەنشینی و، لەو لاشەوە وێڕای زێدەڕۆیی، هەندێکیان لە ڕەبەنایەتییەکەیاندا، زۆربەیان خلیسکانە نێو زەلکاوی زیناو خراپـەکاریی و ئارەزووبـازیی، هــەتا وای لێهات، کە پیاوو ئافرەتە ڕاهیبەکان بە چاوی سووك، یـان لانــی کـەم تۆمــەت و گومان سەیر دەکران!

خوای بەرزو پاك لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿..وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ (الحديد: ٢٧).

واتــە: ڕەهبانییەتێکیانــداهێنا، کــە لەســەرمان پێویســت نــەکردبوون، بــە مەبەستیداواکردنی ڕەزامەندیی خوا، بەڵام هەقی خۆیانیان پێ نەدا، جا ئەوانەیان، کە ئیمانیان هێنابوو پاداشتمان دانەوەو، زۆرێکیشیان لاڕێ بوون.

دیــارە ئــەو ڕەبەنایــەتیی و خێــزان پێکەوەنەنانــەش، لــە زۆر شــوێنی چــوار ئینجیلەکانو نامەکانی (بۆڵس)یشدا خەڵکی بۆ هاندراوە، بۆ نموونە: لــە (إنجيــل متَّى/١٩)دا گوایە عیسا عليه السلام گوتوویــەتی:(ففــي النــاس مَــنْ ولـدتهم أمّهـاتهم عـاجزين من الزواج وفيهم من جعلهم الناس هكذا، وفيهم من لا يتزوجون من أجل ملكوت السموات. فمن قدر أن يقبل فليقبل).

---

(١) بڕوانە: (العلمانية: النشأة والأثر في الشرق والغرب) زكريا فايد، ص٨٢، ط١، ١٩٨٨.

واتە: کەسانێك هەن، کە هەر زگماك توانای هاوسەرگیرییان نیە، هەشیە نە خەڵك وایان لێکردوون (واتە خەساندوویانن) هەشیانە لەبەر گەیشتن بە مولکی ئاسمانەکان (واتە بەهەشت) ژن ناهێنن، جا کێ دەتوانێ ئەمە جێ بەجێ بکات، با وەری بگرێ.

ئاشکراشە، کە هەم ڕەبەنیی‌و گۆشەگیریی، پێچەوانەی فیترەتەو خەڵك بۆی تەحەمول ناکرێ و، هەم بە ناوی ڕەبەنیی‌و گۆشەگیرییەوە ئارەزووبازیی کردن، شتێکی قێزەون‌و قبووڵ نەکراوە، بۆیە ئەم مەسەلەیەش بە هەردوو دیوەکەیدا کاریگەریی خۆی نواند.

ئنجا نەك هەر کڵێساو ئایینەکەی ڕەواجیان بە ڕەبەنایەتیی‌و گۆشەگیریی دەدا، بەڵکو هەمیشە داکۆکییان لەسەر ئەوەش دەکرد، کە جەستە (جسد)ی مرۆڤ شتێکی خراپ‌و قێزەونەو، چاوگی خراپەو گوناهو لادانە، بۆ نموونە: با گوێ بۆ ئەم قسانەی (بوڵس) بگرین، کە لە ژێر ناوونیشانی: (الروح والجسد)دا ئاڕاستەی کڵێساکانی (غلاطیة)ی کردوون.

((..فما یشتهیه الجسد یناقض الروح وما یشتهیه الروح یناقض الجسد، کل منهما یقاوم الآخر لئلاّ تَعْمَلوا ما تریدون، فإذا کان الروح یقودکم فما أنتم في حکم الشریعة. وأما أعمال الجسد فهي ظاهرة: الزنی والدَّعارة والفجور وعبادة الأوثان والسِّحر والعداوة والشقاق والغیرة والغضب والدسّ والخصام والتحزّب والسُّکر والعربدة وما أشبه...))[1].

واتە: جا ئەوەی جەستە حەزی لێیە، پێچەوانەی ڕووحە، ئەوەی ڕووح حەزی لێیە پێچەوانەی جەستەیە، هەرکامێکیان دژایەتی ئەوی دیکە دەکات، تاکو ئەوەی، کەدەتانەوێ نەیکەن، جا ،ئەگەر ڕووح ڕێنماییتان بکات، ئەوە لەژێر ڕکێفی شەریعەتدا نین، کردەوەکانی جەستەش ئاشکران: زیناو بێناموسیی‌و

(١) بڕوانە: الکتاب المقدس، العهد الجدید، (رسالة القدِّیس بولس الرسول إلی کنائس غلاطیة) الأصحاح/٥، ص٣٠١.

خراپەکاریی‌و بتپەرستیی‌و جادوو و دوژمنایەتیی‌و دووبەرەکیی‌و غەیرەو توڕەیی‌و فیڵ‌و تەڵەکەو ناکۆکیی‌و تاقم تاقمێنەو سەرخۆشیی‌و شەللاتی گـەریی‌و وێنـەی ئەمانە..

جا خوێنەری بەڕێز!

عەرەب گوتەنی: (إذا ظهر السَّبب، بطل العجبُ) ئێستا پـاش خستنەڕووی گۆشەیەك لە سەرگوزەشتەی سیکۆلاریزم لـە ڕۆژئـاواو، هۆکـارە سـەرەکییەکانی سەرهەڵدانی، بۆمان دەرکەوت،کە واز لە ئایینی نەصرانیی هێنانی زۆربەی خەڵکی ڕۆژئاواو وەرسووڕانیان بەرەو سیکۆلاریزم، بە لەبەرچاوگرتنی واقیع‌و هەل‌و مەرجی ئەوسایان، هەتا ڕاددەیەك شتێکی مەنتیقی‌و چاوەڕوانکراو بووە.

ئاخر چۆن خەڵکی لە ئایینێك ڕانەکەن‌و بێزار نەبن، کە:

أ- عـەقڵی عـەقڵمەندان‌و بیروهۆشی بیرمـەندانی کۆت‌و زنجیرکردوەو، بۆ ئەوەی عـەوڕەت‌و عـەیب‌و عـاری بیرۆکە داهێنراوو پووچەکان‌و، ڕەفتارو هەڵوێسـتە سست‌و بـێ بڕسـتەکانی دەرنەکـەوێ، ڕێـی بیرکردنـەوەو ڕامـان‌و داهێنـان (إبداع)ی لێگرتوون؟!

ب- ژیان‌و کۆمـەڵگای، گیرۆدەی حاڵەتێکی جموودو دۆگمایی کردوەو، دەست‌و پێیداهێنەرانی بە زنجیری لاساییکردنەوەی کوێرانە بەستوەو، ڕێی هەر جۆرە جم‌و جۆڵ‌و نوێخوازیی‌و بەرەوپێشچوونێکی لێ بەستوون‌و، وەك کـەوی نێـو قەفەزی لێکردوون؟!

جـ- لەگەڵ پادشاو حوکمڕانە ستەمکارەکان‌و دەوڵەمەندە ساماندارو دەرەبەگ (أقطاع)ە خاوەن زەوی‌و زارەکاندا، پـەیمانی بەسـتوەو دژی خـەڵکی ڕووت‌و ڕەجاڵ‌و نەدار، بەناوی خواو دین‌و کڵێساو مەسیحەوە جەنگێکی بێ ئامانی بەرپا کردوە؟!

د- دڵ‌و دەروونی خەڵکی، بە ناوی کەهەنوتەوە لێیـان زەوت کـردوەو، ڕێـی ئەوەی لێگرتوون، کە خۆیان ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوای پەروەردگاریاندا گفت‌و

گۆو ڕازو نیاز بکەن‌و، پاپاو قەشەکانی خۆیان کردۆتە دەڵاڵ‌و واستە لە نێوان خواو بەندەکانیداو، وێڕای مـوڵکی زەمـین، مەلـەکووتی ئاسمـان (ملكوت السّماء)یشیاندا گیرو قۆرخ کردوە؟!

هـ- بەبێ هیچ بەڵگەو پاساوێك، (پاپا)یەکەی خۆی کردوە بە سێبەرو وەکیلی خواو، دەسەڵاتی هـەرەباڵای خـەڵك‌و سەرچـاوەی شـەرعییەتی دەسـەڵات‌و حوکمڕانیی پادشاو حوکمڕانەکان؟!

و- سەرەڕای ئەوەی،کە بە داهێنانی بیرۆکەی سێ خوایی (ثالوث)، هەرکام لە (عیسـا) عليه السلام و جیبریـل (روح القدس)یشـی کردوونـە هاوبەشـی خـوا لـە پەرستندا، لە گوناهو تاوان خۆشبوون‌و بردنـە بەهەشـت‌و لـە دۆزەخ قوتـار کردن، یان لە ڕەحمـەتی خـوا دوورخسـتەوەو دەرکـردن (الإبعـاد والطّـرد)ی بەندەکانیشی، بۆ پاپاو قەشەکان قۆرخ کردوە؟!

بە کورتی‌و بە کوردی:

چۆن خەڵکی لە ئایینێك بێزار نەبن‌و ڕانەکەن، کە:

لەگەڵ نەزانیی (جهل) دابێ و، دژی زانست بێت!

لەگەڵ پاشکەوتن (تخلّف)دابێ‌و،دژی پێشکەوتن (تقدّم) بێت!

لەگەڵ ستەم‌و زۆر دابێ‌و پشتی حوکمڕان‌و سـامانداران بگـرێ، لـە بەرانبـەر نەدارو چەوساواندا!

لەگەڵ داخستنی دەرگای عـەقڵ‌و بیرکردنەوە دابێ و، دژی لێکۆڵینەوەو پرسیار کردن‌و وردبوونەوە بێ!

لەگەڵ ڕەبەنایەتیی‌و گۆشەنشینی و دژایەتی کردنی جەستەدابێ و، پێی وابـێ خوا جل جلاله حەز ناکات بەندەکانی لە نازو نیعمەتەکانی ژیانی دونیا - لە سـنووری شەرعدا- بەهرەمـەند بن!

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز!

سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوەی خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا لە ئایینی نەصرانیی، نەك هەر شتێکی سەیروجێی پرسیار نەبوو، بەڵکو زۆر شتێکی سروشتیی‌و چاوەڕوانکراو بوو، لەڕاستیدا سەیرو سەرسووڕهێنەر ئەوەبوو، کە بۆچی ئەو خەڵکە هێندە بە درەنگەوە ئەو هەڵوێستەیان نواند!

بەڵام گرنگ ئەوەیە لێرەدا ڕاستییەکی گرنگ هەیە لێی بێ ئاگا نەبین بۆ ئەوەی لە حوکمدانمان بەسەر بەرنامەو پەیامی عیسای مەسیح دا عليه السلام بە هەڵەدا نەچین و تووشی ستەم‌و بێ ویژدانیی نەبین، ئەویش ئەوەیە کە:

ئەوەی خەڵکی ڕۆژئاوا لێی بێزار بوون‌و لە دژی ڕاپەڕین، ئەو بەرنامەو پەیامە ڕاست‌و دروستە خواییە نەبوو، کە عیسا عليه السلام هێنابووی، بەڵکو - وەك پێشتر باسمان کرد- زۆربەی هەرەزۆری ئەو ئایینە دروستکراوو داتاشراوی پاپاو قەشەکان‌و دەمڕاستانی کڵێسا بوو، بە تایبەت (بۆڵس)، کە زۆرێك لە مێژووزانان بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئایینی نەصرانیی لە قەڵەمی دەدەن، بۆ وێنە:

(ڕینان) فەیلەسووفی ناوداری فەڕەنسی لەو بارەوە گوتوویەتی:

((بێگومان پێویستە بۆ ناسینی پەیامی ڕاستەقینەی یەسووعی مەسیح، وەك خۆی تێیگەیشتوە بگەڕێینەوە بۆ ئەو لێکدانەوەو ڕاڤە دڕۆینانەی، کە ڕووی گەشی پەیامی مەسیحیان شێواندوەو، لەژێر چینێکی چڕی تاریکیدا پەنهانیان کردوە، جا ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری (بۆڵس)، کە لە پەیامی مەسیح حاڵی نەبوو بوو، بەڵکو بە شێوەیەکی دیکە تەئویلی کرد، پاشان لەگەڵ زۆرێك لە نەریتی فەڕەنسییەکان‌و ڕێنماییەکانی پەیمانی کۆن تێکەڵی کرد، بۆڵس وەك ئاشکرایە خۆی بە ڕەوانەکراو بۆ لای ئۆممەتان دەزانی، یانی نوێنەری مشت‌ومڕو ناکۆکییە ئایینییەکان بوو، زیاتر مەیلی بەلای شتی ڕواڵەتییدا دەچوو، وەك خەتەنە کردن‌و ئەو شتانە، ئیدی ئەو ئارەزوانەی خۆی ڕەگەڵ ئایینی مەسیحی خستن‌و تێکیدا.

لە ڕۆژگاری (بۆڵس)ەوە ئەو (تەلموود)ە، کە بە (ڕێنماییەکانی کڵێساکان) ناسراوە دەرکەوت، بەڵام پەیامی ڕاستەقینەی مەسیح، ئەوە لەڕاستیدا مۆرکی تێرو تەواوی خوایەتی لە دەستدا... لە ڕاستیدا ئەو توێژەرەوەو ڕاڤەکەرانەی، کە مەسیح بە پەرستراو (إلـه) دەزانن، هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە، هەرچەندە بۆ پشتڕاستکردنەوەی دەعوایەکەیان، چەند قسەیەك بە بەڵگە دێننەوە، کە لە پێنج سیفر (سِفْر) دا هاتوون، بەڵام ئەو قسانە کەمترین دەلالەت لەسەر ئەوە ناکەن، کە مەسیح خوایە!))[1].

ئنجا سەربارەی دەست تێوەردانی سەرەتایی (بۆڵس)و شێواندنی پەیامو بەرنامەی مەسیح ﷺ بەهۆی تێنەگەیشتنەوە، وەك (ڕینان) گوتوویەتی، یان بە ئانقەست! بەڵێ، سەربارەی ئەوەش هەر لە سەرەتای مێژووی ئایینی مەسیحییەوە، عادەتی سەرکردە ڕووحییەکانی نەصرانیی (قەشەو ئەسقەفو بەتریقو کاردینالەکان)وابووە، کە بەین بەین کۆبوونەوە بکەن بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەو پەڵەکانو، چارەسەری کێشەو گرفتە عەقیدەییو فیکرییەکان، جا لە نێوان سەدەی چوارەمو هەشتەمدا، دەمڕاستانی نەصرانییەت حەوت کۆبوونەوەی جیهانییان بەستوون، کە پێیان گوتراوە: (The seven Authoritative Councils) ئەمەش ناوی چوار لەو حەوت کۆنگرە جیهانییەیە لەگەڵ کاتی بەسترانیاندا:

١- کۆبوونەوەی نیقیە/٣٢٥ ز.

٢- کۆبوونەوەی قوستەنتنییەی یەکەم/٣٨١ ز.

٣- کۆبوونەوەی ئەفسوس/٤٣١ ز.

٤- کۆبوونەوەی خەلقدوونیە/ ٤٥١ ز.

جا ئەوەی پێویستە لێرەدا بگوترێ ئەوەیە،کەهەرکام لەو کۆبوونەوانە، پادشاو ئیمپراتۆرەکان، کەمو زۆر دەوریان تێدا بینیونو ئەو بیروبڕوایەی، کە بە لایانەوە پەسند بووە، بە زۆری زۆرداریی بەسەر خەڵکی ئامادەبووی کۆبوونەوەکانیاندا

---

(١) بڕوانە: (محاضرات في النصرانية) للشيخ محمد أبو زهرة، ص٢١٥.

سەپاندوە! بۆ نموون: باسەرنجێكى چوارەمین كۆبوونەوە بدەین، كە مێژوونووسان بە كۆبوونەوەیەكى یەكلاییكەرەوەو چارەنووسسازیان ناوزەرد كردوە لە مێژووى نەصرانییەتدا:

((ئەم كۆبوونەوەیە، كە چوارەم كۆبوونەوەى جیهانیى بوو، لە هەردوو مانگى ئەیلولو تشرینى یەكەمى ساڵى (٤٥١) ز دا بەسترا، لەسەر بانگهێشتى ئیمپراتۆر (مرقیون Marcion)، كە لەنێوان ساڵانى (٤٥٠-٤٧٠)دا حوكمڕانیى كردوە، ئەویش لە ئەنجامى چەند دەمەقاڵێیەكى توند لەو بارەوە، كە ئایا لایەنى مرۆڤبوون (إنسي) لە مەسیح دا جیاوازەو حەقیقەتو كارایی هەیە، پاش ئەوەى وشەى خواى چۆتە نێو؟! ئەمیش ئەو كێشەیە بوو، كە (ئۆتیخۆس Etyches) پەیداى كرد، كە زۆر زێدەڕۆییكرد لە جەخت كردندا لەسەر لایەنى خوایەتى مەسیح ﷺ لەسەر حیسابى مرۆڤبوونى.

...ئیدى ئیمپراتۆر، كۆبووەوەكانى- كە دەورى (٤٢٠) كەس بوون- ناچار كرد كە بەیانێكى عەقیدەیى لە بارەى مەسیحەوە دەربكەن، كە لە داڕشتنەكەیدا لایەنى سوڵحو لەیەك نزیكخستنەوە ڕەچاو بكرێ، لە نێوان بۆچوونە ناكۆكەكانداو سەرەنجام بڕیارى كۆتایى ئەوەبوو، كە دان بهێنرێ بەمەبدەئى دووسروشتیدا بۆ مەسیح (كە بە لاهووتو ناسووت) تەعبیر دەكرێن)..))[١].

لە كۆتایى ئەم باسەشدا دەڵێین:

سڵەمینەوەو دووركەوتنەوەى خەڵكى ڕۆژئاوا لە كڵێساو نەصرانییەت، شتێكى چاوەڕوانكراوو مەنتیقى بووە، چونكە نەصرانییەت (ماركس) گوتەنى: (تلیاكى خەڵك) بوو[٢]، بەڵام وەك ڕوونبۆوە ئەو نەصرانییەتەى خەڵكى ڕۆژئاواى

(١) بڕوانە: (النصرانية..) د.عرفان عبدالحميد فتاح، الفصل السادس: المجامع الدينية، ص١٦٩-١٨٤.

(٢) بڕوانە: (العلمانية) Guy Haarscher، ص٨١، ط٥/٢٠٠٥.

بێزارو ناچاری ڕاپەڕین کردو مارکس بە تریاکی ناوبردوە، ئەو ئایینە نەبووە، کە عیسای مەسیح ﷺ لە خواوە هێنابووی، بەڵکو ئایینێکیداتاشراوی کڵێساو چینی ئەکلیرۆس‌و هەڵاخنەراو لە ئەفسانەو غەڵەت‌و پەڵەت بوو!

بینا لەسەر ئەوەش، دەبێ بگوترێ: ئەوەی،کە (عەلمانییەت) لە ڕۆژئاوا بەسەریدا زاڵبووو بەزاندی‌و جێی پێ لێژ کرد، ئایینێکی خوایی نەبوو، بەڵکو ئایینێکی بەشەریی بوو، هەر بۆیەش کەسانێك، کە پێیان وایە چارەنووسی (ئیسلام)یش لە بەرانبەر عەلمانییەتدا لەنێو مسوڵمانان، وەك هی نەصرانییەت، دەبێ لەنێو خەڵکی ڕۆژئاوادا، خراپ بە هەڵەداچوون‌و هەموو سمێڵ سوورێك بە هەمزاغا حاڵی بوون!

لە باسیداهاتووشماندا دەیخەینە ڕوو، کە: (نە سیکۆلاریزم جێ پێی لەنێو مسوڵمانانداندا چنگ دەکەوێ و، نە ئەوانیش پاساوی شوێنکەوتنییان هەیە).

## نە سیکۆلاریزم جێ پێی لەنێو مسوڵماناندا چنـگ دەکەوێ و نە ئەوانیش پاساوی شوێنکەوتنییان هەیە

خوێنەری بەڕێز!

ڕاستیتی ئەم قسەیەی سەرێ، کـە کردوومانەتـە سـەرباس لـە دوو تـەوەرەدا دەخەینەڕوو:

### تـەوەرەی یەکـەم: میـژووی ئیسـلام و مسـوڵمانان پێچـەوانەی مێژووی کلێسا و نەصرانییەکانە:

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز! مێژووی ئیسلامو مسوڵمانان لە زۆر ڕووەوە، نەك هەر جیاوازبووە لەمێژووی کلێساو نەصرانییەتو نەصـرانییەکان، بگـرە پێچـەوانەش بوونە، با بزانین چۆن؟

١- بەرنامەی (مەسیح) ﷺ بۆ قۆناغێکی دیاری کراوو خەڵکێکی تایبـەت بووە، بەڵام بەرنامەی ئیسلامو پەیامی (محمد) -علیـه الصلاة والسلام- لـە ڕووی کاتو خەڵكو شوێنەوە گشتگیرە:

تەرخانکرانی بەرنامەی (عیسا)ﷺ بۆ قۆناغو خەڵکێکی دیاری کراویش وێڕای دەقـی قورئـان: ﴿وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم..﴾ (الصف: ٦)، مێژوونووسـانیش ڕایانگەیانـدوە، بـۆ وێنـە: خـاوەنی کتێبـی (النصرانية..) پاش لێکۆڵینەوە لەو بـارەوە دەڵـێ: ((وخلاصـة القـول فـإن القدِّيس بولص هو الذي حقَّق تحوّل المسـيحية مـن فرقـةٍ يهوديـة إلى حركـة عالمية))[1]، واتە: کورتەی قسان، قیددیس بۆڵس بوو، کە مەسیحییەتی لە کۆمەڵێکی جوولەکەوە گۆڕی، بۆ جووڵانەوەیەکی جیهانی..

---

(١) ص١٢٦.

گشتگیریی‌و جیهانیی بوونی ئیسلامیش، هەر لە سەرەتایدابەزینی قورئانەوە ڕاگەیەنراوە، بۆ نموونە: خوای کاربەجێ لە سوورەتی (سبأ) ئایەتی (٢٨)دا، کە سوورەتێکی مەککی یە فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ..﴾، واتە: تۆمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی موژدەدەرو ترسێنەر بی..

دیارە بەرنامەیەکیش،کە خوای کاربەجێ بۆ کات‌و شوێن‌و خەڵکێکی دیاری کراوی بنێرێ، شتێکی چاوەڕوانکراوە، کە شایستەی کات‌و شوێن‌و خەڵکێکی دیکەی جیاواز لەوان نەبێ و، نەتوانێ ژیان‌و گوزەرانیان ڕێك بخات‌و کێشەکانیان چارەسەر بکات، بەڵام بێگومان بەرنامەیەك خوا بۆ هەموو مرۆڤـایەتیی بنێرێ، بە درێژایی زەمان‌و بە پانایی زەمین، دیارە بە شێوەیەکە، کە بتوانێ فریای چارەسەری کێشەو گرفتەکانی سەرجەم کۆمەڵگاکانی بەشەر بکەوێ، لە هەر کوێیەك بن‌و لەهەر چاخ‌و ڕۆژگارێك دابن.

٢- کتێبەکەی (عیسا) ﷺ هەر زوو گۆڕراو دەستکاریی کرا، بەڵام کتێبی (محمد) ﷺ خوا پاراستوویەتی‌و بە سەلامەتی هێشتوویەتەوە:

گۆڕران‌و شێوێنرانی کتێبی عیسا (إنجیل)و تێکدرانی بەرنامەکەی، ڕاستییەکی مێژووییەو هیچ کەس ناتوانێ نکووڵیی لێ بکات، هەردوورنەڕۆین، خوا ئینجیلێکی بۆ عیسا ناردوە، بەڵام نەصرانییەکان ئێستا چوارو، پێشتر زیاتریشیان هەبوون!

(جرین برنتن) لەو بارەوە گوتوویەتی: ((بێگومان مەسیحییەتی زاڵبوو لە کۆبوونەوەی (نیقیة)دا - کە کرا بە عەقیدەی ڕەسمیی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی دنیا - بە تەواوی جیا بوو لە مەسیحییەتی مەسیحییەکانی (جەلیل)..))[1].

---

(١) بڕوانە کتێبی (أفكار ورجال) ص٢٠٧، لە تەرجەمەی عەرەبی.

بەڵام قورئان، خوا لە بارەی پارێزگاری لێکردنییەوە، فەرمووویەتی:
﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ (الحجر: ٩)، واتـە: ئێمـە خۆمـان زیکر(قورئان)مان ناردۆتە خواریّو هەر خۆیشمان پارێزەرینی.

ئنجا وەك واقیعیش، خوا قورئانی پاراستوەو مسوڵمانان لەسەر وشەیەكو بگرە پیتێكیشی كێشەیان نیە.

٣- نەصرانییەکان، هەتا دەستگرتوو بوون بە ئایینە شێوێنراوەکەیانەوە لەڕووی شارستانییو ژیانو گوزەرانەوە دواکەوتوو بوون و، کە دەستبەرداری بـوون، پێشکەوتن، بەڵام مسوڵمانان بە پێچەوانەی وانەوە، پێشکەوتنیان بەرهەمی پابەند بوونیان بوو بە ئیسلامەوەو، کاتێك دەستیان لە ئایینەکەیان شل بوو بەجێمان! :

ئەمەش ڕاستییەکی مێژوویییەو، مێژوونووسە ڕۆژئاواییە بەویژدانـەکان پێش مسوڵمانان دانیـان پێـداهێناوە، بـۆ وێنـە: سـەرنجی کتـێبی (تـأریخ الشعوب الإسـلامیة)ی (کـارڵ برۆکلمـان)و (حضـارة العـرب)ی (گوسـتا لۆبۆن)و بەرهەمەکانی (جۆلتسهیر) بدە، لەو بارەوە.

٤- هەڵەو کەمو کوڕیی نەصرانییەکان لە خودی ئایینەکەیانو زانایەکانیانەوە هەڵقوڵیوە، بەڵام هی مسوڵمانان لە حوکمڕانو دەسەڵاتدارەکانیانەوەیە:

ئەم قسەیەش وەڵامی کەسانێکە، کە دەڵێن: وەك چۆن لە مێژووی ئایینی نەصرانییو نەصرانییەکاندا زوڵمو ستەمو کەمو کوڕیی زۆر هەبووە، بەهەمان شێوەش لە مێژووی ئیسلامو مسوڵماناندا شتی خراپو لار زۆر بـووە، جـا ئێمەش ئەوە دەسەلمێنین، بەڵام پێویستە لێرەدا ئاگاداری ڕاستییەکی گەورەو گرنگ بین، ئەویش ئەوەیە،کە هەڵـەو پەڵـەو سـتەمو خراپەیـەك، کـە لـە مێژووی ئیسلامو مـسوڵماناندا ڕوویداوە، بەهۆی خودی ئیسـلامـەوە نەبووەو لە لایەن زاناو پێشەوایانی ئیسلامەوە شەرعییەتی پێ نـەدراوەو تەبـەنی نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەهۆی لادان لە شەریعەتەوە بووە لە لایەن

حوکمڕانانەوە و، مسوڵمانانی سادەو عەوامیش ئەو ڕاستییەیان زانیوەو، هەمیشەش زاناو پێشەوایانی ڕەسەن لە بەرانبەریدا وەستاونو نەك هەر شەرعییەتیان پێ نەداوە، بەڵکو بەرهەڵستیشیان کردوەو، زۆر جارێن دووچاری گیرانو ئەشکەنجەو ئازار بوونو، هەشیان بووە سەریشی لەو ڕێیەدا داناوە، بۆ نموونە:

هەرکام لە (حسين بن علي بن أبي طالب) و (زيد بن علي -زين العابدين-)و (عبدالرحمن بن الأشعث)، کە لە دژی بنەماڵەی ئەمەویی راپەڕین و، (محمد بن عبدالله بن حسن)و (إبراهيم)ی برای، کە لەدژی بنەماڵەی عەبباسیی ڕاپەڕینو کوژران!

بەڵام ئەوەی،کە لە مێژووی نەصرانییەتدا ڕوویداوە، یەکەم: لە خودی دەقەکانی ئاینەکەوە هەڵقوڵیوەو شەرعییەتی پێدراوە، دووەم: لە لایەن پاپاو قەشەو چینی ئەکلیرۆسیشەوە، پەسندو پشتگیریی کراوە!

## تەوەرەی دووەم: هیچ هۆکارێك لەوانەی خەڵکی ڕۆژئاوایان لە ئایینەکەیان سڵەماندەوە،لە ئیسلامدابوونی نیە:

بۆ ئەوەی ڕاستیی ئەم قسەیەمان بۆ دەربکەوێ، ناچارین ،ئەگەربە خێراییش بووە، چاوێك بەو حەوت هۆکارەدا بگێڕین، کە پێشتر باسمان کردنو، گوتمان گرنگترین فاکتەری لە ئایینو کڵێسا سڵەمینەوەو بەرەو سیکۆلاریزم چوونی خەڵکی ڕۆژئاوا بوون:

### ١- لەڕووی فیکرییەوە:

١- لە ئیسلامدادینو ژینو حوکمو حیکمەتو سیاسەتو عیبادەت، تێکهەڵکێشن:

بۆ دەرککردنی ئەم ڕاستییەش، بەس سەرنجدانێکی خێرای، نەك هەموو قورئان، بەڵکو تەنیا یەك سووڕەت، بۆ نموونە: (البقرة) بەسە، کە وێڕای

عەقیدەو ئیمان، باسی عیبادەتو خێزانو ئابووریی‌و جەنگ‌و پەیوەندی سیاسیی و...هتدی تێدا کراوە.

ئنجا وێڕای ئەوەش، پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ لە ژیانی خۆیدا، ئیسلامی بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە لە دەوڵەت‌و قەوارەیەکی سیاسییدا بەرجەستە کردوە و، دیارە شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خواش ﷺ لە هەموو لایەنێکی ژیان‌و گوزەران‌و دینداریی‌و دنیادارییدا، مەرجی بە مسوڵماندانانی ئینسانە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (آل عمران:٣١-٣٢)، واتە: بڵێ ،ئەگەرخواتان خۆشدەوێ شوێنم بکەون، خواش خۆشیدەوێن‌و لە گوناهەکانیشتان دەبووری، خوا لێبوردەی بەبەزەییە، بڵێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەربکەن،جا ،ئەگەرپشتیان هەڵکرد، ئەوە بێگومان خوا کافرانی خۆشناوێن!

٢- لە ئیسلامدابە هیچ جۆرێك ڕێ بە فەرزکردنی (دین) نادرێ:

لەو بارەشەوە دەیان ئایەتی ڕوون‌و ڕاشکاو هەن، بۆ نموونە: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ.. ﴾ (البقرة: ٢٥٦)، وە: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ.. ﴾ (الكهف: ٢٩).

٣- لە ئیسلامدابەهۆی پارێزرانی قورئانەوە لە دەستکاریی کران، ڕێ لە هەموو جۆرە لادانێکی گەورەو گچکەی عەقیدەیی گیراوە:

بەڵێ، هەرگیز ئەوەی لە ئایینی نەصرانییدا ڕوویداوە لە شێوێنران‌و گۆڕران، ناگونجێ لە ئیسلامداڕووبدات، چونکە ئیسلام ئەسڵ‌و مەتنەکەی، کە قورئانە، خوای کاربەجێ بەڵێنیداوە، کە بیپارێزێ‌و بەڵێنی خواش ناگونجێ نەیەتەدی!

٤- خوای پەروەردگار وەك قورئان وەسفو پێناسەی دەكات، هەردەم ئاگاداری بوونەوەرەو بەردەوام سەرپەرشتی دروستکراوەکانی دەکات:

نەك وەك تێڕوانینی کلێسایی کارتێکراو (متـأثِّر) لـە لایـەن فەلسـەفەی ئەرستۆوە، کە خوا ﷻ بە هۆکاری یەکەم (العلّة الأولى)و جوولێنەری یەکەم (المحرِّك الأول) ناودەبات، بۆ نموونە: خـوا لـە بـارەی سەرپەرشـتی کردنـی بوونەوەرو بەسەر ڕاگەیشتنییەوە فەرموویەتی:

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ﴾ (الرعد: ٢).

واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە ئاسمانەکانی بە کۆڵەکەگەلێ، کـە نایـانبینن بەرزکردۆتەوە، پاشان چۆتە سەر بارەگـاو خـۆرو مـانگی مەیسـەرکردوون، هـەرکامیان بـەرەو کـاتێکی دیـاریکراو دەڕوا، (خـوا) کـارو بارەکـان بـەڕێوەدەباتو ئایەتـەکان ڕوون دەکاتـەوە، بـەڵکو بەرانبـەر بـە دیـداری پەروەردگارتان دڵنیاییتان پەیدابێ.

٥- ئیسلام، چونکە عـەقیدەیەکی ڕاستو بەرنامەیەکی کامڵـە، هـیچ جـۆرە نیازمەندییەکی بە غـەیری خۆی نیە و، دەستی مسوڵمانانیش کراوەیە بـۆ وەرگرتنی هەر بیروبۆچوونێکی چاكو سوودبەخش، لەو بوارانەدا، کە ئیسلام لـە ڕووی حیکمەتـەوە تـەنیا هێڵـی گشـتیی بـۆ دانـاونو نەچـۆتە نێـو وردەکارییەکانەوە، وەك: سیاسەتو ئابووریيو ئیدارە و..هتد:

بەڵێ، ئیسلام، کە بەرنامەیەکی گشـتگیر (شـامل)و کامڵـە: ﴿..ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ..﴾ (المائدة: ٣)، وەك ئایینی شێوێنراوو بۆ کاتو شوێنو خەڵکێکی تایبـەتی نێـرراوی نەصڕانیی، شوێنکەوتوانی خۆی ناچار نەکردوە، سواڵو سەدەقەی ئەملاولا بکەن، بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی بەرنامەکەیان! بەڵام لە هەمان کاتیشدا

لە بەردەم بەهرە وەرگرتندا لـە هەرشـتێك، کـە زادەو بەرهـەمی عـەقڵ‌و ئەزموونی خەڵکی دیکەیە، نەك هەر دەستی نەبەستوون، بگرە هانیشیداون‌و پشتیشی گرتوون، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿..فَبَشِّرْ عِبَادِ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ (الزمر:١٧-١٨).

واتە: جا موژدە بدە بە بەندەکانم، ئەوانەی، کە بە گشتیی گوێ بۆ قسـە دەگرن، بەڵام دەکەونە شوێن چاکترینی، ئەوانـە کەسـانێکن خـوا ڕێنمـایی کردوون، ئەوانەن خاوەن عـەقڵان.

## ٢- لە ڕووی زانیاریی یـەوە:

لە بواری گرنگیدانی ئیسلام بە زانیاریی‌و ڕێزگرتن لە زانایان، دەتوانین زۆر شت باس بکەین، بە پێچەوانەی نەصرانییەتەوە، کە کۆسپ بوو لە بەردەم زانیاریـداو دوژمنی سەرسەختی زانایان‌و لێکۆڵەرەوان بوو! بەڵام هەر بە کـورتی ئامـاژە بـە چەند شتێك دەکەین:

١- یەکەمین سوورەت،کە لە قورئانێدا هاتۆتە خـوارێ بـە (بخوێنـە) دەسـتی پێکردوەو دووەمین سوورەتیش بە باسی قەڵەم‌و نووسین:

بەڵێ، یەکەمین دێڕی یەکەمین سوورەتی قورئـان ئەمـەبوو: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ (العلق: ١).

دووەمین سوورەتیش ئاوا دەستی پێکردوە: ﴿نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ (القلم: ١).

٢- بەڵگـەوموعجیزەی پێغەمبـەری ئیسـلام، موعجیزەیـەکی عیلمیـی‌و فیکرییە، کە قورئانە:

خوای پەروەردگار لە وەڵامی کافرەکاندا کە داوێی بەڵگەو موعجیزەیەکی بەرهەستیان دەکرد، فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ

ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ (العنكبوت: ٥٠-٥١).

واتە: گوتیان خۆزگە چەند نیشانەیەکی لە پەروەردگارییەوە بۆ هاتبانە خوارێ، بڵێ نیشانەو بەڵگەکان بەس لەلایەن خواوەن، من تەنیا وریاکەرەوەیەکی ڕوونم. ئایا بۆ ئەوانە بەس نیە، کە ئێمە کتێبمان ناردۆتە سەر تۆ بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە..؟!

٣- قورئان لە سیاقی چەند ئایەتێکدا،کە باسی دیاردە سروشتییەکان دەکەن، ڕایگەیاندوە کە تەنیا زانایان وەك پێویست لە خوا دەترسن، واتە زانایانێك کە بە نهێنییەکانی دروستکراوەکانی خوا شارەزان:

وەك فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ۞ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾ (فاطر: ٢٧-٢٨).

واتە: ئایا نابینی، کە خوا لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتەخوارێ، جا میوەجاتی ڕەنگاوڕەنگمان پێ (لە زەوی) دەرهێناوە، هێڵی ڕەش و سووری ڕەنگاوڕەنگ و ڕەشی زۆر تۆخ لە چیایەکاندا. لە خەڵك و ژیانداران و ئاژەڵ، دیسان ڕەنگاوڕەنگ و جیاوازن، بێگومان تەنیا بەندە زانایەکان لە خوا دەترسێن، بە ڕاستی خوا زاڵی لێبوردەیە.

٤- قورئان بە فەرمان کردنی پەیتا پەیتای بە سەرنج دان و تێوەڕامانی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان و بە زەویدا ڕۆیشتن و وردبوونەوە، بناغەی زانیاریی ئەزموونی (العلم التجربي) داڕشت:

بەڵێ، لە زۆر ئایەتی بە پێزی قورئاندا، خوای کاربەجێ فەرمان بە مرۆڤ دەکات،کە سەرنجی خۆی و دەوروبەرو بوونەوەر بدات و ڕابمێنێ، تاکو پەی بە نهێنی و ڕازەکانی خوا لە دروستکراوەکانیدا ببات، بۆ نموونە:

* ﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ ..!﴾ (الأعراف: ١٨٥).

واتە: ئایا تەماشای مـوڵکی فراوانـی ئاسمانـەکانو زەویو هەرشـتێکی دیکەیان نەکردوە، کە خوا دروستی کردوە!

* ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ !﴾ (الذاريات: ٢٠-٢١).

واتە: لە زەویدا نیشانەی زۆر هەن بۆ بڕواپێتەوان. هەروەها لە خۆشـتاندا ئەوە بۆ نابینن!

* ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾ (الطارق: ٥).

واتە: دەبا ئینسـان سەرنج بدات، لەچی دروستبووە.

* ﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ﴾ (عبس: ٢٤).

واتە: دەبا مرۆڤـ لە خواردنەکەی وردبێتـەوە.

* ﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَ !﴾ (العنكبوت: ٢٠).

واتە: بڵێ: بە زەویدابڕۆنو سەرنج بدەن، (خوا) چۆن دروستکراوی خـۆی هێناوەتەدی..

دیارە ئەم جۆرە مامەڵەکردنەش، لەگەڵ دەورویەرو سروشتدا، بناغـەی زانیاریی ئەزموونییو پەی بردن بە یاساکانی خوای زاناو شارەزایە لە دروستکراوەکانیدا.

٥- خوا ڕایگەیاندوە، کە زاناو شارەزایان، چـەندان پلـە بەسـەر ئیمانـدارانی دیکەدا بەرزدەکاتەوە:

وەك فەرموویـــــــــەتی: ﴿..يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ..﴾ (المجادلة: ١١).

ئاشکراشە، کە کاتی خۆی لە کاتێکدا دنیا لە تاریکـایی نـەزانییو بـێ ئاگاییدا نقووم بوو بوو، زانایانی ئیسـلام سـەرقافڵەی کـاروانی زانیـارییو زانست بوون و، یەکێك لە فاکتەرە گرنگەکانی بێداربوونـەوەی ئـەورووپاش

دەستگیرکردنیان بوو لە کتێبو بەرهەمە زانستییە جۆراوجۆرەکانی دنیای ئیسلام.

ئنجا لە بارەی تێکگیرانی ئیسلامو زانایانیشەوە، هەر بەکورتی دەڵێین:

هیچ کاتێك ناگونجێ ئایینی ساغو زانیاریی ڕاست، پێکەوە دژو ناکۆك بن، چونکە ئایینو وەحی ساغو دەستکاریی نەکراو، فەرمایشتی خوایە و، زانیاریی ڕاست (العلم الصحیح)یشو وەسفو پێناسەی کردەوەی خوایەو، دیارە مەحاڵیشە خوای کاربەجێ ﷻ قسە (کلام)و کردەوە (عمل)ی تێك بگیرێنو دژ بوەستن!

هەربۆیەش هەرکاتێك بینیمان تێکگیرانێکی لەوجۆرە ڕوویداوە، پێویستە دڵنیا بین، کە، یان ئەوەی بە (ئایینو وەحی خوا) دانراوە، ساغ نیەو خڵتەی ڕەگەڵ خراوەو شێوێنراوە، یان ئەوەی،کە بە (زانیاریی) زانراوە، ڕاستو تەواو نیە، وەك ئەوەی،کە لە ڕۆژئاوا ڕوویدا، کە لە ڕاستیدا تێکگیرانی نێوان ئایینێکی شێوێنراو، یان ئەفسانەیەکی بەئایین دانراوو زانیاریی بوو، نەك ئایینی خواو زانیاریی.

هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە تێکگیرانی هەندێك بیردۆزەی، کە لە قۆناغێکدا بەڕاستییەکی زانیاریی (حقیقة علمیة) دانرابوون، لەگەڵ ئیسلامدا، وەك:

(داروینیزمو فرۆیدیزمو مارکسیزم) لە هەندێك لایەنیاندا، بەڵام دوایی دەرکەوت،کە بە زانیاریی زانرانیان هەڵەبوو، ئەو تێکگیرانە تێکگیران بووە لە نێوان ئیسلامو چەند بیردۆزەیەکی هەڵەو پەڵەدا، نەك ئیسلامو زانیاریی!

### ٣- لە ڕووی شارستانییەوە:

لە ڕووی شارستانییو بەرەوپێشبردنی ژیانو گوزەرانو گەشەپێدانی کۆمەڵگاشەوە، ئیسلام بە پێچەوانەی نەصرانییەتەوە، نەك هەر کێشەو گرفتی بۆ شوێنکەوتوانی دروست نەکردوەو، ڕێی گەشەکردنو بەرەوپێشچوونی لێیان

نەگرتوە، بەڵکو لە سەریشی فەرز کردوون، کە هەتا پێیان دەکرێ، وڵاتیان ئاوەدان بکەنەوەو کارێك بکەن، کە بۆ هیچ شتێکو لە هـیچ ڕووێکـەوە پێویسـتییان بـە غەیری خۆیان نەبێو لەسەر پێی خۆیان بوەستن.

ئەو ڕاستییەش وێـڕای دەقـەکانی قورئـانو سـوننەتو کەلـەپووری زانایـانی ئیسلام، واقیعی مێژوویی ئیسلامیش شایەدیی بۆ دەدات، بەڵام ئێمە لێرەدا بـە هێنانەوەی چەند دەقێکی قورئانو سوننەت، واز لەم بابەتـە دێـنین، چـونکە لـە باسەکانیداهاتووماندا، خوا یاربێ دەگەڕێینەوە سەری:

* ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ ۖ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ (الملك: ١٥).

واتە: -خوا- ئەو کەسەیە، کە زەوی بـۆ مەیسـەر کـردوون، دەجـا بـە لاشانەکانیدا بڕۆنو لە ڕۆزی خوا بخۆنو بۆلای ویش دەچنەوە.

* ﴿..هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا..﴾ (هود: ٦١).

واتە: ئەو -خوا- ئێوەی لە زەویدا پێگەیاندوەو، ئاوەدان کردنەوەیشی بە خۆتان سپاردوە..

* {الحكمة ضالّة المؤمن، فحيثما وجدها فهو أحق بها} (رواه الترمذي).

واتە: قسەو کرداری بەجێ (زانیاریی سوودبەخش) لە ئیماندار ون بووە، لە هەرکوێیەك بیدۆزێتەوە، ئەوە لە هەموو کەس پێی شایستەترە.

* {إن الله تعالى كتب الإحسان على كل شيء..} (رواه مسلم).

واتە: بێگومان خوا چاککردنی بۆ هەموو شتێك پێویست کـردوە (واتـە فەرزی کردوە، کە هەموو کارێك بە وردەکارییو لێزانیی بکرێ).

## ٤- لە ڕووی سـیاسـیـیـیەوە:

لەڕووی سیاسەتیشەوە، هیچ کام لەو هۆکارانـەی، کـە بوونـە مایـەی نێـوان تێکچوونی خەڵکی ڕۆژئاواو ئایینی نەصرانیی بەرجەستەکراو، لە کڵێساو چینی

ئەکلیرۆس (طبقة رجال الدین)دا، نەك هەر نین، بەڵکو پێچەوانەکانیان هەن! بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی لە داهاتوودا لە ئاڵقەیەکی تەرخانو سەربەخۆدا، باسی حوکمو سیاسەت دەکەین، لێرەدا بە خستنەڕووی چەند ڕاستییەك بەکورتی وازی لێ دێنین:

١- بناغەی کاروبار بەڕێوەبردن لە ئیسلامدا ڕاوێژە، بۆیە بە هیچ جۆرێك سیستەمی تاکڕەویی‌و دیکتاتۆریی لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە:
وەك خوای کاربەجێ لە پێناسەی کۆمەڵو کۆمەڵگای مسوڵمانو شێوازی کاروبار بەڕێوەبردنیاندا، فەرموویەتی: ﴿..وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ..﴾ (الشوری:٣٨)، واتە: کاروباریان بە ڕاوێژە، وشەی (أمر)یش لێرەدا چەمکێکی گشتیی هەیە، بەڵام بە پلەی یەکەم کاروباری سیاسیی دەگرێتەوە.

٢- هەرچەندە زانایان لە ئیسلامدا ڕێزی تایبەتییان هەیە، بەڵام چینێکی دیاریکراو نین و، هیچ پلەو ئیمتیازێکیشیان بەسەر خەڵکدا نیە و، زاراوەی پیاوانی ئایین (رجال الدین) لە ئیسلامدا شتێکی هەڵەیە، چونکە سەرجەم پیاوانو ئافرەتانیش لە ئیسلامدا - مادام مسوڵمان بن - هی ئایینن‌و لە بەرانبەریدا بەرپرسیارن:
بەڵێ، لە ئیسلامدا بەپێچەوانەی نەصرانییەتەوە، زانایان (علماء) چینێکی دیاریکراو نین، وەك چینی (ئەکلیرۆس) و، بێجگە لە پسپۆڕیی‌و شارەزاییش، هیچ شتێکی دیکەی زیادەیان بەسەر خەڵکەوە نیە ، لە هەموو قورئانیشدا ،تەنانەت جارێکیش خوا بە تایبەت زانایانی نەدواندوەو (یاأیها العلماء!) لە قورئاندا نەهاتوەو تەنیا بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ مسوڵمانان بە گشتیی دوێنراون.

٣- کەسی یەکەمی دەسەڵاتی سیاسیی لە ئیسلامدا، نەسێبەری خوایەو، نە وەکیلیشیەتی، بەڵکو وەکیل‌و نوێنەری خەڵکە، بۆجێبەجێکردنی شەریعەتی خوا بەسەریاندا، خۆیشی پێش هەموویانو، لە هەموویان چاکتر لەسەری

پێویستە پێیەوە پابەندبێ و، شـەرعییەت پێـدران و لـێ ستێنرانەوەیشـی، پەیوەستە بە ئیرادەی خەڵکەوە:

وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

* ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (الجاثية: ١٨).
* ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ .. ﴾(النساء:٥٩).
* ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ .. ﴾ (النساء: ٥٨).

لە داهاتوودا قسە لەسەر تەفسیرو لێکدانەوەی ئـەم ئایەتانـە دەکـەین و، کۆتایی ئەم خاڵەش، بـە چـەند قسـەیەکی نەسـتەقی خەلیفـەی یەکـەمی پێغەمبەر (أبوبكر الصديق) دێنین، کە ڕاستەوخۆ پاش هەڵبژێرران و پـەیمان پێدرانی، گوتوویەتی:

{..قد وليتُ عليكم ولَسْتُ بخيركم، فأنْ أحسـنت، فـأعينوني، وإن أسَـأْتُ فَقَوِّموني..}.[1]

واتە: هەرچەندە کراومـە سەرپەرشتیارتان، بەڵام لە ئێوە چاکتر نـیم، جـا ئەگەرچاکم کرد، یارمـەتیم بدەن، ئەگەرخراپم کرد، ڕاستم بکەنەوە..

## ٥- لەڕووی ئـابـــووریــیەوە:

خوا پشتیوان بێ، ئێمە ئاڵقەیەکی سـەربەخۆ بـۆ ڕوونکردنـەوەی هەڵوێسـتی ئیسلام لەبارەی ئابوورییەوە تەرخان دەکەین و، ئێستا هەر بە کورتی دەڵێین:

---

[1] السيرة النبوية لأبن هشام، ج٤ س٣٩٣، و(الكامـل في التـأريخ) لأبـن كـثير، ج٢ ص٢٢٤، ٢٢٥

سیستەمی ئابووریی لە ئیسلامدا، لایەنە ئیجابییەکانی هەرکام لە سیستەمی سۆشیالیزمیی‌و سەرمایەداریی لەخۆیدا کۆکردوونەتەوە و، لە لایەنە سەلبی یەکانیشیان دوورە، لە ئیسلامیشدا بە هیچ شێوەیەك ڕێ نەدراوە، کە هیچ کەس‌و لایەنێك بە ناوی خواو ئایینەوە، خەڵکی بچەوسێنێتەوەو (إستغلال)یان بکات‌و هیچ کەس‌و لایەنێکیش لە ڕووی ئابووری‌و ژیان‌و گوزەرانەوە، پلەو ئیمتیازی بەسەر خەڵکدا پێ نەدراوە، بەڵکو خوا ﷻ ڕایگەیاندوە، کە خێرو بێرو بژێوییەکانی زەوی بە یەکسانی بۆ بەندەکانی خولقاندوە: ﴿..وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴾ (فصلت: ١٠)، واتە: چیایەکانی لەسەر پشتی (زەوی) دانان‌و بەرەکەتی تێخست‌و، لە چوار ڕۆژاندا بژێوییەکانی تێدا ئەندازەگیریی کردن بە یەکسانیی بۆ (بژێو) داواکەران (لە خوا).

ڕاشیگەیاندوە، کە نابێ موڵك‌و سامان، تەنیا لەدەستی دەوڵەمەندەکاندا پەزمەندە ببێ:

﴿..كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ ...﴾ (الحشر: ٧)، واتە: (بۆیە خوا ئەو بڕیارەیدا) تاکو موڵك‌و سامان لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا پەزمەندە نەبێ..

## ٦- لە ڕووی دەمارگیریی و یەکدی قبووڵ نەکردنەوە:

لەم ڕووەشەوە ئیسلام، چ بە تیۆریی (نظري)و وەك دەقەکانی قورئان‌و سوننەت و، چ بە کردەیی‌و جێبەجێکردن (تطبيق)، ژمارەی قیاسی شکاندوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لەسەماحەت‌و سینەفراوانیی‌و مەدارکردن‌و ئایین‌و بیروبڕوای جیاواز تەحەموولکردندا.

جا لەبەر ئەوەی ئێمە، خوا پشتیوان بێ، توێژینەوەی ئەم مەسەلەیەش ئاڵقەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان دەکەین، لێرەدا هەر بە کورتی‌و پوختی دەڵێین:

لە ئیسلامدا نەك هەر ئازادیی بیروڕاو مەزهەب، بەڵکو ئازادیی بیروبڕواو دینیش، بۆ هەموو کەس دەستەبەرو مسۆگەرکراوە، بۆیە هیچ کەس بۆی نیە بە ناوی ئیسلامەوە، بکەوێتە دژایەتیکردن‌و سەنگەرگرتن لە کەسانێك، کە لە ڕووی

فیکرو بۆچوونەوە، یان لە ڕووی عەقیدەو دینەوە لەگەڵیدا ناکۆکن، چونکە خـوا مرۆڤـەکانی بۆ تاقیکردنەوە دروستکردوەو، بەبێ ئازادییش، تاقیکرانـەوە هـیـ مانای نیە! خوای کاربەجێش بە ڕوونو ڕاشکاویی فەرموویەتی، کـە لـەو بـارەوە ئازادیی تەواوی بە بەندەکانیداوە:

* ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ .. ﴾ (البقرة: ٢٥٦).
* ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴾ (الكهف: ٢٩).
* ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ؟!﴾ (یونس: ٩٩).

## ٧- لەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە:

لەڕووی کۆمـەڵایەتیشەوە، دیسان هیچ کام لـەو هۆکارانـەی، کـە پاڵیـان بـە خەڵکی ڕۆژئاواوە نا، کە پشت لە نەصرانییەتو کڵێسایەکەی بکـەنو ڕووبکەنـە سیکۆلاریزم، بوونیان نیە، جا هەرچەندە ئێمە ئەم مەسەلەیەش دواتر دەتوێژینەوە، بەڵام لێرەشدا هەر بەکورتی دەڵێین:

١- ئیسلام وەك ئایینێکی لەگەڵ فیترەتو سروشتی مرۆڤـدا گونجاو، بە شێوەیەکی واقیع بینانە، هەڵسو کەوتی لەگەڵ داخوازییو غەریزەکانی مرۆڤـدا کردوە و، ڕێبازو شێوازی گونجاوی دیاری کردوە بۆ تێرکردنیان، بە تایبەت غەریزەی هاوسەرگیرییو خێزان پێکەوەنان:

وەك فەرمـوویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً .. ﴾ (الروم: ٢١).

٢- ئیسلام ڕایگەیانـدوە، کـە خـوا جـوانییو نـازو نیعمەتـەکانی زەوی بـۆ بەندەکانی دروستکردوەو، هیچ کەسیش بۆی نیە لێیان قەدەغە بکات:

﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَـٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ .. ﴾ (الأعراف: ٣٢).

٣- ئیسلام ڕایگەیاندوە، کە مرۆڤەکان بە نێرو مێو ڕەش‌و سپی‌و دەوڵەمەندو نەدار و..هتدەوە سەر بەهەر ڕەگەزو گەل‌و تیرەو وەجاخێك بن، هەموویان وەك یەکن‌و تەنیا بە پارێزکاریی (تقوى)، پلەو ئیمتیازی نزیکتربوون‌و بەرێزتربوون لای خوا پەیدادەکەن:

وەك خوای بەرزو بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات: ١٣).

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك وەدی هێناوەو گێڕاومانن بە چەند گەل‌و تیرەیەك، تاکو یەکدی بناسن، بێگومان بەرێزترتان لەلای خوا پارێزکارترتانە، بە ڕاستی خوا زانای شارەزایە.

خوێنەری بەرێز!

وەك دیتمان: هەم مێژووی ئیسلام‌و مسوڵمانان، نەك هەر جیاواز، بەڵکو لە زۆر رووەوە پێچەوانە بوو لەگەڵ مێژووی کڵێساو نەصرانییەکانداو، هەم هیـ کام لەو شتانەش، کەکاتی خۆی بوونە پاساوو بیانووی لە نەصرانییەت‌و کڵێسا سڵەمینەوەو، باوەش بۆ عەلمانییەت گرتنەوەی خەڵکی ڕۆژئاوا، لە ئیسلامدا نەك هەر بوونیـ ن نیە، بگرە پێچەوانەکانیان هەن!

کەواتە: ئایا وێڕای ئیسلام وەك بووننناسیی‌و عەقیدەیەکی ڕاست‌و ساغ، عەقڵ‌و زانست‌و ویژدانیش فەرمانمان پێناکەن، کە پێویستە ئێمەی مسوڵمان -مسوڵمان چ بە ئیمان‌و عەقیدە، چ بە کلتوورو مێژوو- هەڵوێستمان لە بەرانبەر سیکۆلاریزمدا پێچەوانەی هەڵوێستی ڕۆژئاواییەکان بێ، چونکە ئایینەکەمان پێچەوانەی ئەو ئایینەیانە، کە بە هەڵە بە هی خوا ﷻی دەزانن؟!

ئایا ئەوانەی، کـە قیاسـی ئیسـلام‌و میـژووی ئیسـلام، لەسـەر نەصـرانییەت‌و مێژووەکەی دەکەن، خراپ بە هەڵەدا نەچوونەو ئەو پەندە کوردی یەیان بەسـەردا نەچەسپیوە، کە دەڵێ: (زاری بە (شیر) سـووتابوو فـووی لـە (دۆ)ش دەکـرد!)؟! بێگومان با.

لە کۆتایی ئەم باسەشدا دەڵێم:

لە ڕاستیداسیکۆلاریزم هەر لەو ڕۆژەوە، کە پێی ناوەتە نێـو دنیـای ئیسـلام‌و مسولّمانانەوە، کێشەو گرفتی هەبوونی پاساو (مُبرِّر)ی بوونی هەیە، ئاخر ئیسلام چ کەلێن‌و بۆشایی بەجێ ناهێڵێ -، ئەگەروەك خۆی فام بکرێ‌و بەڕێوەببرێ- کـە سـیکۆلاریزم‌و غـەیری سـیکۆلاریزم پـڕی بکەنـەوە، بـەڵێ، سـیکۆلاریزم لـەنێو مسولّماناندا جێ پێی نیەو، مسولّمانان بەڵگەو پاساوی پەنا پێبردنییان نیە.

بۆ ئەوەی بەڵگەیەکی دیکەش بخەمە سەر خەرمانی بەڵگەکانم ،کە عـەلمانییەت لەنێو مسولّماناندا بێ پاساوەو، جێ پێی چنگ نەکـەوتوەو چنگیشـی ناکـەوێ، مـەگەر مسولّمانان نەمێنن، یان لە بێ ئاگاییان، خەویان لێ بکەوێ، با گوێ لـە قسەی یەکێك لە عەلمانییەکان، بگرە پارێزەرو بیردۆزە ڕێژی عـەلمانییەت بگـرین، کە بە جۆرێك لە نائومێدیی‌و تالاّونۆشکردنێکەوە دەڵێ:

((إن العلمانية في حالة تراجعٍ كبير في العـالم العربـي اليـوم، والقـوى العلمانيـة يتقلّصُ ويتهمَّش دورها وتأثيرها الفاعل على الأحداث باطرىَدٍ متزايـد، فـلا أدلَّ على ذلك من الإنتعاش الكبير الذي نشهده للحركات الإسلامية المُسيِّسة للدين..))

واتـە: بێگومـان عـەلمانییـەت لـە جیهـانی عـەرەبی ئـەمڕۆدا، لـە حاڵـەتی پاشەکشەیەکی گەورەدایەو، هێزە سیکۆلاریستەکانیش بەردەوام ڕۆڵ‌و کاریگەریی کارایان لەسەر ڕووداوەکان کەم دەبێتەوەو دەچنە پەراوێزەوە، چاکترین بەڵگەش لەو بـارەوە، ئـەو گەشـەکردن‌و بووژانـەوە گەورەیـە، کـە بزووتنـەوە ئیسـلامییە سیاسییەکانی تێدا دەبینین.

پاشان ئەو برادەرە عەلمانییە دێتەسەر باسی هۆی ئەو بە پاشەوەچوون‌و پاشەکشەکردنەی سیکۆلاریزم، وەك دەستنیشانکردنی هۆکاری سەرەکی ئەو حاڵەتە دەڵێ:

((إن العلمانية عندنا ظهرت في ظل شروط لم تُساعِدْ على رَبْط فَهْمِنا لها بفهم متطور لطبيعة السياسة والإجتماع وما يتصل بهما، فكانت علمانية ذرائعية على أسُسٍ هَشَّةٍ، مّما جعلها غير قادرة على الصّمود أمام الإختبار)).

واتە: لە سۆنگەی ئەوەوە، کە عەلمانییەت لە هەل‌و مەرجێکدا، کە یارمەتیدەر نەبوو بۆ بەستنەوەی تێگەیشتنمان لێی بە تێگەیشتنێکی گەشەسەندوو، بۆ سروشتی سیاسەت‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئەوەی پێیانەوە پەیوەستە، بۆیە (عەلمانییەتەکەمان) عەلمانییەتێکی بێ بەڵگەو بنیات نراوبوو لەسەر چەند بنەمایەکی بێهێز، ئەوەش وای لێکرد، کە لەکاتی جەرِبێنراندا نەتوانێ خۆی بگرێ!

پاشان لە کۆتاییداو دەربارەی ئامانجی نووسینی کتێبەکەی دەڵێ:

((إنَّ الغرض في هذا الكتاب هو المساهمة في إزالة هذا النقص الفاضح في فكرنا العَلْمانيِّ))

واتە: ئامانجی ئەم کتێبەش بریتیە لە بەشداریی کردن لە لابردنی ئەم کەم‌و کورِییە ئابرووبەرە لە بیری عەلمانییماندا[1]!

بەڵام بێگومان ئەو کەم‌و کورِیی‌و بێ بنەمایی‌و بێ پاساوییەی سیکۆلاریزم، لەنێو جیهانی ئیسلامییدا، نە بە (عادل ضاهر) لاچووو، نە بە غەیری ویش لادەچێ! خوا یاربێ لە ئالقەی داهاتووشماندا، لە بواری فیکرو زانستدا سەرنجی خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی دەدەین.

---

(١) بڕوانە: (الأسس الفلسفية للعَلْمانية) عادل ضاهر. ص٥، ٦، ط٢، ١٩٩٨، دار الساقي.



# ئاڵقەی سێیەم:

## لە بواری فیکرو زانست دا

**خوێنەری سەنگین!**

**لـە دوو ئاڵقـەی پێشـوودا - لـە دوو تـوێی چـەند باسـێکدا- بـەراوردێکی نێـوان تـەوژمی ئیسـلامییو عـەلمانییمان کـرد، لـە هـەردوو بـواری (بوونناسـیی)و (بیروبـڕوا)داو، بۆمـان دەرکـەوت،کـە ئیسـلام خـاوەنی (بوونناسیی)یەکی ڕێکو ڕوونو (بیروبڕوا)یەکی ئاشکراو بێو پێچو پەنایە، بەڵام بە پێچەوانەوە عەلمانییەت لەڕووی بوونناسییەوە خاوەنی چەند دیدو تێڕوانینێکی جیاجیـاو پێکـەوە ناکۆکـە، کـە زۆرو سـەرەکییەکانیان، هـەردوو فەلسـەفەی (ماتریـالیزم)و (ئایـدیالیزم)ن و، لـەڕووی بیروبڕواشەوە، چەندان هەڵوێسـتی جۆراوجـۆری ئەبـەنتی کردوە، کە هەندێکیان دەگەنە ڕاددەی پێکـەوە دژ بـوون (تنـاقض) وەك: خواناسیو خوانەناسـییو دیموکراسـییو دیکتاتۆرییی!**

لە سۆنگەی ئەوەوە، کە بوونناسیی‌و بیروبڕوا بۆ ئایین‌و بەرنامەکان، دەوری بناغە دەبینن و، بێگومان ئیسلام‌و سیکۆلاریزمیش، دوو ئایین‌و بەرنامەی لەیەك جیان و، بگرە لە ڕەگ‌و ڕیشە‌و بنەڕەتەوە، دژ بەیەکیشن، بۆیە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، کە لەدوو ئاڵقەی پێشوودا، زیاتر قسە لە جیاوازییەکانی ئەو دوو ئایین‌و بەرنامەیە بکرێ‌و، کەمتر ئاماژە بۆ خاڵە هاوبەشەکانیان بکرێ، هەرچەندە لەو دوو بوارەشدا، ئیسلام کەم‌و زۆر خاڵی هاوبەشی لەگەڵ سیکۆلاریزمدا هەن، بۆ نموونە:

لە بواری (بوونناسیی)دا، ئیسلام لەگەڵ فەلسەفەی ماتریالیزمدا لەوەدا پێك دەگاتەوە، کە ماددە‌و دیاردە سروشتییەکان، بوون (وجود)ێکی ڕاستەقینە‌و سەربەخۆیان هەیە‌و، وەك فەلسەفەی ئایدیالیزم دەڵێ، بەس سێبەر‌و خەون‌و خەیاڵ نین!

ئنجا لەولاشەوە ئیسلام لەگەڵ فەلسەفەی ئایدیالیزمدا - بە چەمکە گشتیی یەکەی- لەوەدا، کە دەڵێ: بوون (وجود) لە ماددەی بەرهەست‌و ڕواڵەتەکانیدا کورت هەڵنەهاتوە‌و، وێڕای جەستە، گیان (روح)یش هەیە‌و لەپشت ئەم (کر)ەی بوونەوەرەوە (کردگار)ێك‌و بۆ ئەم کۆشکی جیهانە‌و بنیاتنەر (بنّاء)‌و کارسازێك هەیە، پێك دەگاتەوە، بەکورتی، ئیسلام خاڵی بەهێز‌و ئیجابیی هەردووکیانی لەو بارەوە گرتۆتەخۆی‌و، لە خاڵە بێ هێز‌و بەتاڵەکانیشیان دوورە!

هەروەها لە بواری بیروبڕوا‌و هەڵوێست نواندن، لە بەرانبەر بوون‌و ژیان‌و مرۆڤیشدا، ئیسلام وێڕای جیاوازی بنەڕەتی لەگەڵ سیکۆلاریزمدا بە هەموو باڵ‌و ڕەوتەکانییەوە، بەڵام لە چەند شتێکیشدا پێککگەیشتنی هەیە، بۆ نموونە:

أ- گرنگییدان بە ژیانی دنیا و، هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی‌و بەرەوپێشبردنی‌و چاککردنی‌و، هەرچی زیاتر بەهرە وەرگرتن لە نازو نیعمەتە نەژمێرراوەکانی خوا ﷻ، لەو بارەوە چەندان دەقی قورئان‌و سوننەت هەن، کە خواو

پێغەمبەرەکەی ﷺ نەك هەر ڕێ بە مسوڵمانان دەدەن، بەڵکو فەرمانیشیان پێدەکەن‌و، لە سەریشیان پێویست دەکەن، کە بە زەویدا بڕۆن‌و نهێنییـەکانی بوونەوەر بدۆزنەوەو، بژێو پەیدا بکەن‌و سەرزەوی ئاوەدان بکەنەوە، وەك دواتر لەو بارەوە دەدوێین.

ب- دارنینی پیرۆزی (قدسیة) لە دەستەڵاتی سیاسیی‌و حوکمڕانـەکان و، ڕازی نەبوون‌و مل نەدان بۆ ملـهوڕیی‌و لاف‌و گـەزافیان، وەك: خـۆ بـە سـێبەرو وەکیلی خوا زانین و، خەڵك بە خزمەتکارو بەردەست‌و کۆیلە زانـین و، ڕێـی ڕەخنەگرتن‌و بیروڕای خۆ دەربڕین لە خەڵك گرتن و...هتد.

جـ- پشت بەستن بە عەقڵ‌و تێفکرین‌و هەڵسەنگاندنی، بۆ لە بێژینگدان‌و لـە مەحەکدانی هەموو ئەو دەقانەی، کە بە هی (ئایین) دادەنرێن‌و، هەموو ئەو قسەو باسانەی، کە بە ناوی (ئایین)ەوە دەکرێن، تاکو: خـوایی‌و بەشـەریی‌و ڕاست‌و ناڕاست‌و پاك‌و پیسیان لەیەك جیابکرێتەوە، چونکە -وەك تـۆزێکی دیکە باسی دەکەین- عـەقڵ بناغـەو تـەرازووی وەرگـرتن‌و لێتێگەیشـتنی وەحی‌و (نقل)ەو، هەرگیزیش وەحی ڕاست‌و عەقڵی ساغ تێك ناگیرێن.

ئێستاش با سەرنج بدەین، داخۆ خاڵـە سـەرەکییەکانی پێکگەیشـتن‌و لەیـەك جیابوونەوەی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی، لە بواری فیکرو زانستدا، چی‌و چین؟!

## ١- متمانەو باوەڕ هەبوونی تەواو بە عەقل:

متمانەو باوەڕهەبوون بە عـەقڵ، کە دەتوانێ - تا ڕاددەیـەك- دەرکـی شـتان بکات، خاڵێکی هاوبەشی نێوان ئیسـلام‌و عەلمانییەتـەو، هـەردووکیان لەسـەری کۆکن، جا هەرچی سیکۆلاریزمە، ئەوە ئاشکرایە لە سۆنگەی ئەوەوە، کە بـڕوای بەوە نیە (خوا) سبحانە وتعالى -، ئەگەرهەشبێ- ژیان‌و گوزەرانی مرۆڤـ ڕێـك بخات، بەڵکو دەبێ لەو بارەوە، تەنیاو تەنیا پشت بەخۆی ببەستێ!

لە ڕاستیدائەمە کرۆك‌و کاکڵەی سیکۆلاریزمە، وەك پێشتر باسمان کردو لە: (موسوعة السياسة)شدا لە پێناسەی (عەلمانییەت) دا گوتراوە:

((..هي النظرة الإنسانية (Humanism) التي مجّدت الإنسان كمحور للكون ونظرت إليه على أنَّه سيِّد نفسه وحُرُّ الإرادة، ونادت بالعقلانية (Rationalism) كوسيلة للتنظيم الإجتماعي ولتسخير كافة الإمكانيات لتحقيق حاجات الإنسان وسعادته..))[1].

واتە: ... ئەو تێڕوانینە مرۆڤگەرایەیە، کە مرۆڤی شکۆدار کردوە وەك چەقی بوونەوەرو، وای تەماشا کردوە، کە سەروەری خۆیەتیی‌و ویستێکی ئازادی هەیەو، بانگەشەی بۆ عەقڵگەرایی کردوە، وەك هۆکارێك بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی‌و مەیسەرکردنی سەرجەم توانایەکان بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ‌و بەختەوەرکردنی..

ئنجا باوەڕو متمانە پێکرانی عەقڵیش لە ئیسلامدا، شتێکی ئاشکرایەو مشتومڕ هەڵناگرێ و، خوای کاربەجێ لە دەیان ئایەتدا، مەدح‌و ستایشی عەقڵمەندانی کردوەو، فەرمانی کردوە بە بیرکردنەوەو ڕامان‌و سەرنجدان‌و ڕایگەیاندوە، کە تەنیا مرۆڤە خاوەن عەقڵ‌و هۆشەکان، دەرکی ئایەت‌و نیشانەکانی پەروەردگاریتی خوا دەکەن، لە بوونەوەرو دەوروبەرو لە خودی خۆیشیاندا: * ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ (آل عمران: ١٩٠-١٩١).

* ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ (الذاريات: ٢١-٢٠).

---

(١) ج٤، حرف (ع)، ص١٨٠.

هەروەها ڕوونی کردۆتەوە، کـە تـەنیا ئینسـانە ژیـرو تێگەیشـتووەکان، لـە ئایەتەکانی قورئان حاڵی دەبن‌و لێیان بەهرەمەند دەبن:

* ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ (البقرة: ٢٤٢).

* ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ (ص: ٢٩).

خستوویەتەڕوو، کەبەس خاوەن عەقڵان، پەند لە ڕووداوو کارەساتەکانی مێژوو وەردەگرن:

* ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴾ (طه: ١٢٨).

خوای زاناو توانا لەسەر زمانی دۆزەخییەکان ڕایگەیاندوە، کە هۆکاری چوونە دۆزەخیان بریتی بووە لە بەکارنەهێنانی عەقڵ‌و هۆشیان‌و گوێ نەگرتنیان:

* ﴿وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ (الملك: ١٠).

هەربۆیەش زانایانی ئیسلام گوتوویانە:

(العقل أساس النَّقـل) واتە: عـەقڵ بناغـەی نەقڵە، دیارە مەبەسـتیش لەنـەقڵ وەحی خواودەقەکانی قورئان‌و سوننەتە، بۆیەش وایان گوتـوە، چـونکە: مرۆڤـــ بەهۆی عـەقڵ‌و هۆشەوە، دەستی لە وەحـی گـیر دەبـێ‌و لـە دەقـەکانی قورئـان‌و سوننەت (نَقْـل) تێدەگات، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە دوو بنەڕەتی هەرە گەورەو گرنگی عـەقیدەی ئیسلامیی، کە ناسینی خوا (معرفة الله)و ناسینی پێغەمبەری خوا (معرفة رسـول الله)ن، لەڕێی عـەقڵەوە مسۆگەر دەبن، ئنجا پاش ئـەوەی بەبەڵگـەی عـەقڵیی پتـەوو ڕوون سـەلمێنرا، کـە خوایـەکی بەدیهێنـەرو پەروەردگار هەیەو، وەحی‌و پەیامی بـۆ پێغەمبـەری خـۆی (محمـد) ﷺ ڕەوانـە

کردوه، ئەوجار وەك (أبو حامد الغزالي) گوتوویەتی: عەقڵ خۆی کەنارگیردەکاتو دەست دەکات بە وەرگرتنی فەرمانو قەدەغەکان (الأوامر والنواهي) لە وەحی خواو بڕوادارانە دەڵێ: ﴿..سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ (البقرة: ٢٨٥).

کەواتە: ڕاستە عەقڵ بۆ نەقڵ، دەوری بناغە دەبینێ بۆ دیوارو، هەتا عەقڵ نەبێ وەحیو نەقڵ سوودیان لێ وەرناگیرێ، ئنجا با لەو بارەوە سەرنجی چەند قسەیەکی نەستەقی هەرکام لە:

(راغب الأصفهاني)و (أبوحامد الغزالي) بدەین:

أ- (راغب الأصفهاني) لە کتێبی نایابی خۆی (الذريعة إلى مكارم الشريعة)[1]، دا گوتوویەتی:

((لله ﷻ إلى خلقه رسولان، أحدهما: من الباطن وهو العقل، والثاني: من الظاهر وهو الرسول ﷺ، ولا سبيل لأحدٍ إلى الانتفاع بالرسول الظاهر ما لم يتقدَّمْهُ الإنتفاع بالباطن، فالباطن يعرف صحة دعوى الظاهر، ولولاه لما كانت تلزُم الحجّة بقوله، ولهذا أحال الله من يشَكّكُ في وحدانيَّتِهِ وصحة نبوَّة أنبيائه على العقل، فأمره بأن يفزع إليه في معرفة صِحَّتها، فالعقل قائدٌ والدِّين مَدَدٌ، ولو لم يكن العقل لم يكن الدين باقياً، ولو لم يكن الدين لأصبح العقل حائرا، واجتماعهما كما قال الله تعالى: ﴿نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ﴾ (النور: ٣٥).)).

واتە: خوای بەرزو زاڵ دوو ڕەوانەکراوی بۆلای خەڵکی هەن، یەکیان پەنهانە کە عەقڵەو، دووەمیشیان ئاشکرایە، کە پێغەمبەرە ﷺ، جا هیچ کەس ناتوانێ پێش بەهرە وەرگرتن لە ڕەوانەکراوی پەنهان، بەهرەمەند بێت لە هی ئاشکرا، چونکە ئەوەی پەنهان (عەقڵ) ڕاستیی دەعوای ئەوەی ئاشکرا (وەحی) دەزانێ و، ،ئەگەرئەو نەبوایە تەنیا بە قسەی خۆی بەڵگە لەسەر خەڵکی

---

(١) ص٢٠٧.

دانەدەنرا، هەربۆیەش خوا ئەو کەسەی، کە گومانی هەیە لەبارەی یەکتایی (وحدانیة) خۆیو، ڕاستیی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکانییەوە، حەواڵەی عەقڵ دەکاتەوەو فەرمانی پێکردوە، کە پەنای بەرێتەبەر، تاکو ڕاستییەکەی (واتە ڕاستیی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران -عَلَيْهِم السَّلام-) بزانێ، بۆیە عەقڵ پێشڕەوەو ئاینیش یارمەتیدەر، ئەگەرعەقڵ نەبوایە، ئاین نەدەما، هەروەها،ئەگەرئایینیش نەبوایە، عەقڵ سەرگەردان دەبوو، کۆبوونەوەو پێکەوە هاوکاربوونیشیان ئەوەیە،کەخوای بەرز فەرموویەتی: (ڕووناکی لەسەر ڕووناکییە) (النور: ٣٥).

ب- (أبوحامد الغزالي)یش لەچەند کتێبێکیدا، باسی گەورەییو گرنگی ڕۆڵی عەقڵو چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ وەحیو نەقڵدا کردوە، بۆ نموونە:

١- لە کتێبی (المُسْتَصْفى) دا گوتوویەتی: ((.. العقل هو القاضي الذي لا يُعْزَلُ ولا يُبْدَلُ والشرع هو الشاهد المزكّي المعدَّل))[1]، واتە: عەقڵ ئەو دادوەرەیە، کە نە بەرکەنار دەکرێو نەدەگۆڕرێ و، شەرعیش شایەدێکی تەزکیە کراوو بە دادگەر دانراوە.

٢- لە کتێبی (إحياء علوم الدين)دا گوتوویەتی: ((..فإن العلوم العقلية كالأغذية والعلوم الشرعية كالأدوية..))[2]، واتە: جا بێگومان زانستە عەقڵییەکان وەك خۆراكو، زانستە شەرعییەکانیش، وەك دەرمان وان..

٣- لە کتێبی (معارج القدس)دا گوتوویەتی:

((إعلم أن العقل لن يهتدي إلاّ بالشرع والشرع لم يتبيَّنْ إلاّ بالعقل، فالعقل كالأُسِّ والشرع كالبناء، ولن يُغْنِيَ أسٌّ ما لم يكن بناءٌ، ولن يثبت بناءٌ ما لم يكن أسٌّ، وأيضاً فالعقل كالبصر والشرع كالشعاع، ولن يغني البصر ما لم يكن

---

(١) ج١ ص٣.

(٢) ج٣ ص١٧.

شعاع من الخارج، ولن يغني الشعاعُ ما لم يكن بَصَرٌ، فالشرع عقل من خارجٍ والعقل شرع من داخلٍ، وهما متعاضِدان بل متحِدان))[1].

واتە: بزانە، کە عەقڵ بەبێ شەرع بە ڕێیە نازانێو، شەرعیش بە عەقڵ نەبێ ڕوون نابێتەوە، بۆیە عەقڵ وەك بناغەو، شەرع وەك دیوارە، دیارە بناغەش بەبێ دیوار سوودی نیەو، دیواریش بەبێ بناغە ڕاناوەستێ، دیسان عەقڵ وەك چاوو شەرع وەك ڕووناکی وایە، دیارە بەبێ ڕووناکی دەرەوەش، چاو سوودی نیە، بەبێ چاویش ڕووناکی هیچ دەورێك نابینێ، کەواتە: شەرع عەقڵێکی دەرەکییەو، عەقڵیش شەرعێکی نێوەکییەو، هەردووکیان پشتگیرییەکدین، بگرە هەر یێکەوەن.

کەواتە: ڕێزگرتن لە عەقڵو متمانە پێکردنیو پشت پێبەستنی، خاڵێکی هاوبەشی نێوان ئیسلامو سیکۆلاریزمە، بەڵام ئیسلام لەو بارەوە چەند پلەو ئیمتیازێکی گرنگی بەسەر سیکۆلاریزمدا هەن، بۆ وێنە:

١- ئیسلام بەکارهێنانی عەقڵو بیرکردنەوەیو تێوەڕامانی لە هەردوو کتێبی خوێنراوەو بینراو (مقروء منظور)ی خوا، کە قورئانو بوونەوەرن، بە پێویستییەکی شەرعییو ئەرکێکی ئایینی داناوەو، هەڕەشەی توندی لەو کەسانە کردوە، کە لە عەقڵو هەستەوەرەکانیان بەهرەمەند نابن، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی:

* ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ (محمد: ٢٤)، واتە: ئایا لە قورئانێ وردنابنەوە، یان دڵەکان قفڵیان لەسەرە؟!

* ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴾ (الأعراف: ١٧٩).

(٣) ص٥٧.

واتە: بێگومان خەڵکێکی زۆرمان لە جندو مرۆڤ بۆ دۆزەخی داناوە، کە دڵیان هەیە پێی تێناگەن، چاویان هەیە پێی نابینن ، گوێیان هەیە پێی نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بگرە گومڕاتریشن، ئەوانەن بێ ئاگایان.

* ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴾ (الأعراف:١٨٥).

واتە: ئایا سەرنجی موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەوىو هەرشتێکیان نەداوە، کە خوا دروستی کردوە! ڕەنگە ئەجەلیان نزیك بوویێتەوە، ئەدی دوای ئەم (قورئان)ە، ئیمان بە چ قسەیەك دێنن؟!

٢- ئیسلام وەك چۆن بەکارهێنانی عەقڵو بیرکردنەوەی بە فەرز داناوە، کە بێگومان ئەمە مایەی بەهێزو پێز بوونی عەقڵو گەشەکردنیەتی، لەلایەکی دیکەشەوە هەموو ئەو جۆرە ماددەو خۆراکانەی، کە دەبنە مایەی لابردنی عەقڵو سستو بێهێزکردنی، کە ماددە سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان (المواد المخدِّرة والمسكرة)ن، حەرامو قەدەغەکردوون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (المائدة: ٩٠)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان شەڕاب وقومارو بتەکانو، ئەو شتانەی یانسیبیان پێ دەکرێ، پیسنو لە کردەوەی شەیتانن، دەجا توخنیان مەکەون بەڵکو سەرفراز بن.

شایانی باسیشە سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە بەکارهێنانی ماددە سەرخۆشکەرو عەقڵ لابەرەکان - جگە لە بەنج کردن بۆ کاتی پێویستو ناچار- یەکێکە لە گوناهە زلەکانو، سزاو جەزرەبەی دنیاییو دوارۆژیی لەسەرە.

٣- ئیسلام واقع بینانەو وردبینانە، سەیری عەقڵی کردوە، نەك عاتیفییانـە، بۆیە وەك عەلمانییەت بە تەنیـ جێی نەهێشتوەو وێڵی نەکردوە، بەڵکو وێڕای دەست کردنەوەو ئازادکردنیو هاندانیشـی، کـە هەرچـی لـە دەسـتیدا لـە پەیبردن بەنهێنیو ڕازەکان درێغی نەکات، لـەڕێی وەحییـەوە هاوکاریشـی کردوەو، هەم بە ئەودیو سروشت (میتافیزیك: مـا وراء الطبیعـة) ئاشـنـ ی کردوەو، هەم لە هەموو ئەو بوارانەدا، کە بڕناکاتو توانای نیـە، ڕێنمـایی کردوەو سەرڕاستی کردوە.

ئنجا ئەو ڕێنماییو ئاڕاستەکردنان (توجیهات)ەی، کـە لـە دوو تـوێی وەحیو پەیامی خوادا بۆ مرۆڤـ هاتوە، مـادام نـەگۆڕرابێو دەسـتکاریی نەکرابێ، هەرگیزو هەرگیز ،تەنانەت هێندەی نووکی دەرزیش، لەگەڵ عـەقڵی ساغدا تێك ناگیرێ، زانایانی ئیسلامیش زۆر بە جەخت لەسەرکردنەوە، ئەو ڕاستییەیان ڕاگەیاندوەو، وەك بنچینەیەك گوتوویانە:

((من المحال أن يتعارض النقل الصحيح مـع العقـل الصَّريح))، واتـە: نەگونجاوە، کە نەقڵی ڕاست لـەگەڵ عـەقڵی ساغدا دژ بوەستێ.

(إبن رشد)یش لەو بارەوە کتێبێکی هەیە، بە ناوونیشانی: (فصْل المقال فيما بين الحكمة والشريعة من الإتصال)، هەروەها (إبن تيمية)ش کتێبێکی دە بەرگی لەو بارەوە هەیـە، بـە ناوونیشـانی: (دَرْءُ التعـارض بـين العقـل والنقل).

ئێستاش با سەرنجی خاڵێکی دیکەی هاوبەشـی نێـوان ئیسـلامو سـیکۆلاریزم بدەین لە بواری فیکرو زانستدا:

## ٢- زانیاریی بناغەی کردەوەیەو هەرکارێك بناغەیەکی زانستییانەی نەبێ پووچ و بێ بەرهەمە:

بەڵێ، ئەمیش خاڵێکی دیکـەی هاوبەشـی نێـوان ئیسـلامو عەلمانییەتـە بـە شێوەیەکی گشتیی، هەرچەندە هەنـدێك جـار لـە هەنـدێك بـواردا، لاف لێـدانی (عیلمیی بوون) لەلایەن عـەلمانییەکانـەوە، زیـاتر شـتێکی تیـۆریی (نظـري)یـە، مەبەستم عەلمانییە خۆماڵییەکانمانە!

جا دیارە بۆ تەبەننیکرانی شێوازی زانسـتییانە (الأسـلوب العلمـي)، لەلایـەن تەوژمی لائیكو سیکۆلاریستەوە، پێویستی بـە ڕوونکردنـەوە ناکـاتو تـەوژمی ئیسلامیی ئەو دەعوایەیان بە گشتیی لێ دەسەلمێنێ، بەتایبەت سیکۆلاریستەکانی ڕۆژئاوا، کە واقیعی ژیانو گوزەرانیشان شایەدو بەڵگەی ئیسپاتی دەعوایەکەیانە!

بەڵام ئەوەی پێویستە لەو بارەوە تیشکی بخرێتەسـەر، ئـەو هەڵـە بـاوو ڕەواج پێدراوەیە، کە لەمێشکی زۆرکەسدا چەسپیوە، ئەویش ئەوەیە،کەهەنـدێك کـەس پێی وایە وشەی سیکۆلاریزم (Secularism) پەیوەندی بە زانیارییـەوە هەیـەو بـە مانای زانستگەرایی (العِلْمية) دێ! بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ئـەوە هەڵەیـەو، وشـەی (Secularism) هیچ پەیوەندی بە زانستو زانیارییەوە نیە، چونکە:

زانیـاریی (عِلـم) لـە زمـانی ئینگلیـزیو فەڕەنسیشـدا، وشـەی سـاینس (Seience)ی بۆ بـەکاردێو، لـە ئینگلیزیـدا زانسـتگەرایی (المذهب العلمـي)و زانسـتێتی (العلميـة)ش دەبێتـە: سـاینتیزم (Scientism)و (Scientific)، بـە فەڕەنسیش دەبێتە: (Scientifique)، جا دیارە کاتی خـۆی، وشـەکە لـە زمـانی عەرەبیدا بە (العَلمانية) وەرگێڕراوە، کە ئەویش لە ئەسڵ دا (العالمانيـة) بـووەو، دواتر ئەلفەکەی گۆڕراوە بە (سەر) (فتحة)، تاکو لەسەر زمان سووکتر بێت، بەڵام هەندێك لە عـەلمانییەکان بە نەزانیی، یان زۆرزانیی، وشەکەیان لەجیاتی (عَلْماني: عـەلمانیی) بە (عِلْماني: عیلمـانیی) بێـژتوە، بـۆ ئـەوەی وابزانـرێ، کـە وشـەکە پەیوەندی بە زانیارییو زانستەوە هەیە!

بەڵام لە ڕاستیدا، وشەکە هیچ پەیوەندی بە زانیاریی‌و زانستەوە نیەو، مانای ڕاستەقینەو ئەسڵیشی بریتیە لە: دنیاگەرایی (الدنیویة)، یان: بێ دینایەتی (اللادینیة)، بەڵگەشمان وێڕای مانای زمانەوانیی وشەی (Secularism)، ئەوەیە،کەسەرجەم فەرهەنگەکانی زمان - وەك ئاماژەمان پێداوە- لە ماناو تەرجەمەو پێناسەکردنی سیکۆلاریزمدا ئەوەیان گوتوە، کە ئێمە خستمانەڕوو، بۆ نموونە: (دائرة المعارف البریطانیة) لەو بارەوە گوتوویەتی:

(Secularism) جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتییە، دەیەوێ خەڵك لە گرنگیدان بە دوارۆژەوە لابداو، بەرەو بایەخدان تەنیا بەم ژیانە دنیاییە ئاراستەیان بکات، ئەویش لەبەر ئەوەی،کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، خەڵکی ئارەزوویەکی توندیان هەبوو بۆ پشت لەدنیاکردن‌و تێوەرامانی خواو ڕۆژی دوایی، جا بۆ بەرهەڵستی کردنی ئەم ئارەزووە، سیکۆلاریزم دەستی کرد بە خۆڕانواندن لە میانەی گەشەپێدانی هەستی مرۆڤگەراییدا، ئیدی خەڵکی لە سەردەمی ڕاپەڕین (ڕێنسانس)ەوە دەستیانکرد بە دەرخستنی پەیوەست بوونی زۆر بەبەرهەمە کلتووریی‌و بەشەرییەکان و، بەگوێجاو زانینی هێنانەدی ئاواتەکانیان لەم ژیانە نزیکەدا، بەردەوام ڕووکردنە سیکۆلاریزم گەشەی کرد بەدرێژایی مێژووی نوێ، وەك جووڵانەوەیەکی دژی ئایین‌و دژی مەسیحییەت.))[1].

ئێستاش، با سەرنجێك بدەینە هەڵوێستی ئیسلام‌و تەوژمی ئیسلامیی، لە بارەی گرنگیی‌و بایەخدان بە زانیاریی‌و زانستەوە:

سەرەتا دەڵێین: ئەو کێشەو مشتومڕەی، کە کاتی خۆی لە ڕۆژئاوا لەنێوان نەصرانییەت‌و زانستدا ڕوویداوە، هەرگیز لە مێژووی ئیسلام‌و مسوڵمانانندا نەبووە، چونکە قورئانی ئیسلام بە پێچەوانەی پەیمانی کۆن‌و نوێی ئایینی شێوێنراوی نەصرانییەوە، فەرمایشتی دەستکاریی نەکراویی خوایەو، هیچ کاتێکیش وەحی و (نقل)ی ڕاست لەگەڵ عەقڵ‌و زانیاریی ساغ‌و تەواودا تێك نەگیراوەو تێکیش

---

(١) بڕوانە: (التطرف العلماني في مواجهة الإسلام) د. یوسف القرضاوي، ص١٤، ط٢/٢٠٠٦.

ناگیریٚ، ئاخر چۆن وەحی‌و فەرمایشتی خوا، کە لە زانیاری بـیٚ سـنووری خـواوە هەڵقوڵیوە، لەگەڵ زانیـاریی ڕاسـت (العلم الصحیح)دا نـاکۆك دەبـیٚ، مەگـەر (زانیاریی) جگە لە وەسـفی ڕاسـت‌و دروسـتی دروسـتکراوەکانی خـوا، شـتێکی دیکەیە؟! ئاشکراشە،کەخوای بەرزو مـەزن (قسـەو کـردەوە)ی دژو پێچـەوانەی یەکدی نین!

پاشان دەڵێین:

١- یەکەمین وشەی یەکەمین ئایەتی یەکەمین سوورەتی قورئانی بـەڕێز، کـە بـۆ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دابەزیوە، بریتیە لە، بخوێنـە (إقـرأ): ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾ (العلق: ١).

٢- یەکەمین وشەی دووەمین سوورەت، بریتیە لـە سـوێند خـواردن بـە قەڵـەم‌و ئەوەی،کە پێی دەنووسریٚ: ﴿نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ (القلم: ١).

٣- خوا ﷻ زانابوونی ئادەم عليه السلام بە ناوەکانی کردۆتە بەڵگەو پاساوی بوونی بە جێنشینی خواو، کڕنووش بردنی فریشتەکان بۆی: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١ ... وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ ...﴾ (البقرة: ٣٠-٣١-٣٤).

٤- خـوای زانـا ﷻ خسـتوویەتەڕوو، کـە -وەك گـوتراوە: قـەدری زێـڕ لـەلای زێڕنگـەرە- ئەوانـەی، کـە زانـاو شـارەزان دان بـە ڕاسـتێتی قورئـانو ئیسـلامدادێنن: ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ (سبأ: ٦)، واتە: ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، دەزانن، کە ئەوەی بۆ لای تۆ نێرراوەتـە خـوار، هـەقی موتڵەقـەو ڕێنمـایی (خەڵك)یش دەکات بەرەو ڕێبازی (خوای) زاڵی ستایشکراو.

٥- خوا ﷻ هەمیشە لەكاتی دواندنی نەیارو ناحەزانی پێغەمبەرەكانیو ئایینەكەیدا، داوایان لێدەكات،كە بە بەڵگەوە قسە بكەنو لەسەر بناغەی زانست هەنگاو بنێنو شێوازی زانستییانە ڕەچاو بكەن:

بۆ نموونە:

١- ﴿..أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ (النمل: ٦٤)، واتە: لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراو هەن؟ بڵێ: ئەگەر ڕاست دەكەن بەڵگەتان بێنن.

٢- ﴿..نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ (الأنعام: ١٤٣)، واتە: ،ئەگەر ڕاست دەكەن، بە زانیارییەوە هەواڵم بدەنێ.

٣- ﴿..قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ..﴾ (الأنعام: ١٤٨)، واتە: بڵێ: ئایا هیچ زانیارییەكتان هەیە پیشانمان بدەن؟

٤- ﴿..ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ (الأحقاف: ٤)، واتە: كتێبێكی پێش ئەمە، یان پاشماوەیەك لە زانیاریم بۆ بێنن،ئەگەر ڕاست دەكەن.

٦- لە چەندان شوێنی قورئانێدا كەوتنە شوێن گومانو لاسایی كردنەوەی كوێرانەی پێشینان، مەحكووم كراوەو سەرزەنشتی نەیارو ناحەزانی پێغەمبەرانی خوا ﷺ ی لەسەر كراوە، بۆ نموونە:

١- ﴿..إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾ (الأنعام: ١٤٨)، واتە: ئێوە بەس شوێن گومان دەكەونو تەنیا درۆ دەكەن!

٢- ﴿..إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾ (النجم: ٢٨)، واتە: تەنیا شوێن گومان كەوتوون، بێگومان گومانیش، هیچ جێی هەق ناگرێو قەرەبووی كەلێنی ناكاتەوە.

٣- ﴿أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ﴾ (الزخرف: ٢١-٢٢)، واتە:

ئایا پێش ئەو (قورئان)ە کتێبێکمان داونیٚ، کـە دەسـتیان پێوەگرتبـیٚ! بەڵکو گوتیان: ئێمە بابو باپیرانمان لەسەر ڕێبازێك بینیـوەو، هـەر بـە شوێنەواری ئەوانیشدا دەچین.

٧- خوای بەرزو مەزن لە چەندان ئایەتدا فەرمانی بە بەندەکانی کردوە، کـە لـە خۆیانو دەوروبەرو بوونـەوەر ڕابمێـنن‌و بـە زەویـدا گەشـتو سـەفەر بکـەنو وردبنەوەو سەرنج بدەنو پەندو عیبرەت وەربگرن، بۆ نموونە:

١- سەرنجی خۆدان: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾ (الطارق: ٥).

٢- سەرنج دانی خواردنو خۆراك: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴾ (عبس: ٢٤).

٣- سەرنج دانی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان: ﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾... أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾... أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ (الواقعة: ٦٣-٦٨-٧١).

٤- سەرنجدانی بوونەوەر بە گشـتیی‌و، هـەر دروسـتکراوێك بـە تایبـەت: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴾ (الأعراف: ١٨٥).

٥- سەرنج دانی چۆنیەتی دروسـتبوونی دروسـتکراوەکان: ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ .. ﴾ (العنكبوت: ٢٠).

٦- گەشتو گەڕان بە زەویداو سەرنجدانی شوێنەوارەکانی گەلانی ڕابردوو: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ !﴾ (الروم:٩).

دیارە هەر ئەو ئاڕاستانەی کتێبی خواش هۆکاری ئەوەبوون، کـە زانایـانی ئیسلام، وێـڕای زانیارییـە شـەرعییەکان، گرنگیـی‌و بایـەخی تـەواویش بـە زانستەکانی دیکە بدەن، کە زادەو بەرهەمی عەقڵو ئەزموونن، بۆنموونە:

(إبن رشد الحفيد) کە بە گەورەترین ڕاڤەکەری فەلسەفەی ئەرِستۆ دادەنریٚ، هاوکات لەگەڵ نووسینی کتێبی (بداية المجتهد ونهاية المقتصد) لە شەرعزانیی (فقه)دا کتێبی: (الكليات)یش لە پزیشکی گەریی (طب)دا نووسیوە!

(محمد بن أبي بكر الخوارزمي) داهێنەری زانیاریی جەبر (علم الجبر) یەکێك بووە لە شەرعزانە زەبردەستەکانیشو، زانیاریی جەبری بۆ حەل کردنی هەندێك گرفتو کێشەی فیقهی داهێناوە!

(فخر الدين الرازي) خاوەنی تەفسیری گەورە (التفسير الكبير)، وێڕای شارەزایی زۆری لە تەفسیرو عەقیدەو (فقه) و(أصول فقه)دا پزیشك (طبیب)ێکی ناوداریش بووە![1]

(إبن النفيس)ی دۆزەرەوەی سووڕی گچکەی خوێن (الدورة الدموية الصغرى) لە ڕیزی شەرعزانان (فقهاء)یشدا ژمێرراوەو، (تاج الدين بن السُّبكي) لە کتێبی (طبقات الشافعية)دا ناوی هێناوە!

هەروەها هەرکام لە (أبوحامد الغزالي) و(إبن الجوزي) و(إبن القيِّم)و (إبن تيمية) و(إبن خلدون)، وێڕای شارەزاییو پسپۆڕیی زۆریان لە قورئانو سوننەتو زانستە شەرعییەکاندا، لە بواری زانستە عەقڵییەکانیشدا زۆر شارەزا بوون، بە تایبەت لە بواری سیاسییو کۆمەڵناسییو دەروونناسییو مێژوودا، وەك لە بەرهەمو کتێبەکانیاندا دیارە.

بەڵام لە کۆتایی ئەم بابەتەدا، پێویستە ئاماژە بە ڕاستییەکی گرنگ بکەین ئەویش ئەوەیە کە:

چەمكو واتای وشەی زانیاریی (علم)و زانست (معرفة) لە ئیسلامدا فراوانترە وەك لە عەلمانییەتدا، چونکە زانیارییو زانست لە ئیسلامدا، وێڕای ئەو شارەزاییو زانراوانەی، کە مرۆڤ لە ڕێی عەقڵو ئەزموونەوە وەدەستیان دێنێ، ئەو زانیارییو زانستە ڕاستو بێ خەڵەتیەش دەگرێتەوە، کە خوا ﷻ لەڕێی وەحیو

[1] نووسەرێکی سەرکێڵی سیکۆلاریست وای زانیبوو، کە من (الرازی)ی (طبیب) و (الرازی) (مفسّر)م لێ تێکەڵ بوون، بەڵام گرفتی ئەو جۆرە کەسانە کەم شارەزایی یە، چونکە هەردووك (رازی)یەکان (طبیب) بوون!

پەیامی خۆیـەوە بـۆ پێغەمبـەرانی - عَلَيْهِمِ السَّلام - نـاردوە، لـە باسـەکانی داهاتووشدا، تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیە.

## ٣- عەقڵ و زانست دوو ڕێی گرنگی وەدەستهێنانی زانیاریین:

ئەمیش یـەکی دیکەیـە لەخاڵـەکانی پێکگەیشـتنی ئیسـلام و سـیکۆلاریزم لەبواری فیکرو زانستدا، جا دیارە پشت بەستنی سیکۆلاریزم بەهەرکام لەعەقڵ و پێنج هەستەکان بۆ وەدەستهێنانی زانیاریی و زانست شتێکی ڕوونە و، بۆ زانینی هەڵوێستی ئیسلامیش لەو بارەوە، با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

١- ﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ (النحل: ٧٨).

واتە: خوا لە سکی دایکتان دەری هێناون لـە حاڵێکـدا، کـە هیچـتان نەدەزانی، بیستن‌و دیتن‌و عـەقڵی پێتاندا، بەڵکو سوپاسگوزار بن.

لەم ئایەتەوە زۆر بە ڕوونیی دەردەکەوێ، کە عـەقڵ‌و هەستەوەرەکان، بە تایبەت بیستن‌و دیتن، هۆکاری وەدەست هێنـ نی زانیاریی‌و زانستن‌و، بـەبێ عـەقڵ‌و هەستەوەرەکانیش، هەرگیز ناگونجێ مرۆڤــ دەستی لە زانیاریی گیر بێ.

٢- ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٦).

واتە: شوێن شتێك مەکەوە، کە لە بارەیەوە زانیارییت نیــە، بێگومـان بیسـتن‌و دیتن‌و عـەقڵ، هەرکامێکیان لێی دەپرسرێتـەوە.

ئەم ئایەتەش بە ڕوونیی لێی دەفامرێتەوە، کە بیستن‌و دیـتن‌و عــەقڵ، هۆکاری وەدەستهێنانی زانیاریین، هەر بۆیــەش کەسـێك خـاوەنی بیسـتن‌و دیتن‌و عەقڵ بێت، نابێ بەبێ شارەزایی، ملی هیچ ڕێیەك بگرێ‌و، ئەگـەر وابکات لێی قبووڵ ناکرێ.

## ٤- شێوازی زانستییانە چی یەو چۆنە؟!

گەلێك جار لە زۆر کەس - بەتایبەت عەلمانییەکان – دەبیسترێ، کە باسی شێوازی زانستییانە (الأسلوب العلمي)دەکرێو، خۆیان بەوە هەڵدەدەنەوە، کە ئەوان خاوەنی ئەو شێوازەن لە قسەو وتارو هەڵوێستو ڕەفتاریاندا.

جا بێگومان لاف لێدانو دەعواکردن ئاسانە، بەڵام ئیسپاتکردنی بە زەحمەتەو، قسەی بێ بەڵگەودەعوای بێ ئیسپاتکردنیش، وەك پارەی تەزویر، نەك هەر دادی خاوەنەکەی نادات، بەڵکو دەبێتە مایەی عەیبداریی‌و شەرمەزارییشی.

جا بەهەرحاڵ، ڕەچاوکردنو پەیڕەوکردنی شێوازی زانستیی نە -،ئەگەربەڕاست بێتو تەنیا قسەو لاف لێدان نەبێ- خاڵێکی دیکەی نێوان تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانییەو بابای ئیسلامیی، خوا ﷻ وەك ئەرکێکی شەرعیی لەسەری پێویست کردوە، کە لە هیچ قسەو کردەوەیەکیدا، بەبێ بەرچاوڕوونیی هەنگاو نەنێ و، لەبەر ڕۆشنایی زانیارییدا نەبێ، هیچ نەکات، چونکە جێگرەوە (بديل)ی زانیاریی (علم) تەنیا نەزانین (جهل)ەو، هەر شتێکیش لەسەر بناغەی نەزانیی بنیات بنرێ، زوو هەرەس دێنێو بنەتۆوی خۆیشی ناکاتەوە!

ئەوەتا خوای کاربەجێو زانا، فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی‌و بە هەر مسوڵمانێکیش کردوە، کە بەبێ زانیاریی‌و بەرچاو ڕوونیی شوێن شت نەکەوێ: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٦)، دیارە بۆیەش پاش قەدەغەکردنی شوێنکەوتنی شت، بەبێ زانیاریی، باسی بەرپرسیارێتی مرۆڤی کردوە، لە بەرانبەر بیستنو دیتنو عەقڵدا، چونکە بیستنو دیتنو عەقڵ، ئامرازی وەدەستهێنانی زانیاریی‌و شارەزایینو، مرۆڤ بە هۆیانەوە لە نەزانیی‌و بێ ئاگایی قوتار دەبێ.

ئنجا نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو خوای پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی (محمد) ﷺ و، هەر مسوڵمانێکی شوێنکەوتووشی کردوە، کە

بەردەوام لە هــەوڵی زێـدەكردنی زانیـاریی‌و زانسـتدا بێـت و، لـە پـەروەردگاری بپارێتەوە، كە بۆی زیاد بكات: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ (طـه: ١١٤).

پێغەمبەریش ﷺ داواكردنی زانست‌و بەدوای زانیاریدا گەرانی بە فەرز زانیوە لەسەر هەموو مسوڵمانێك، وەك فەرموویـەتی: {طلـب العلـم فريضـة علـى كـل مسلمٍ} (رواه ابن ماجه عن أنس رضي الله عنه).

بەڵێ، هەڵوێستی بەرنامەی ڕاستی خوای بـەرزو مــەزن لـەبارەی زانیـاریی‌و زانست‌و ڕەچاوكردنی شێوازی زانستییانە لە هەموو هەڵس‌و كەوتێكدا، شـتێكی ڕوون‌و بێ چەندو چوونە، بەڵام گرنگ ئەوەیە:

یەكەم: بە ڕاست‌و دروستی لە چەمك‌و واتای شێوازی زانستییانە حـاڵی بـین.
دووەم: بە كردەوەش بە شـێوازی زانسـتییانەوە پابەنـد بـین‌و، تـەنیا بـە قســەو بانگەشەی ڕووت لێی نەگەڕێین!

شایانی باسیشە،كەشێوازی زانستییانە، چەند مەرج‌و نیشانەیەكی هــەن، كــە دەتوانین بڵێین: ئەم حەوتە، سەرەكییەكانی نن:

١- تێــڕوانین‌و هـــەڵس‌و كـــەوت كردنـــی بابەتییانــە، لەگـــەڵ خـــەڵك‌و قســـەو هەڵوێستەكانیانداو تێكەڵ نەكردنی خودو بابــەت (الـذات والموضـوع)، وەك: (علي بن أبي طالب) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: {لا تعرف الحق بالرجـال، إعْرف الحق تعرف رجاله} ، واتە: هەق بەهۆی پیاوانەوە مەناسە، هــەق خــۆی بناسە پیاوەكانیشی دەناسی.

٢- ڕێزگرتن لە پسـپۆڕییەكان، وەك خــوا فەرموویــەتی: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (النحل: ٤٣)، واتە: جـا، ئەگــەرنازانن لــە زانایــان بپرســن، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ (فـاطر: ١٤)، واتـە: هیچ كــەس وەك بابای شارەزا هەواڵت پێنادات.

بەڵێ، پێویستە هەموو لایەکمان دان بەوەدا بنێین، کە ئەوەی هەموو شتێك دەزانێ‌و هەموو شتێك دەتوانێ‌و بە هەموو شتێك شارەزایە، تەنیاو تەنیا خوایەو، کەسێکیش، کە خۆی بۆ شارەزایی لە شتێکدا تەرخان دەکات‌و پسپۆڕیی تێدا پەیدا دەکات، وەك ئەوە نیە، کە بە عاستەم سەرەدەرەییەکی لێ دەکات.

٣- هەبوونی تواناو بوێریی ڕەخنە لە خۆگرتن‌و دان بە هەڵەی خۆ داهێنان‌و پەند وەرگرتن لە هەڵەو هەڵەنگوتنەکان و، خۆ بە لە هەڵە پارێزراو (معصوم) نەزانین، پێغەمبەریش ﷺ جوانی فەرمووە: {الكيِّسُ من دانَ نفسهُ وعمل لما بعد الموت..} (رواه أحمد والترمذي).

واتە: وریا کەسێکە، کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی بکات بۆ پاش مردن کار بکات..

٤- بەهرەمەند بوون لە نوێترین ئامڕازو کاریگەرترینی بۆ گەیشتنە ئامانج‌و سوود وەرگرتن لە ئەزموونی خەڵکی، وەك پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: {الحكمة ضالّة المؤمن فحيثما وجدها فهو أحق بها} (رواه الترمذي)، واتە: زانیاریی‌و دانایی، ونبووی بڕوادارەو لەهەر کوێیەك بیدۆزێتەوە، لە هەموو کەس پێی شایستەترە، بێگومانیش هەق‌و ڕاستیی لە خۆدا کورت هەڵهێنان‌و لە هەموو شتێکدا خۆ پێ ڕاست‌و بەرانبەر پێ هەڵە بوون، گەورەترین کۆسپ‌و تاستەنگی عەقڵی خۆ دەوڵەمەند کردنە، بە عەقڵ‌و ئەزموونی خەڵکی!

٥- زانست بەگشتیی سێ جۆرە: هەواڵ (الخبر)و، ئەنجامگیریی عەقڵیی (الإستنتاج العقلي)و، بەرهەمی ئەزموون (ثمرة التجربة)، شایانی باسیشە پێوەرو تەرازووی هەڵسەنگاندنی هەواڵ، ساغکردنەوەی زنجیرەی گێڕەرەوەکان (سلسلة الرواة)ی و، هی ئەنجامگیریی عەقڵیی، بەڵگەی مەنتیقییە و، هی

بەرهەمی ئەزموونیش، تاقیکردنەوەی کردەییە، بۆیەش خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ (النحل: ٧٨)، چونکە: بە بیستن هەواڵ وەردەگیرێ و، بە دیتن ئەزموون ئەنجام دەدرێ و، بە عەقڵیش ئەنجامگیریی دەکرێ.

٦- لێکۆڵینەوەی وردو قووڵو شیێنەییو پەلە نەکردن لە بڕیار دەرکردنو هەڵوێست نواندنداو، پەنابردنە بەر تێوەڕامانو سەرژمێر (الإستقراء والإحصاء)و ساغکردنەوەو ڕوونکردنەوەی تەواو، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ... ﴾ (النساء: ٩٤).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات لە پێناوی خوادا سەفەرتان کرد، شت ڕوون بکەنەوە..

٧- ڕێزو تەقدیر پێشاندان بۆ دیدو بۆچوونە جیاوازەکان لەو مەسەلانەدا، کە ڕاجیایی (إختلاف) هەڵدەگرنو جێگای مشتومڕو قسەو باسن، وەك شافیعی خوالێی خۆشبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: {رأيي صوابٌ يحتمل الخطأ ورأي غيري خطأ يحتمل الصَّواب}، واتە: بۆچوونی خۆمم پێ ڕاستە، بەڵام دەگونجێ هەڵە بێو، بۆچوونی ئەوی دیکەشم پێ هەڵەیەو، دەشگونجێ ڕاست بێ[(١)].

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز! ئەم حەوت مەرجو نیشانەیە بۆ شێوازی زانستییانە پێویستنو، لەبەر ڕۆشنایی ئەم پێناسەیەشدا بۆ شێوازی زانستییانە، دەتوانین بەڕاشکاویی بڵێین:

---

(١) بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لە کتێبی (التطرف العلماني في مواجهة الإسلام)ی د. یوسف القرضاوي ص٦٢، ط٢/٢٠٠٦، وەرگرتوە.

بابایەكی عەلمانیی - هەروەها هەمان شت بۆ بابەیەكی ئیسلامییش هەروایە- كە لەكاتی قسەكردنی لەسەر ئیسلامو ڕەخنە لێگرتنیدا، لەجیاتی دەقەكانی قورئانو سوننەت، دێنێ ڕەخنە لە هەڵسو كەوتو واقیعی مسوڵمانانو ئیسلامییەكان دەگرێو، بابەتی ئیسلامو خودی شوێنكەوتوانی تێكەڵ دەكات، ئەگەرگریمان ڕەخنەكەشی ڕاستو بەجێ بێ، شێوازێكی نازانستییانەی ڕەچاو كردوە، هەرچەندە بە قسە لافی زانیاریگەریی لێبدات!

هەروەها كاتێك بابایەكی سیكۆلاریست، دێت بە بیانووی ئەوە، كە ئایینی خوا موڵكی هیچ كەس نیەو، هی هەموو لایەكە - كە ئەمەش قسەیەكی ڕاستە- بێ ئەوەی هیچ شارەزاییەكی لەبارەی قورئانو سوننەتەوە هەبێ، كە ئیسلامیان تێیدا بەرجەستەو كورت هەڵاتوویە، بە كەیفی خۆی لە بارەی ئیسلامەوە قسەدەكات، شێوازێكی نازانستیی نەو نامەنتیقییانەی گرتۆتەبەر! چونكە بەڵێ، ڕاستە زانیاریی‌و شارەزایی بە ئیسلام لەسەر هیچ كەس تاپۆ نەكراوەو، هی هەموو مرۆڤەكانە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە، كە زاناو نەزانو شارەزاو ناشێ، لەڕووی قسەكردنەوە وەك یەكن، ئایا هەر لەبەر ئەوەی هەموومان پشكو بەشمان بە پزیشكی گەریی (طب)و زانیاری ساغلەمییەوە هەیە، مانای وایە پزیشكێكو جوتیارێك یەكسانن لەو بارەوە؟!

بەڵام حەیفێ، سیكۆلاریستەكان كوشتەی دەردی: قیاسی ( كەشكێ لە مەشكێ كردن)ن و، پێیان وایە وەك چۆن چینی ئەكلیرۆسو پاپاو قەشەكانی نەصرانییەت، تێگەیشتنی كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس)و خەمخواردن لە ئایینیان لەسەر خۆیان تاپۆ كردبوو ، ڕێی ،تەنانەت موتاڵاكردنی كتێبی پیرۆزیشیان لە خەڵك گرتبوو، شتێكی لەو بابەتەش لە ئیسلامدا هەیە، جا ئەوەی قورەكەی بۆ ئەو تێڕوانینە هەڵەو ناواقیعییە خەستتر كردۆتەوە، دوو شتە:

یەكەم: نەشارەزاییان لە قورئانو سوننەت.

دووەم: بەدبینیی و بەدگومانییان بەرامبەر بە ئیسلام و مسـوڵمانان و، لەپشـت پەردەی ڕەشەوە سەیرکردنیان!

هەروەها سەرجەم مەرج و نیشانەکانی دیکەش، کاتێك کە فەرامۆش دەکرێن و ڕەچاو ناکرێن بـە ئەنـدازەی فەرامۆشـکرانیان، کـەلێن و بۆشـایی بـەجێ دێڵـن و سیفەتی: (زانستیی بوون) لە شێوازی بابای قسـەکەر، یـان نووسـەر دەسـڕنەوە، ئیسلامیی بێ، یان عەلمانیی.

## ٥- خوای موتڵەق و مرۆڤـی سنووردار:

لـە بەڵگەنەویسـتەکان (بـدیهات)ی خواناسـیی (معرفـة الله) ئەوەیە،کـەخوا سبحانه وتعالى، خاوەنی بوونی ڕەها (الوجود المطلـق) و بێ سنوورو، هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو پەسندی ڕەهاو بێ سنوورە، چونکە بوونی خـوا ﷻ، بـوونێکی خودیی (وجود ذاتـي) یە، بەپێچەوانەی سەرجەم بوونەوەرو کائیناتەوە، کە بوونی یەکە یەکەیان و هەمووشیان وێکڕا، بوونێکی خوازراوو بەخشراو (وجـود مسـتعارٌ وموهوب)ە و بوونێکی سنووردار (محدود)یشە، هەروەها سیفەتەکانیشیان بە هەمان شێوە لە قەدەر بوونەکەیانن، کە دەتوانین بۆ وەنزیکخستن لە عـەقڵ، ئـەم وێنەیـە بێنینەوە:

ژمارەی هەزار (١٠٠٠)، کە سێ سفری لەلای ڕاستەوە ڕیزکراون، پرسیار لـە هەرکام لە سفر(٠)ەکان بکرێ، کە ئایا ئەو بەها ژمارەیی(القيمة العددية)یەت لە کوێوە هێناوە؟ بێگومان حەواڵەی دوای خۆیت دەکات و ناتوانێ بڵێ: هی خۆمـە، چونکە سفر، سفرەو، خاوەنی بوونێکی خودیی نیەو،ئەگەربەتەنیا بێت، نەك یەك سفر، بەڵکو هەزاران سفریش هەر هیچن، بەڵام ژمارەی یەك (١) چونکە خاوەنی بوونێکی سەربەخۆو خودیی (وجود مستقل وذاتي)یە وێـڕای ئەوەی،کـە خـاوەنی بوونێکی سەربەخۆو خودییە، بەبەڵگەی ئەوە، کە ئەگەربە تـەنیاش بـێ، بـەهـ ژمارەییەکەی هەر هەیەو، یەکی لەسەر غەیری خۆی نەکەوتوە، سەربارەش تواز ی

بەخشینی بوونی بە غەیری خۆیشی هەیەو، دوای ئەوەی سفرەکان لەلای ڕاستییەوە ڕیز دەبن، بەهاداریان دەکات، جا چ سێ بن چ هەزاران!

خوای پەروەردگاریش ﷻ (ولله المثل الأعلى) بە هەمان شێوە، چونکە خاوەنی بوونێکی سەربەخۆو خودییە، بوونەکەی پەیوەست نیە بە غەیری خۆیەوەو تێکڕای دروستکراوەکانیشی لە بوون بەهرەمەند کردوە.

ئنجا وەك چۆن سیفەتەکانی هەرکام لە دروستکراوەکان، لەقەدەر بوونە خوازراوو سنووردارەکەیانن و، کەمو گچکەو سنووردارن، بە هەمان شێوە بە باری پێچەوانەدا، سیفەتەکانی خواش ﷻ لەقەدەر ئەو بوونە سەربەخۆو خودییو ڕەهاییەینیو بێ سنوورن، بۆ نموونە: خوا هەر شتێکی بوێ دەیکاتو، هیچی لەبەر عاسێ نابێ: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ (البروج: ١٦).

هەموو شتێك دەزانێ: ﴿..وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٩).

هەموو شتێك دەتوانێ: ﴿..وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا﴾ (الأحزاب: ٢٧).

بەزەیی خوا هەموو شتێکی گرتۆتەوە: ﴿..وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ..﴾ (الأعراف: ١٥٦).

بەڵام ویستو تواناو زانیاریو بەزەیی و...هتدی دروستکراوەکان سنووردارنو، بە هەندێك شت ڕادەگەنو، بە زۆربەی هەرەزۆری شتان ڕاناگەن.

جا خوێنەری سەنگین!

مەبەستم لە خستنەڕووی ئەوەی ڕابرد ئەوەیە، کە:

شتێکی ئاساییو مەنتیقیو چاوەڕوانکراوە بۆ هەرکەسێك، کە خوا بناسێو ئیمانی پێی هەبێ، دڵنیا بێ لەوەی، کە ئایینو بەرنامەیەك، خوا بۆ ڕێنمایی ئینسانو ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانی ناردبێتی، دەبێ کاملو تێرو تەواو بێتو هێندەی گەردیلەیەك هەڵەو پەڵەی تێدا نەبێ و، ئەو ئامانجو مەبەستەی، کە خوا ﷻ بۆ هێنانەدیی ناردوویەتی، کە ڕێنماییکردنی ئینسانو ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانە: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ..﴾ (الفتح: ٢٨)، (التوبة: ٣٣)،

(الصف: ٩)، بتوانیٚ بە چاکترین شێوە بیهێنێتەدی، بە پێچەوانەوە شتێکی یەکجار نامەنتیقیو بیٚ جێیە، کەسێك خوابناسیٚ، کەچی،تەنانەت گومانیشی هەبیٚ لـەو ڕاستییەدا، کە باسمانکرد!

کەواتە: کەسێك خۆی بە خواناسو مسوڵمان دابنیٚ، کەچی ئـاینو بەرنامـەی خوا هەمووی، یان بەشێکی لیٚ ڕەفز بکات و، ڕەخنەی لێی هەبیٚ، سەرەڕای کافر بوون، خۆیشی گیرۆدەی هەڵوێستێکی نامـەنتیقیو پێکـەوە نـاکۆك (متنـاقض) کردوە، جا بەڵگەی کافربوونەکەی زۆر شتە، بۆ نموونە: ئـەم فەرمایشـتەی خـوا: ﴿...أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ..﴾(البقرة:٨٥)، دیارە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ لە سیاقی چەند ئایەتێکدا هاتوە، کە دەربارەی جوولەکـەکانو پابەنـدییان بـە بەشـێك لـە کتێبـی خـواو لاملییان لە بەشێکی دەدوێن، کەواتە: هەرکەسێك بەشێك لە کتێبی خـوا ڕەفـز بکات، وەبەر هەمان حوکم دەکەویٚ.

بەڵگەی پێکەوە دژ (متنـاقض) بوونی هەڵوێستەکەیشی زۆر ڕوونە، چونکە: ئەو لەسەرێکەوە لافی خواناسییو ئیمان بە خوا لێدەدات و، لە سەرێکی دیکەشـەوە ڕەخنە لە ئاینو بەرنامەکەی دەگریٚ و، بە هەڵەی لە قەڵـەم دەدات! دیـارە ئـەم دووشتەش دژو پێچەوانەی یەکنو پێکەوە ناکۆکن.

ئنجا ڕەنگە لێرەدا دوو پرسیار لە دڵو مێشکی هەندێك کەسـدا سـەرەتاتکە بکەن:

یەکەم: مادام پابەندیی بە شێوازی زانستییانەوە پێویستە، ئـەدی کـوا بـە شێوازێکی زانستییانە ئەو ئەنجامگیرییە کرا، کە خرایەڕوو؟!

دووەم: ئایا لە حاڵێکدا، کە ژیانی مرۆڤـ بەردەوام لـە گۆڕانکـاریی (تطـوّر) دایەو، ئایینیش شتێکی چەسپاوو نەگۆڕە، چـۆن چـۆنی ئـایینی وەسـتاو فریـای ژیانێکی هەمیشە جوڵاوو گۆڕاو دەکەویٚ؟!

جا ئێمە ئەم پرسیارەی دووەمیان لە باسی دا هاتوومانددا -خوا یاربێ- وەلام دەدەینەوەو بۆ ئەوێی هەڵدەگرین و، لە وەلامی پرسیاری یەکەمیشدا دەڵێین:

لەڕاستیدا ئەو ئەنجامگیرییە- کە دەڵێ: بابای خواناس و مسوڵمان، دەبێ ئایینو بەرنامەی خوا بە کاملو بێ هەڵەو پەڵە بزانێو پێشیەوە پابەند بێت، ئەگەرنا خۆی گیرۆدەی هەڵوێستێکی لەنێو خۆدا ناکۆك (متناقض)و نامەنتیقی دەکات، وێڕای لە بازنەی ئایین دەرچوون - بە شێوازێکی زانستییانەی یەکجار پتەو دەستگیر بووە، کە بەم شێوەیەیە:

سەرەتا عەقڵی سەلامەتو فیترەتی ساغ، مرۆڤ ناچارو وادار دەکەن، کە دان بەبوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاردا بێنێ، چونکە عەقڵ چەند یاسایەکی بەڵگەنەویستی تێدان، کە بناغەو بنەمای مەنتیقو زانستو بیرکردنەوەو ئەزموونکارین، بۆ وێنە: یاسای هۆکاریی (قانون السببيّة)، کە دەڵێ: ((هیچ پەیدابوویەك بێ پەیداکەر نابێ))، وە یاسای ڕێكو پێکی (قانون النظام)، کە دەڵێ: ((ڕێكو پێکی بێ ڕێکخەر نابێ))، جا بەپێی ئەم دوو یاسا عەقڵییە ڕوونو بەڵگەنەویستە، دەڵێین:

ئەو بوونەوەرە پەیداکراوو ڕێکخراوە، پەیداکەرو ڕێکخەرێکی هەیە، کە خوایە ﷻ، ئەمە دەربارەی پەیبردنی عەقڵ بە بوونی خوا ﷻ بە حوکمی یاسا خوارسکە بەڵگەنەویستەکانی خۆی، کە ئێمە لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژەمان بە دوانیانداو لە هەرکام لە: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) چاپی دووەم/٢٠٠٦،و (ئیسلامو ڕێچکان) چاپی سێیەم/٢٠٠٦،و (خواناسیی، ئایین، ئیمان) چاپی یەکەم/٢٠٠٠،و (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) بەرگی دووەم، چاپی یەکەم/٢٠٠٧، دا بەدرێژای تیشکمان خستۆتەسەر ئەو بابەتە گەورەو گرنگە.

ئنجا فیترەتو سروشتی ساغیش خاوەنەکەی بەرەو ئیمان بە خوا هەڵدەپێچێ، چونکە خوای بەبەزەیی، مرۆڤی وا سروشتاندوە، کە لە دەروونەوە بەرەو خوا بجۆشێو خۆشی بوێو بە گەورەی بگرێو شەرمو سامی لێ بکاتو بەندایەتی بۆ

بکات، وەك ئەم ئایەتە بە ڕاشکاویی ئامـاژەی بـۆ دەکـات: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (الروم: ٣٠)، واتە: دەجا ڕووی خۆت لەگەڵ ئایینی خوادا ڕاست بکە بە یەکلابووەوەیی، کە هەمان سروشتە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوەو دروستکراوی خواش ناگۆڕێ، ئائەوەیە ئایینی ڕاستو تەواو، بـەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

بۆ چۆنیەتی پەیپێبردنی عەقڵیش بە ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی (موحەممەد) ﷺ هەر بە کورتی دەڵێین:

خوای کاربەجێ پێغەمبەرانی خۆی بە بەڵگەو مـوعجیزەی ئاشـکراو ڕوونـەوە نـاردوە، وەك فەرموویـەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ ..﴾ (الحديـد: ٢٥)، هـیچ پێغەمبـەرێك نـەبووە، کـە بەڵگـەو موعجیزەیەکی ڕوونو ئاشکراو سەلمێنەرو دەستەوسانکەری وای پێ نەبێ، کە بایی ئیقناع کردنی خەڵکی ڕۆژگاری خـۆی بکـاتو دڵنیایـان بکات،کـە ڕاسـتگۆیەو ڕەوانەکراوی خوایە، چونکە،ئەگەر وانەبوایە، بەڵگەیان پێ لەسەر خەڵکدا نەدەنراو خەڵکیان پێ بیانووبڕاو نەدەکراو، ئەو ئامانجەی، کە خوای کاربەجێ لە ناردنیاندا ڕەچاوی کردوە نەدەهاتـەدی، وەك فەرموویـەتی: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ (النساء: ١٦٥)، واتە: پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسـێنەرن، تـاکو پـاش ڕەوانـەکرانی پێغەمبـەران، خەڵکی بەڵگەیان لەسەر خوا نەمێنێ، خوا هەر زاڵو کاربەجێ بووە.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە کە هەموو پێغەمبەران - عَلَيْهِم السَّلام- خاوەنی بەڵگەو موعجیزەی ئیقناعکەرو سەلمێنەر بوونـە بـۆ خـەڵکی ڕۆژگـاری خۆیان، فەرموویەتی: {ما من الأنبياء نبيٌّ إلاّ وقد أعطي من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وانما كان الذي أُوتيتُ وحياً أوحى الله إليَّ، فأرجوا أن أكون أكثرهم تابعاً يوم القيامة} (رواه البخاري برقم:٤٩٨١ مسلم برقم:٢٣٩، عن أبي هريرة

رضي الله عنـه)، واتە: لەنێو پێغەمبەراندا، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، كە نیشـانە (موعجیزە)ی وای نەدرێتێ، كە لەسـەر وێنـەی وی خـەڵك ئیمـان بێـنن، بـەڵام ئەوەی،كە من دراومـەتێ (وەك موعجیزە) وەحییەكە خوا بۆی ناردووم، بۆیە هیوام وایە لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەموویان شوێنكەوتووم پتر بن.

جا كاتێك ئینسان بە عەقڵێكی سەلیمو ویژدانێكی ساغەوە لـە كەسـایەتیی‌و ژیـانو بەسـەرهاتو هەڵسـوكەوتو پـەرێزو شـوێنەواری (موحەممـەدی كـوڕی عەبـدوڵڵای كـوڕی عەبدولمتتـەلیب)ەوە ڕادەمێنـێ و، پاشـان سـەرنجی بەڵگـەو موعجیزە بەرزو مەزنەكەی دەدات،كە (قوڕئان)ەو، خاوەنەكەی هەر لەو كاتەوە، كە ناردوویەتە خوارێ تەحەددای تێكڕای جندو مرۆڤـی كردوە، كە وێنـەی وی، یان وێنـەی دە سـووڕەتی، یـان ،تەنانـەت وێنـەی یـەك سـووڕەت بێـنن، بـەڵام هەموولایـەك دەستەپاچـەو بـێ دەسـەڵات بوونـە لـە وەڵامدانەوەیـدا، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾ (الإسـراء: ٨٨)، واتـە: بڵـێ: ئەگەرمرۆڤـو جند لەسەر ئەوە كۆبنەوە، كە وێنەی ئـەم قوڕئانـە بێـنن، پێیان نایەت، هەرچەندە پشتگیریی یەكدیش بكەن.

٢- ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ ..﴾ (هود : ١٣-١٤)، واتە: یان دەڵێن قوڕئـانی هەڵبەسـتوە! بڵـێ: دە ئێوەش (دە) سووڕەتی هەڵبەستراوی وێنەی وی بێنن و، جگە لـە خـواش، كێ دەتوانن بانگیان بكەن ،ئەگەر ڕاست دەكـەن! جـا، ئەگـەر وەڵامیـان نەدانەوە، ئەوە بزانن كە قوڕئان بە زانیاریی خوا نێرراوەتە خوارێ...

٣- ﴿ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ

ﭐلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (البقرة: ٢٣-٢٤)، واتـە: ئەگەر لەگومان دان لە بارەی ئـەو (کتێـب)ەوە، کـە ناردوومانەتـە سـەر بەندەکەمان (محمد)، ئەوە وێنەی سـوورەتێکی وەك وی بێـنن و، هـەموو شایەدەکانیشتان، جگە لە خوا بێنن، ،ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵام ،ئەگـەر ئەوەتان نەکردو، بێگومانیش نایکەن، ئەوە پارێز لە ئاگرێـك بکـەن، کـە سووتەمەنییەکەی خەڵكو بەردەو بۆ کافران ئامادەکراوە.

بەڵێ، کاتێك مرۆڤـ بە عـەقڵێکی سەلیمو سروشتێکی ساغو بـە ویژدانـەوە، سەرنجی (موحەممەد) ﷺ و بەڵگەو موعجیزەکەی دەدات، دڵنیاو مسۆگەر دەبێ، کە لە دەعواکردنی پێغەمبەرایەتییو ڕەوانەکراوێتی (نبوّة ورسالة)ەکەیدا ڕاستی کردوەو، هەم کەسایەتییو ژیانو گوزەرانو ڕەوشتو ئاکارو پەرێزو شوێنەواریی و، هەم بەڵگەو موعجیزەکەیشی بەڵگەی ڕوونو بێ چەندو چوونو ئیقناعکـەرن، لەسەرئەوە، کە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوایە، بۆ تێکـڕای مرۆڤـــایەتی: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴾ (الأعراف:١٥٨)، واتە: بڵێ: ئـەی خەڵکینە! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ هەموولایەکتان، ئەو کەسـەی، کـە مـوڵکی ئاسمانەکانو زەوی هی ویە، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، دەژیەنێو دەمرێنێ، دەجا ئیمان بە خواو ڕەوانەکراوە پێغەمبـەرە نەخوێندەوارەکـەی، کـە بـڕوا بـە خـواو وشەکانی دێنێ، بێنن و شوێنی بکەون، بەڵکو ڕێی ڕاست گرتوو بن.

بۆیە وەك ئەنجامێکی سروشتییو مەنتیقی حوکمی عـەقڵو فیترەتو ویـژدان، پێویستە بڕوا بە موحەممەدیش ﷺ بێنـێ، کـە پێغەمبـەرو ڕەوانـەکراوی خـواو هەڵگرو گەیەنەری دوایین بەرنامەو پەیامیەتی.

ئنجا پاش ئەوەی عـەقڵو فیترەت مرۆڤـیان ڕێنمایی کردو، ناچارو واداریـان کرد، کە ئیمان بەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بێنێ، دیـارە هەرچییەك، کـە ئـەو

پێغەمبەرە پایەبەرزە لە خواوە هێناویەتیو بۆی ڕەوانەكراوە لە ئایینو شەریعەت، ئیمانی پێ دێنیو بە ڕاستو دروستی دەزانیو تۆسقاڵێك گومانو دوودڵیی بەرانبەر بە هیچ شتێك لە ئایینو بەرنامەی خوا ﷻ نابێ، چونكە خوایەك خاوەنی ناوە هەرە چاكەكانو سیفەتە هەرە بەرزەكان بێ و، بەدیهێنەرو پەروەردگارو مشوورخۆری هەموو شتێك بێت و، هەموو شتێك بزانێو هیچ شتێك نەبێ نەیتوانێ و...هتد، دیارە ئەو ئایینو بەرنامەیەش، كە بە پێغەمبەری كۆتایی خۆیدا بۆ مرۆڤایەتی ناردوویەتی، كاڵایەكە پڕ بە باڵای مرۆڤ و، وەڵامی هەموو پرسیارێكو چارەسەری هەموو كێشەیەكو دەرمانی هەموو دەردێكی پێیە، وەك بۆ خۆیشی بەڕاشكاویی فەرموویەتی: ﴿..ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا ..﴾ (المائدة: ٣)، واتە: ئەمڕۆ بەرنامەكەتانم بۆتان تەواوكردو، چاكەی خۆمم بە سەرتانەوە تەواوكردو، ئیسلامم بە بەرنامە بۆتان پەسند كرد..

شایانی باسیشە ئەم ئایەتە بە پێزە لە كاتی حەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع)دا هاتۆتە خوارێ، لەدوادوای تەمەنی پڕ بەرەكەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ وەك (بخاري) لە (عمر بن الخطاب)ەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە.

كەواتە: وەك بینیمان ئیمان هێنان بە تێرو تەواوییو بێ هەڵەو پەڵەیی ئایینو بەرنامەی خوا ﷻ، خاوەنی پتەوترین بناغەی فیكرییەو بە زانستی ترین شێواز بەرهەم دێ و، لاف لێدانی خواناسییو مسوڵمانەتییش لەگەڵ ڕازی نەبوون بە ئایینو بەرنامەی خوا – هەمووی، یان هەندێكی- وێڕای بە كوفرو لە بازنەی ئیسلام دەرچوون دانرانی، هەڵوێستێكی نامەنتیقیو دژی شێوازی زانستییانەشە!

# چەسپاوو گۆڕاو لەنێوان دین و ژیندا

خوێنەری بەڕێز!

یەکێك لەو مەسەلانەی، کە بوونەتە گرفتو گرێ کوێرەیەکی سەختو بێـڕەزا لەسەر دڵو دەروونی هەنـدێك کـەس، بـە تایبـەت لـەنێو تـەوژمی عەلمانییـدا، ئەوەیە،کەدەڵێن:

لەلایەکەوە مرۆڤــو ژیانیو دەوروبـەریو بوونـەوەر، هـەموویان لـە گـۆڕانو پەرەستاندن (تغيّر وتطوّر)ی بەردەوامدانو، هیچ شتێکی چەسپاو (ثابت) لە ژیانو بوونەوەردا نییەو، لە لایەکی دیکەشەوە (ئـایین) چـەند دەقێکـی دیـاری کـراوو نەگۆڕو چەقبەستوویەو، هیـ جۆرە گۆڕانکارییەك هەڵناگرێ، کەواتە:

چـۆن چـۆنی ئـایینێکی چەقبەسـتووو وەسـتاو فریـای مرۆڤــو ژیـانێکی پەرەستاندووو هەمیشە گۆڕاو دەکەوێ؟!

جا ئێمە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەو لابردنی ئەم گرێکـوێرەو ئیشـکالە لـە دڵو زەینی ئەو جۆرە کەسانەدا، دەڵێین -وەك دواتریش بە وردی باسی دەکەین-:

بەکارهێنانی وشەی ئایین (دین) بۆ ئیسلام ،ئاوا بە شێوەیەکی گشتیی جۆرێکە لە (سفسطة)و چەواشەکاریی، چونکە هەموو ئەو بەرنامـەو سیسـتەمانەی، کـە مرۆڤـ ویستوویەتیو دەیەوێ ژیانو گوزەرانی تـاکییو خێزانیـیو کۆمەڵایـەتی خۆییان پێ ڕێك بخات، سەرچاوەکەیان خواو ئاسمان بێ، یان مرۆڤــو زەمین، هــەر ئایین (دین)ن، کەواتە: عەلمانییەتیش ئایینە وەك چۆن ئیسلام ئایینە و، وەك چۆن دروستو ڕەوا نیە وشەی ئایین بە ڕەهایی بۆ سیکۆلاریزم بەکاربێ، بۆ ئیسلامیش بە هەمان شێوە.

هەروەها ،ئەگەرتەنیا مانا باوو عورفییەکەی ئایین (دین)یش مەبەست بێ، کە بەس بەرنامە ئاسمانییەکان (الشرائع السماوية) دەگرێتەوە، دیسان هـەر شـتێکی

چەواشەکارانەو هەڵەیە، کە وشەی ئایین بە ڕەهایی بۆ ئیسلام بەکاربێ، چونکە بێ ویژدانیی‌و ستەمە، ئیسلام‌و (نەصرانییەت) یان (جوایەتی) یان هەر ڕێچکەو ڕێبازێکی دیکەی خۆ بە ئاسمانیی‌و خوایی زان، لەگەڵ یەکدا بخرێنە تەرازووەوە، ئایا ستەم نیە بە وشەو زاراوەیەکی وەك ئایین‌و سیستەمی بەشەریی، دیکتاتۆریی‌و دیموکراسیی پێکەوە مەبەست بن‌و، دیموکراسیی بە ناحەق وەك دیکتاتۆریی تەماشا بکرێ و، هەمان حوکمی وی بەسەردا بدرێ، هەر لەبەر ئەوەی هەردووکیان لە (بەشەریی بوون)دا یەکدەگرنەوە؟!

پاشان لە بارەی ئەو قسەیەوە، کە دەڵێ:

((مرۆڤـ و ژیانی‌و دەوروبەری‌و بوونەوەر، هەموویان لە گۆڕان‌و پەرەستاندنێکی بەردەوام دان))

دەڵێین: ڕاستە گۆڕان‌و پەرەستاندن لە مرۆڤـو ژیان‌و گوزەرانی‌و دەوروبەری‌و بوونەوەردا هەیەو، هیچ کەس ناتوانێ نکوولیی لەو ڕاستییە بکات، بەڵام ڕاست نیە، کە هیچ شتێکی چەسپاوو نەگۆڕیش لە ژیانی مرۆڤـو دەوروبەری‌و بوونەوەردا نەبێ و، بەرداشی گۆڕان‌و پەرەستاندن بەردەوام دایم‌و دەرەم، سەرگەرمی هاڕینی ژین‌و مرۆڤـو بوونەوەر بێ! بەڵکو وێڕای گۆڕان (تغيّر) چەسپاویی (ثبات)یش هەیە و، وێڕای پەرەستاندن (تطور) وەك خۆمانەوە (بقاء)یش هەیە، با سەرنج بدەین:

جارێ، ئەگەرسەرنجی بوونەوەرو دەوروبەرو ژینگەیەك بدەین، کە مرۆڤـ ن تێدادەژی‌و ژیانیان تێدا دەگوزەرێنی، چی دەبینین؟!

بە شێوەیەکی گشتیی، کەهکەشان‌و ئەستێرەو خڕۆکەکان، بەپێی سیستەم (نظام)ێك، کە خوا بۆی داناون، لە گەڕان‌و سووڕان دان‌و هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆیان پێوە نابینین‌و، ملیۆنانساڵیشە ئەوە حاڵیانە، دیارە لە ماوەی درێژخایەندا هەندێك گۆڕانکاریی ڕوویانداوەو ڕوودەدەن، وەك پیربوون‌و لەبەین چوونی هەندێك ئەستێرەو خڕۆکەو هەندێك گۆڕانکاریی گچکەتر، بەڵام بێگومان ئەو

گۆڕانکارییانە لەوە گچکەترن، کە ئێمە - مەگەر لەڕێی تایبەتەوە- هەستیان پێ بکەین‌و حاڵەتی چەسپاویی‌و وەك خۆ مانـەوەی بوونـەوەر، لـە حاڵـەتی گـۆڕان‌و پەرەستاندنی - بەتایبەت بە نیسبەت ئێمەوە- زۆر زەقترو ئاشکراترە.

هەروەها لە دەوروبەرو ژینگەی نزیکماندا، هەندێك گۆڕانکاریی بچووك هەست پێدەکەین، وەك کەمبوونەوەی پانتایی وشکانی زەوی‌و زیاد بـوونی ڕێـژەی ئـاوو بەرەو گەرمایی چوونی کەش‌و هـەوا، بـەهۆی کـون تێبـوونی چـینی ئۆزۆنـەوەو توانەوەی بەسـتەڵەکەکان‌و زۆربـوونی لافـاو و...هتـد، بەتایبـەت لـە ڕۆژگـاری ئێستاماندا، دوای ئەوەی،کە سەرکێشی مرۆڤ لە دەسـت تێـوەردانی ژینگـەدا پەرەی ستاندوە، بە پاڵنەری تەماع‌و پارەو سـامان وسـەرێکنانی زیـاتر لەلایـەن زلهێزو سەرمایەدارەکانەوە، بەڵام بێگومان حاڵەتی چەسپاویی‌و وەك خۆ مانەوە، دیسان زەقترو هەستپێکراوترەو، هەرکام لە خۆرو زەوی‌و مـانگ، وەك هـەزاران، بەڵکو ملیۆنان ساڵ لەمەوبەر، سەرگەرمی خولانەوەو سـووڕانەوەو جم‌و جـوڵی ئاسایی خۆیانن و، دیاردە سروشتییەکانی، کە مرۆڤـە سەرەتاییەکان بینیویـانن وەك: کەشەکانی ساڵ (فصول السـنة): زستان، بەهار، هاوین، پایز، وە باو باران‌و بەفرو تەرزەو بوومەلەرزەو ئاگرپژێن‌و سەرماو گەرماو وشکەساڵیی‌و تەڕسـاڵیی و...هتد، لە ڕۆژگاری ئێمەشدا هەر هەن‌و بەردەوامن!

دیسان مرۆڤـیش وەك خوا فەرموویەتی: ﴿..فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ..﴾ (الروم: ٣٠)، واتە: ئەو سروشتەی، کە خوا خـەڵکی لەسـەر سروشتاندوە، دروستکراوی خوا گۆڕان هەڵناگرێ، هەر لەو کاتەوە، کـە خـوا ﷻ یەکەمین جووت (زوج)ی لێ لەسەر زەوی ڕۆناون، کـە ئـادەم‌و حـەوان (سـەلامی خوایان لێبێ)، هەتا ئێستا، هەروەك خۆیەتی‌و لە جەوهەردا نەگۆڕاوە، هەرچەندە لەڕووی ڕواڵەتی ژیان‌و گوزەرانییەوە گۆڕانکاریی گەورە ڕوویداوە، بەڵام بێگومان ئەو گۆڕانکارییە ڕواڵەتییە، نەبۆتە مایەی گۆڕانی جەوهەرو کەسایەتی مرۆڤـ، چونکە:

أ. جاریٚ ،ئەگەر لەڕووی جەستەییيەوە تەماشای بكەین، مرۆڤـــی ئەم ڕۆژگارەش هەر هەمان پێكهاتەی هەیە، كە مرۆڤـــی یەكەمو مرۆڤـــەكانی پێش مێـژوو هەیانبووەو، وەك چۆن مرۆڤـــەكانی زوو بە گوێرەی چەند یاسا (سنن)ێك، كە خوا ﷻ دایناون وەك: خواردنو خواردنەوەو خەوتنو بەرگو پۆشـاك پۆشـینو ساغیی‌و نەخۆشیی‌و پیربوونو مردن، بەڕێوەچوون، مرۆڤـــی ئێستاش ملكەچی هەمان ئەو یاسایانەیەو، گۆڕانی جەوهەری بەسـەر هیچـكام لـەو حاڵەتانـەی مرۆڤـــدا نەهاتوە، ئەوەنـدە هەیە،ئەگەرمرۆڤـــی زوو - بـە تایبـەت پـێش دۆزینەوەی ئاگر- خواردنەكەی زیاتر شتی كاڵو نەكوڵاوو نەبرژاوو سوورنەكراوە بووە، چ گۆشت چ دانەوێڵە چ سەوزە، ئەوە مرۆڤـــی ئێستا دەتوانیٚ بە چەندان شێوە خواردنو خواردنەوەكـەی سـاز بكـاتو چـەندان ئـامرازی تێـدا بـەكار بێنیٚ،ئەگەركاتی خۆی مرۆڤـــ لە شوێنی سادەدا خەوتووە، ئێستا وردەكاریی‌و هونەری زۆری لە شوێنو كەل وپەلی خەوتنـدا بەكارهێناوە،ئەگـەركاتی خـۆی مرۆڤـــ بـە چـەرمو كـەوڵی ئـاژەڵو پێشـتریش گـەڵای درەخـت عـەورەتی خۆیداپۆشیوە، ئێستا چەندان جۆرە قوماشی داهێناوەو هەمـوو جەستەیشـی - نەك بەس عەورەتی- دادەپۆشیٚ، جگە لە هەندێك كەس، كە دەیانەویٚ بەس لەم مەسەلەیەدا بگەڕێنەوە بۆ حاڵەتی پێش مێژوو!

هەروەها حاڵەتەكانی ساغیی‌و نەخۆشی‌و پیربـوونو مـردنیش، وەك جـاران هـەنو بـەردەوامن، كەواتـە: ئایـا جگـە لـە هەنـدێك شـتی ڕواڵـەتیی، گۆڕانكارییەك لەڕووی جەستەییيەوە لە مرۆڤـــدا ڕوویداوە؟!

ب. ،ئەگەرلەڕووی مەعنەوییی‌و دەروونییەوە سەرنجی مرۆڤـــ بدەین، ئەوە دەبینین مرۆڤـــی ئێسـتا، كـتو مـت هـەر مرۆڤـــەكەی جارانـەو هـیچ ڕووی لـیٚ وەرنەگێڕاوە، چ لەڕووی چوار داخوازییە مەعنەوییە خوارسكەكانەوە: حەز لـە خواپەرستیی كردنو حەزكردن لە شت زانینو، حەزكردن لە جوانیی‌و، حەزكردن لە كامڵبوون (حب العبودية لله، وحب الاطلاع، وحب الجمال، وحب الكمال)، چ

لەڕووی غەریزەو پاڵنەرە سروشتییەکانەوە، وەك: غەریزەی شت هەبوون‌و غەریزەی جینسی‌و غەریزەی خێزان پێکەوەنان‌و، وەچە خستنەوەو غەریزەی بەرگری لە خۆکردن و...هتد، هەڵبەتە بەرەوپێشچوونی ژیان‌و گوزەرانی ماددیی مرۆڤ، کاریگەریی هەبووەو هەیە لەسەر لایەنی مەعنەویی‌و دەروونیی مرۆڤ، بەڵام نەك لەو ڕووەوە، کە شتێکی تێدا پەیدابکات،کە نەیبووبێ، بەڵکو لەو ڕووەوە، کە تێرکردن (إشباع)ی ئەو پاڵنەرو غەریزانەی بۆ ئاسان بکات.

بۆ نموونە: کاتێ خۆی دەماری شەڕەنگێزیی‌و خوێنڕێژیی پاڵی بە کوڕە بەدفەڕەکەی ئادەم‌ﷺ (قابیل)ەوە نا، کە برایە لەخواترسەکەی (هابیل) بکوژێ‌و کوشتیشی، بەڵام دیارە هەم شێوەی کوشتنەکەی زۆر سادەو ساکار بوو، وەك دەڵێن بە گاشە بەردێك سەری هاڕی‌و، هەم دواییش گیری خوارد بە دەست تەرمەکەیەوەو نەیزانی چی لێبکات! تاکو خوای کاربەجێ قەلەڕەشێکی کردە چاوساغی بۆ چۆنیەتی ناشتنی، وەك فەرموویەتی: ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِ ...﴾ (المائدة: ٣١)، واتە: ئنجا خوا قەلەڕەشەیەکی نارد، کە بە دەندووکی زەوی هەڵدەکۆڵی، تاکو پێشانی (قابیل)ی بدات چۆن تەرمی برایەکەی دەشارێتەوە، بەڵام بیگومان مرۆڤی ئێستا، هەر بە هەمان غەریزەو پاڵنەری شەڕەنگێزیی‌و خوێنڕێژیی، هەم چۆنیەتی کوشتنەکەی وردەکاریی‌و هونەریی زۆری تێدایە، کە بە چەندان شێوەی سەرسوڕهێنەر ئەنجامی دەدات‌و لە چرکەیەکدا، هەزاران‌و ملیۆنان مرۆڤ قەلاچۆ دەکات، هەم بۆ شاردنەوەو پەنهانکردنی شوێنەواری تاوانەکەیشی، سەد فەندو فێڵ دەزانێ‌و، هیچ حەوجێی قەلەڕەشە نیە فێری بکات!

کەواتە: بەڵێ، ڕاستە گۆڕان‌و پەرەستاندن لە بوونەوەرو دەوروبەرو ژینگەو ژیان‌و گوزەرانی مرۆڤدا هەیە، بەڵام بەهیچ جۆرێك ڕاست‌و واقیعی نیە، کە بگوترێ: هیچ شتێکی چەسپاوو وەك خۆی ماو - بە تایبەتی بە نیسبەت ئێمەی

مرۆڤــەوە- نیە، بەڵکو ڕاستو واقیعی ئەوەیە،کە هەرکام لـە گـۆڕاوو چەسـپاو (متغيّر وثابـت) لە بوونەوەرو ژیانو گـوزەرانی مرۆڤـــدا هـەن و، هـەردووکیـ ن شانبەشانی یەکدی دەڕۆن و، هەرچی چەسپاوییە زیاتر پەیوەندی بە شێوەو حاڵەتی گشتی بوونەوەرو سروشت و، جەوهەرو کەسـایەتی مرۆڤــ و نێـوەڕۆکی ژیـانو گوزەرانییەوەیە هەیەو، گۆڕانکـارییش پەیوەسـتە بـە هەنـدێك حاڵـەتی جـوزئی بوونەوەرو سروشتو لایەنی ماددییو ڕواڵەتیی ژیانو گوزەرانی مرۆڤـــەوە.

ئێستاش، کە بۆمـان ڕوون بۆوە حاڵی قسەی یەکەمی تەوژمی عـەلمانیی، کـە دەڵـێ: ((مرۆڤـــ و ژیـانیو دەوروبـەریو بوونـــەوەر هـــەموویان لـــە گـــۆڕانو پەرەستاندنێکی بەردەوام دان))، چۆنە! با بچینە سەروکاری قسەی دووەمیان، کە دەڵێ: (((ئایین) چەند دەقێکی دیاری کراوو نەگۆڕو چەقبەسـتوویەو هـیچ جـۆرە گۆڕانکارییەك هەڵناگرێ)).

سەرەتا دەڵێین: ئایا مەبەستتان لە (ئایین) چ ئایینێکـە؟ چـونکە وەك پێشـتر گوتمان وشەی (ئایین)- بە چەمکە باوەکەی- کۆمەڵێك بەرنامەو ڕێبازی خۆپاڵدەرە لای خواو ئاسمان دەگرێتەوە، کە جیاوازی هەندێکیان لەگەڵ یەکدی هێندەی دووری نێوان ئاسمانو زەوییە وناگونجێ وشەیەکی ئاوا گشـتیی بـۆ پێناسـەی هـەموویان بەکاربێت، چونکە،ئەگەرمەبەست لە وشـەی (ئـایین)، نەصـڕانییەت بێـت -کـە بێگومان نووسەرە ڕۆژئاواییەکان لەکاتی بەکارهێنانی وشەی (ئایین)دا،هەر کڵێساو نەصڕانییەتیان لە زەیندایەو، بەداخەوە تەوژمی عەلمانیی وڵاتی ئێمەش بە زۆری شوێنکەوتووو لاساکەرەوەی ئەوانن!-، بەڵێ ، ئەگەرمەبەست لە (ئایین) کڵێسـاو ئایینە شێوێنراوو تێکدراوەکەی بێ، ئەوە ئێمەش بێ سێو دوو دەڵـێین: ڕاسـتەو پێناسەی: (((ئایین) چەند دەقێکی دیاری کراوو نەگۆڕو چەقبەستوویەو هیچ جۆرە گۆڕانکارییـەك هەڵناگرێ))، پڕ بە پێسـتییەتیو کاڵایـەکی پـڕ بـە باڵایـەتی و، واقیعی مێـژوویيو هاوچـەرخی کۆمـەڵگا نەصـڕانییەکانیش چـاکترین بەڵگـەو شایەدە!

بەڵام بێگومان،ئەگەرمەبەستتان لە (ئایین)، (ئیسلام) بێ، کە پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ﷺ هێناویەتی‌و مەتنەکەی لە قورئانی دوایین کتێبی پارێزراوو دەستکاریی نەکراوی خوادا بەرجەستەیە، ئەوە بەهیچ جۆرێك ئەو پێناسەیەی لەگەڵدا ناگونجێت، با بزانین چۆن‌و بۆچی؟!

لەڕاستیدا لەڕووی چەسپاویی‌و گۆڕاوییەوە، لایەنەکانی ئیسلام‌و پێکهاتەکانیدا بەش دەبن بۆ دوو جۆر:

جۆرێکیان چەسپاون‌و گۆڕان هەڵناگرن، جۆرەکەی دیکەشیان گۆڕاون‌و بە ڕووی گۆڕانکارییەکاندا کراوەن.

خواش یاربێ لێکۆڵینەوە دەربارەی جۆری یەکەمی پێکهاتەی ئیسلام، باسی بابەتی داهاتوومان دەبێ.

## جۆری یەكەمی پێكهاتەی ئیسلام

### ئەو لایەنو بوارانەی كە چەسپاونو گۆڕان هەڵناگرن:

ئەم جۆرەش لە پێكهاتەی ئیسلام، چەند بەشێكە:

**١- لایەنی ئیمان وعەقیدە:**

وەك ئیمان بە خوا ﷻو فریشتەكانیو پێغەمبەرانیو ڕۆژی دواییو بەهەشتو دۆزەخ..

دیارە ئەو دەقانەش، كە پەیوەندییان بەم لایەنەوە هەیە، هەواڵ دەدەن لەبارەی چەند ڕاستییەكەوە، كە چەوسپاوو نەگۆڕن، بۆیە ماناو مەبەستەكانیان گۆڕانی ن بەسەردا نایەت، بۆ وێنە:

ئەوە، كە خوا ﷻ خاوەنی هەموو ناوێكی هەرەچاكو سیفەتێكی هەرەبەرزو پەسندەو، لە هەموو هەڵەو پەڵەو كەمو كوڕییەك دوورەو تاكو پاكو بێ هاوەڵەو هەربوویەو بێ كۆتاییە و...هتد، هەموو ئەوانە چەند ڕاستییەكن چەسپاوو نەگۆڕن و، هەرگیز ناگونجێ گۆڕانیان بەسەردا بێت، هەر بۆیەش زاناو توێژەرەوانی قورئ ن، هەمیشە كۆكو تەبا بوونە لەسەر تەفسیری دەقێكی وەك سوورەتی: (الإخلاص): ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾، واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. بڵێ: ئەو، خوایەكی تاكە. خوایەكە، جێی نیازو بێ نیازە. كەسی لێ نەبووەو، لە كەسیش نەبووە. هیچ كەس هاوتای نیە.

## ٢- لایەنی خواپەرستیی (عبادة):

ئەمیش لایەنێکی دیکەی چەسپاوو نەگۆڕەو گۆڕانکاریی هەڵناگرێ، چونکە خواپەرستییو بەندایەتیی بۆ خواکردن، مامەڵەکردن (تعامل)ە لەگەڵ خوادا، دیارە هەر خوای پەروەردگاریش دەزانێ، کە چۆن چۆنی پێویستو شایستەیە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، هەر بۆیەش وەحی خوای زاناو شارەزا، لە دوو تویێی قورئانو سوننەتدا زۆر بە وردیی نوختەی خستۆتە سەر پیت، لەبارەی هەموو جۆرەکانی خواپەرستییەوە - بە چەمكو واتای تایبەتیو باوی خواپەرستیی- وەك نوێژ، ڕۆژووگرتن، حەجو عومرەو ئیعتیکاف، پاڕانەوە، نەزرکردن، سوێندخواردن، ماڵ بەخشین...هتد، بۆ نموونە:

أ- خوای بەرزو مەزن لەبارەی چۆنیەتی دەستنوێژ گرتن (وضوء)ەوە فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ ...﴾ (المائدة: ٦)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات بۆ نوێژێ هەڵسان، ڕووتان بشۆنو دەستەکانیشتان هەتا ئانیشکان، دەستی تەڕ بەسەرتاندا بێننو لاقەکانیشتان هەتا گوێزینگان بشۆن..

کەواتە شەرعزانان (فقهاء) کە دەڵێن: دەستنوێژ شەش فەرزی هەن:

نیازهەبوونو شۆردنی دەمو چاو و، هەردوو دەست لەگەڵ ئانیشکەکان و، مەسح کردنی سەر و، شۆردنی هەردووپێ لەگەڵ گوێزینگان و، بە ڕیز (ترتیب) ئەنجامدانی هەموو ئەم کارانەش، ئەم ڕستە قورئانییە هەرکام لەو شەش فەرزەی دەستنوێژی گرتوونە خۆی، چونکە:

ڕستەی ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾، دەلالەت لەسەر نیاز (نیة) دەکاتو شۆردنی ڕووو هەردوو دەستو مەسحی سەرو شۆردنی هەردوو (پێ)ش، بەڕوونیی باسکراونو ڕیزبەندییەکەش، هەر لە خودی سیاقەکەدا دیارە!

ب- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بە وردیی چۆنیەتی نوێژکردن فێری هاوەڵەکان - خوا لێیان ڕازی بێ- بکات، ڕۆژێك چۆتەسەر مینبەرو نوێژێکی لەبەرچاویان کردوەو پاشان فەرموویەتی: {صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي} (رواه البخاري)، واتە: وەك چۆن بینیتانم نوێژم کرد، ئاوا نوێژ بکەن.

ج- هەروەها لە (صحيح مسلم)دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ئەنجامدانی ئەرك‌و پەرستنەکانی حەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع)دا بە هاوەڵە بەڕێزەکانی دەفەرموو: {خذوا عنِّي مناسككم، خذوا عنِّي مناسككم لعلِّي لا ألقاكم بعد عامكم هذا}، واتە: خواپەرستییەکان-ی حەج-م لێوەربگرن، خواپەرستییەکانم لێوەربگرن، ڕەنگە دوای ئەم ساڵەتان پێتان نەگەمەوە.[1]

## ٣- لایەنی خووڕەوشت (الأخلاق):

لایەنێکی دیکەی چەسپاوو گۆڕانکاریی هەڵنەگر لە ئیسلامدا، بریتیە لە لایەنی خووڕەوشت بە هەردوو جۆری پەسندو پەست‌و چاك‌و خراپیەوە.

چونکە ڕەوشت‌و ئاکارە بەرزو پەسندەکان‌و خووو ڕەفتارە پەست‌و نزمەکانیش، وەك هەرکام لە ئیمان‌و عەقیدەو خواپەرستییەکان، ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە ڕووح‌و جەوهەری مرۆڤەوەو، پێشتریش باسمان کرد، کە ڕووح‌و جەوهەری مرۆڤ، شتێکی چەسپاوو نەگۆڕە.

---

[1] شایانی باسیشە کە ئێمە کتێبی (خواپەرستی ئیسلامی...)مان بۆ توێژینەوەی خواپەرستی بەگشتی و پێنج دروشمەکانی بەتایبەتی تەرخان کردوەو، ئەو کتێبە لە چاپی دووەمیدا، کە لە نوسینگەی تەفسیر کراوە، چوار بەرگی گەورەیە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنـەوەی مەبەسـت دەڵـێین: ئایەتـەکانی قورئـانو دەقـەکانی سوننەت، بەڕوونو ڕاشکاویی مەدحو ستایشی خەسـڵەتە بـەرزو جـوانو ئاکـارە ڕەندو پەسندەکانی، وەك:

ڕاستگۆیی، دەستپاکیی، خۆڕاگریی، سوپاسگوزاریی، بەبەزەیی بـوون، نـەرمو نیـ نیی، لێبوردەیی، خۆبەکـەمگرتن، ئازایـەتیی، سـەخیی بـوون، دادگـەریی، چاکەکاریی...هتدیان کردوەو لەسەر مسوڵمانانیان پێویست کردوە، کە خۆیانیـ ن پێ بڕازێننەوە، بە پێچەوانەشەوە، ڕەخنەو سەرزەنشتیان ئاڕاسـتەی خـووو خـدە دزێوو ناقۆڵایەکانی، وەك:

درۆزنیی، دەستپیسیی، خۆڕانەگریی، سپڵەیی، دڵڕەقیی، زبریی، خۆبەزلگریی، ترسنۆکیی، چرووکیی، ستەمکاریی، خراپەکاریی، زمانشڕیی...هتد کردوەو، لـە مسوڵمانانیان قەدەغە کردوە، کە توخنیان بکەونو لەسەریان پێویست کردوون، کە خۆیانیان لێ بژار بکەن.

هەڵبەتە هـیچ کـاتێکیش - هەرچـەندە ژیـانی مرۆڤـــ زۆر گەشـە بکـاتو بەرەوپێش بچێ- ناگونجێ خەسڵەتو ئاکارە بەرزو جوانەکانی وەك: ڕاسـتگۆییو دەستپاکییو خۆڕاگرییو سوپاسگوزارییو بەبەزەیی بوون و...هتد خـراپ بـن و، سیفەتی خـووو خـدە خراپـەکانی وەك: درۆزنیـیو دەستپیسـییو خۆڕانـەگرییو سپڵەییو دڵڕەقیی و...هتد ببنە شتی چاكو پەسند!!

ئەمەش چەند ئایەتێك، کە ئاماژە بە بەشێك لە خەسڵەتو ڕەوشـتە پەسـندو بەرزەکانو خووو خدە ڕەفتارە نزمو خراپەکان دەکەن:

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ
أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾
وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ
أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا
ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ

ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ
تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا مَّيۡسُورٗا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ
ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ كَانَ
بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ
كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا
تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا
يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ
يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٤﴾ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ
بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ
وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ
ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴾ (الإسراء: ٢٣-٣٧).

واتە: ( پەروەردگارت فەرمانیداوە، کە جگە لەوی (هیچ پەرستراوێك) نەپەرستن و، چاکە لەگەڵ بابو دایکاندا بکەن، هەرکات یەکێکیان، یان هەردووکیان لەلات بەساڵداچوون، ئەوە هیچ قسەیەکی زبریان پێ مەڵێو تێیان مەخوڕە.بەڕێزەوە بیاندوێنە. لەڕووی بەزەییەوە باڵیان بەسەردابێنەو، بڵێ: پەروەردگارم وەك: چۆن منیان بە گچکەیی بەخێوکرد، تۆش بەزەییت پێیاندابێت. پەروەردگارتان بەوەی لە دڵتاندایە (لەخۆتان) زاناترە! ،ئەگەرچاکەکار بن ئەوە بەرانبەر بە زۆرگەڕاوان لێبوردەیە. مافی هەرکام لە خزمو نەدارو ڕێبوار بدەو بێهوودە ماڵ خەرج مەکە. چونکە بێهوودە ماڵ سەرفکەران، برایانی شەیتانەکانن‌و شەیتانیش بەرانبەر پەروەردگاری سپڵەبوو.

ئەگەر(داوایان لێکردیو نەتبوو بیاندەیەو) ڕووت لێیان وەرگێڕاو بە ئومێدی بەزەیی (و بەخششی) پەروەردگارت بووی، ئەوە قسەیەکی خۆش‌و جوانیان لەگەڵ بکە.

چەنگت مەقووچێنە بە ملتیەوە بنووسێنیو، بە تەواویش بڵاوی مەکە، ئەگەرنا (لە حاڵەتی یەکەمدا) بە سەرکۆنەکراوییو (لە حاڵەتی دووەم دا) بە پێبڕاویی دادەنیشی! بێگومان پەروەردگارت بژێو بۆ هەرکەسێك، کە بیەوێ فراوان، یان تەنگ دەکات، بەڕاستی ئەو شارەزای بەندەکانیەتیو دەیانبینێ.

لەترسی نەداریی منداڵەکانتان مەکوژن، ئێمە ڕۆزیی ئەوانو ئێوەش دەدەین، بەڕاستی کوشتنیان تاوانێکی زلە.

توخنی زینا مەکەون، بێگومان ناقۆڵایەو خراپترین ڕێبازە.

بە شێوەیەکی هەق نەبێ، ئەو نەفسە، کە خوا کوشتنی قەدەغەکردوە، مەیکوژن، هەرکەسێکیش بە ستەملێکراویی کوژرا، ئەوە هەقمان داوەتە خوێن ئەستێنەکەیو، با لە کوشتنەوەدا زیدەڕۆیی نەکات، بێگومان پشتگیریی کراوە.

بە چاکترین شێوە نەبێ،نزیکی ماڵی هەتیو مەکەون، هەتا دەگاتە حاڵەتی پێگەیشتن، پەیمان جێبەجێ بکەن، چونکە بەڵێنو پەیمان لێی دەپرسرێتەوە.

هەرکاتێك شتێکتان (بۆ خەڵك) پێوا، بەتەواویی بیپێونو، بە تەرازووی ڕاست شت (بۆ خەڵکی) بکێشن، ئەوە چاکترەو سەرەنجامیشی باشترە.

بەدوای شتێك مەکەوە، کە نایزانی، چونکە بیستنو دیتنو عەقڵ، هەموو ئەوانە لێیان دەپرسرێتەوە، بە فیزوکەشخەوە بە زەویدا مەڕۆ، چونکە مسۆگەر زەمینت بۆ نادرێ و هێندەی چیایانیش بڵند نابیت).

بێگومان هیچ کاتێك نەگونجاوەو ناشگونجێ، کە ئەو خەسڵەتو ئاکارە بەرزو جوانانەی لەم چەند ئایەتەدا فەرمانیان پێکراوە، خراپ بن، کە بریتین لەم یازدەیە:

((١- تەنیا خواپەرستن، ٢- چاکەکردن لەگەڵ دایكو بابو ٣- بەڕێزەوە قسە لەگەڵ کردنیانو ٤- باڵی بەزەیی بۆ شۆڕکردنیانو ٥- دووعای خێربۆکردنیان، ٦-چاکەکارییو مافی خۆدان بە خزمو ٧- هەژارو ٨- ڕێبوارو، ٩- قسەی ئاسانو مژدەبەخش لەگەڵ کردنیان لە کاتی نەبوونی توانای هاوکاریی کردنیاندا، ١٠- بەڵێنو پەیمان بردنەسەر، ١١- کێشانەو پێوانە بە دادگەرانە ئەنجامدان))!

هەروەها هیچ کاتێك نەبووەو، هەرگیزیش ناگونجێ، ئەو سیفەتو ڕەفتارە خراپو دزێوانەی قەدەغەکراون، ببنە شتی باشو پەسند، کە بریتین لەم یازدەیە:
((١- قسەی ناڕێك لەگەڵ بابو دایکدا کردنو ٢- تێوەخوڕینیان، ٣- ماڵی خۆ بێهوودە خەرج کردن، ٤- چەنگ قووچاویی‌و ٥- دەستبلاویی، ٦- کوشتنی منداڵی خۆ لەترسی برسیەتی، ٧- زیناکردن، ٨- کوشتنی خەڵکی بەناهەق، ٩- بە شێوەیەکی خراپ دەستوەردانە ماڵی هەتیو، ١٠- بەبێ شارەزایی شوێنکەوتن، ١١- بەفیزو کەشخە بەڕێدا ڕۆیشتن.))!

## ٤- سەرجەم ئەو حوکمە شەرعییانەی کە بە دەقێکی ڕوون و بێ چەندوچوونی قورئان وسوننەت جێگیر بوونە:

ئەمیش لایەنێکی دیکەی چەسپاو ونەگۆڕی ئیسلامە، کە هیچ کاتێك ناگونجێ گۆڕانکاریی‌و دەستکاریی تێدا بکرێ، مەگەر لە چۆنیەتی‌و میکانیزمی جێبەجێ کردنو پراکتیزەکردنیدا.
جا هەرچەندە چەمكو واتای پێناسەی ئەم لایەنەی چوارەمی چەسپاوو نەگۆڕی ئیسلام، هەرسێك لایەنەکەی دیکەی پێشووش دەگرێتەوە، چونکە ئەوانیش هەر بە دەقی ڕوونو بێ چەندوچوونی شەریعەت ئیسپات بوون، بەڵام مەبەستمان بەم لایەنی چوارەمە زیاتر ئەو حوکمە شەرعییانەیە، کە لە بواری هەڵسوکەوتەکان (معاملات)دا نوختەیان خستۆتەسەر پیت، وەك:
أ- حەڵاڵکردنی کڕینو فرۆشتنو قەدەغەکردنی سوودخۆریی: ﴿...وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟..﴾ (البقرة: ٢٧٥).
ب- قەدەغەکردنی تێکدانی هێمنیی‌و ئاسایشی خەڵكو وڵاتو دانانی سزای پڕبەپێست بۆ ڕێگرو تێکدەران: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ..﴾ (المائدة: ٣٣).

ج- دانانی: سزای کوشتنەوە بۆ تاوانی کوشتنی بەناهەقی ئانقەست: ﴿..كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى..﴾ (البقرة: ١٧٨).

د- سزای سەد(١٠٠)قەمچی بۆ زیناکەران: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ..﴾ (النور: ٢).

هـ- سزای دەست بڕین بـۆ دزان: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة: ٣٨).

و- سزای هەشتا(٨٠) قەمچی بۆ بوختانکەران – بوختانی داوێـن پیسـیی-: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً..﴾ (النور:٤).

ز- قەدەغەکردنی خۆکوشتن:
﴿..وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا..﴾ (النساء: ٢٩).

ح- سەرپەرشـتی کرانـی ژنو مـاڵ لەلایـەن مێـردەوە: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ..﴾ (النساء: ٣٤).

ط- ڕەوابوونی هاوسەرگیریی پیاو لەگـەڵ ژنێـکدا، هـەتا چـوار، بەمـەرجێك لەخۆی ڕاببینێ دادگەربێ: ﴿..فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً..﴾ (النساء: ٣).

بەڵێ ئەمجۆرە حوکمە شەرعییانەو هاووێنەکانیان، چەسپاوو نـەگۆڕو بـواری کۆششکردن(إجتهاد)یان تێدا نیە، مەگەر بۆ چـۆنیەتیو میکـانیزمی جێبـەجێ کردنیـان.

لێرەشدا کۆتایی بەم باسەمان دێنین، خوا پشتیوان بێ، لەباسی داهاتووشمانـدا تیشك دەخەینەسەر پێکهاتەی دووەمی ئیسلام.

## جۆری دووەمی پێکهاتەی ئیسلام

### ئەو لایەن و بوارانەی کە جگە لە هێڵە گشتییەکانیان و چوارچێوەکانیان، گۆڕاوو کراوەن:

ئەگەرسێ بوارەکانی جۆری یەکەمی پێکهاتەی ئیسلام: ئیمانو عەقیدەو خواپەرستیی‌و خووڕەوشت، زیاتر پەیوەندییان بە ڕووح‌و جەوهەرو کەسایەتی مەعنەویی مرۆڤەوە هەبوو، بۆیەش خوای کاربەجێ چەند دەقێکی ڕوونو بێ چەندوچوونو چەسپاوی بۆ دانابوون- چونکە وەك پێشتر گوتمان شەریعەتی خوای زاناو شارەزا بەگوێرەی مامەڵەی کاربەجێیانەی خۆی، بۆ شتی چەسپاوو نەگۆڕ یاساو حوکمی چەسپاوو نەگۆڕو، بۆ هی گۆڕاویش، یاساو حوکمی گۆڕاوو گۆڕانکاریی هەڵگری داناون-، ئەوە بۆ بوارو لایەنەکانی جۆری دووەمی پێکهاتەی ئیسلام وەك: سیاسیی‌و ئابووریی‌و ئیداریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و جەنگ‌و ئاشتیی و...هتد، کە زیاتر پەیوەندییان بە لایەنی جەستەیی‌و ڕواڵەتی مرۆڤو لایەنی ماددیی ژیانو گوزەرانەوە هەیە، یاسای گشتیی‌و فراوانو کراوەو گۆڕانکاریی هەڵگری داناون، جا دیارە هەربۆیەشە زاناو شارەزایانی شەریعەت لەو بارەوە، ئەم بنچنیە شەرعییە (قاعدة شرعية)یان داناوە: ((الأصل في العبادات الحظر والأصل في المعاملات الإباحة))، واتە: بناغە لە بواری خواپەرستییەکاندا قەدەغەکرانو ڕێ لێگیرانەو، بناغەش لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا ڕێ پێدرانە.

بەڵام من پێم وایە ڕاستترو چاکتر ئەوەیە،کەبگوترێ:

((الأصل في العقيدة والعبادات والأخلاق الحظر، والأصل في المعاملات بأنواعها الإباحة))، بناغە لە عەقیدەو خواپەرستییەکانو خووڕەوشتدا ڕێ لێگیراون و، بناغە لە هەڵس‌وکەوتەکاندا بەهەموو جۆرەکانییەوە، ڕێ پێدرانە.

مەبەستیش لەم بنچینە شەرعییە ئەوەیە،کەبناغەی مامەڵەکردن لەگەڵ عەقیدەو خواپەرستییەکانو ڕەوشتدا، ئەوەیە،کەمرۆڤی مسوڵمان، دەبێ پابەند بێ بەدەقە شەرعییەکانەوە ، بۆ نموونە: بۆی نیە هەر لەخۆوە، جۆرە خواپەرستییەك دابێنێو بە شێوەیەك لە شێوەکان بەندایەتی بۆ خوابکات، بەڵکو پێویستە چاوەڕێی فەرمانو مۆڵەتی شەرع بێتو تەنیا لەبەر ڕۆشنایی ویدا هەنگاوبنێ، بەڵام بە پێچەوانەوە بناغەی مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵس وکەتەکاندا بریتیە لە ڕێ پێدرانو دەستکراوەیی، مەگەر دەقێکی شەرعی ڕوونو بێ چەندو چوون شتێکی لەو حوکمە گشتیی یە هەڵاواردبێو قەدەغەی کردبێ.

ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، حیکمەتی ئەوەش- واتە هەبوونی دەقی زۆرو زەوەندو نوختە خرانەسەر پیت لە بوارەکانی ئیمانو عەقیدەو خواپەرستییو خووڕەشتداو، کەمیی دەقو وازهێنان بە دیاریکردنی چوارچێوەو هێڵە گشتییەکان، لەبواری هەڵسو کەوتەکان (سیاسیی، ئیداریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتی، جەنگو ئاشتی)دا- ئەوەیە کە:

بوارەکانی ئیمانو عەقیدەو خواپەرستییو خووڕەوشت، پەیوەستن بە ڕووحو جەوهەری مرۆڤەوە، کە زیاتر حاڵەتی چەسپاویی هەیە و، پێش ئەوەش پەیوەستن بە خوای بەرزو مەزنو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرانیو ڕۆژی دواییو بەهەشتو دۆزەخەوە، کە بێگومان چەند ڕاستییەکن گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئەمە لە لایەکەوەو لە لایەکی دیکەشەوە عەقڵ کەمتر سەرەدەری لەو بوارانەدا دەکات،کە بە زاراوی ئەودیو سروشت (میتافیزیك) تەعبیریان لێ دەکرێ، بۆیە پێویستە وەحی خوا قسەی سەرەتاو کۆتاییان تێدا بکاتو، نوختەیان تێدا لەسەر پیت دابنێ.

بەڵام بوارەکانی حوکمو سیاسەتو ئابووریو ئیدارییو جەنگو ئاشتیو کۆمەڵایەتی، زیاتر پەیوەستن بە لایەنی جەستەیی مرۆڤ و ماددی ژیانەوە و، زیاترحاڵەتی گۆڕاوییو گەشەکردنیان هەیەو، مرۆڤیش، تا ڕاددەیەکی باش

توانای ڕۆڵ گێڕانو ئەسپ تاودانی لەو بوارانەدا هەیەو توانای بەسەر ئەو بابەتانەدا دەشکێت، بۆیە خوای کاربەجێ، حیکمەتی، وای خواستوە، کە لەو بوارانـەدا بـە دانانی چوارچێوەیەکی فراوانو چەند هێڵێکی گشتیی، کە وەك قوچکەکانی سـەر ڕێ (معالم الطریق) وان، وازبێنێو دەرفەتێکی فراوانو باش بۆ بیرکردنەوەو کۆشش کردنو هەڵهێنجان (التفكر والإجتهاد والأستنباط) لەبەر ڕۆشنایی شەرعو واقیعدا بۆ مرۆڤــ برەخسێنێ.

ئێستاش با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست نموونەیەك بێنینەوە:

لەبواری حوکمو سیاسەتدا چەند دەقێکی کەمان هەن، کـە چوارچـێوەو هێڵـە گشتییەکانی حوکمو سیاسەت لە ئیسـلامدا دیـاری دەکـەن، بـەڵام ناچـنە نێـو وردەکارییەکانەوە، بۆ وێنـە:

* ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِ...﴾ (النساء: ٥٨)، واتە: خوابەجەختکردنەوە فەرمانتان پێ دەکات،کەسپاردەکان بگەیەننە دەستی خەڵکی شایستەیان،هەرکات دادوەرییتان لەنێو خەڵکیدا کرد، دادگەرانە بیکەن...

مەبەستیش لە سپاردەکان (الأمانات) لێرەدا -وەك زۆرێك لە توێژەرەوان گوتوویانەو سیاقیش دەیگەیێنێ- ئەرکەکانی بەرپرسیارێتیو حوکمڕانیین.

* ﴿..وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ..﴾ (الشـوری: ٣٨)، واتە: (بڕواداران) بناغـەی کاروبـار بەڕێوەبردنیان ڕاوێژە...

* ﴿... يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾ (النساء: ٥٩)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەنو فەرمانبەریی پێغەمبەربکەنوهی کاربەدەستانێك،کە لە خۆتانن، ،ئەگەربڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە باشترەو سەرەنجامیشی چاکترە.

لەم سێ دەقە قورئانییەدا ئەم چەند هێڵە گشتییە بۆ حوکم‌و سیاسەت دیـاری کراون، کە چوارچێوەیەکی فراوان پێکدێنن:

١- لەسەر مسوڵمانان پێویستە بەرپرسیاریێتی‌و سەرپەرشتیکردنی کۆمـەڵگا، وەك سپاردەیەك تەماشا بکەن‌و تەسلیمی کەسانی شایستەی خـۆی بکـەن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ..﴾.

٢- لەسـەر کاربەدەسـت‌و حوکمڕانـان فـەرزە، کـە دادگەرانـە حـوکمڕانیی‌و دادوەریی بکەن: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ﴾.

٣- لەسەر کۆمەڵگای مسوڵمانان‌و کیانی سیاسییان پێویستە ڕاوێـژ بناغـەی کاروبار بەڕێوەبردنیان بێت: ﴿..وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ..﴾.

٤- لەسەر مسوڵمانان پێویستە، کە فەرمانبەریی خوا بکـەن‌و فەرمانبـەریی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن (واتـە بـە قورئـان‌و سـوننەتەوە پابەنـد بـن)، هەروەها لـە سـنووری شـەرعدا گوێڕایـەڵی کاربەدەسـت‌و مشـوورخۆرانی خۆیشیان بکەن: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾.

٥- لەسـەر مسـوڵمانان بـە گشـتیی بـە کاربەدەسـت‌و خـەڵك‌و جـەماوەرەوە پێویستە، کە هەرکاتێك لەسەر شتێك کەوتنە کێشـەو مشـتومڕەوە - بـە تایبەت جەماوەرو کاربەدەستان- کێشەکەیان بگێڕنەوە لای کتێبـی خـواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و بە تەرازووی شەریعەت چارەسەری بکـەن: ﴿فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾.

دیارە ئەم پێنج بنەما گشتیی‌و سەرەکییە، هێڵە گشتییەکانی حوکم‌و سیاسـەتی ئیسلامیی‌و چوارچێوەی فراوانی حوکمڕانییەکەی پێك دێـنن‌و، خـوای کاربـەجێ وردەکارییەکان‌و چۆنیەتی‌و میکانیزمەکانی چەسپاندنی ئەو بنەما سـەرەکییانەی بەجێ هێشتوە بۆ عەقڵ‌و بیرکردنەوەو کۆشش کردنی مسوڵمانان، کە بە گـوێرەی بارودۆخ‌و هەل‌و مەرج‌و گۆڕانکارییەکانی ڕۆژگارە جیاوازەکان، بڕیاری گونجاویـان

لەبارەوە بدەن، لەبەر تیشکی ئەو هێڵە گشتیی و بنەما سەرەکییانەدا، کە خستماننە ڕوو.

ئیستاش بە پێویستی دەزانم، کە ئاماژە بکەم بۆ چەند هۆکارێکی نەرمیی (مرونة)و گونجاویی شەریعەتی ئیسلام، بەتایبەت لە بواری هەڵسوکەوتەکان (معاملات)دا لەگەڵ بەرەوپێشچوون و گەشەکردنی ژیان و گوزەرانی مرۆڤ و گۆڕانکارییەکانیدا:

## هۆکارەکانی نەرمیی و گونجاویی شەریعەتی ئیسلامیی

### ١- هەبوونی ناوچەیەکی ئازادو خاڵی لە دەق:

شەریعەتی ئیسلامیی وەك پێشتریش گوتمان لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا بە ئانقەست بۆشاییەکی زۆری بەجێ هێشتوە، چونکە زانیویەتی ئەو بوارە گۆڕانکاریی و تازەبوونەوە (تغيير وتجدد)ی تێدا زۆر دەبێ و، نەیویستوە دەست و پێی خەڵکی ببەستێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ما أحله الله في كتابه فهو حلال وما حرّمه فهو حرام، وما سكت عنه فهو عفو، فاقبلوا من الله عافيته، فإن الله لم يكن لينسى شيئاً، ثم تلا: ﴿..وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ..﴾ (مريم:٦٤).)) (أخرجه الحاكم وصححه عن أبي الدرداء).

واتە: ئەوەی خوا لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردوە حەڵاڵە و، ئەوەی قەدەغەی کردوە قەدەغەیە و، ئەوەی لێشی بێدەنگ بووە ڕەوایە، جا ڕەوایی خوا وەربگرن، چونکە بێگومان خوا هیچی لەیاد ناچێ - کەواتە لەڕووی حیکمەتەوە لێی بێدەنگ بووە-، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿ پەروەردگارت هەرگیز شتی لەیاد ناچێ﴾.

ئنجا ئەو ناوچە ئازادو بۆشەش، وەك زانایـانی (أصـول الفقـه) گوتوویانـە: بەهۆی (قیاس)و (إستحسان)و (إستصلاح -المصالح المرسلة-)و (عـرف)و (سـدُّ الذرائع)ەوە پڕدەكرێتەوە.

## ٢- باسكردنی زۆر بابەت بە شێوەیەكی بنچینەیی و گشتیی:

هۆكارێكی دیكەی فراوانی شەریعەتو گونجانی لەگەڵ بارودۆخو هەلومەرجە جۆراوجۆرەكاندا، ئەوەیە،كەزۆرجار یاساو ئاڕاستەكانی بە شێوەیەكی گشتییو وەك بناغەو بنەما دەخاتەڕوو و ناچێتە نێو وردەكارییەكانەوە، بۆ نموونە:

لە بواری دادوەریی (قضاء)دا، چەند دەقێكی سەرەكی گشـتی هـەن، وەك: ﴿..وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ..﴾ (النسـاء: ٥٨)، ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ...﴾ (المائـدة: ٤٩)، ﴿..فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ ..﴾ (ص: ٢٦).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {القضاة ثلاثة: قاضٍ في الجنـة، وقاضـيان في النار، فرجل عرف الحق فقضى به فهو في الجنة، ورجل عرف الحق فقضـى بغـيره فهو في النار، ورجل قضى على جهل فهو في النار} (رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه عن بريدة).

وەك دەبینین ئایەتـەكان فـەرمان دەكـەن، كـە بـەپێی شـەرعی خـواو بـە شـێوەیەكی حـەقو دادگەرانـەو دوور لـە ئـارەزوو دادوەریـی بكـرێ و، فەرمایشتەكەش دەیخاتەڕوو، كە هەر لە سێ دادوەران، یـەكیان بەهەشـتییە، ئەویش ئەوەیە،كەحەق دەزانێو حوكمی پێدەكات، بەڵام دووەكەی دیكـە، كـە حەق دەزانن و حوكمی پێناكەن، یان هەر لە ئەسڵدا لـە حـەق بێئاگـان، ئـەوە دۆزەخیین!

بەڵام قورئانو سـوننەت وردەكارییـەكانی دادوەریـی وەك: كـێ شایسـتەی دادوەرییییە؟ ئایا دروستە، كە دادوەریی جۆراوجۆر بێت، بۆ كاروبـاری خێـزان یەكێكو، بۆ تاوانەكان (جنایات) یەكێك و...هتد؟ ئایا دەكرێ دادگەریی پلە

پلەو ئاست بێت: بەرایی (إبتدائي)و تێهەڵچوونەوە (إستئناف)و هەڵبڕین (تمییز)؟ و...هتدیان باس نەکردوەو بۆ گۆڕانکارییەکانی کاتو شوێن بەجێیان هێشتوون.

## ٣- گشتگیریی دەقەکان لەڕووی هەڵگرتنی تێگەیشتن و بیروڕای جۆراوجۆرەوە:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی فراوانیی‌و گشتگیریی شەریعەتەو بە زاراوی زانایانی پسپۆڕی بواری (أصول الفقه) زۆر لە دەقەکانی شەریعەت، بەتایبەت لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا مانای جۆراوجۆرگەیێن (متعددة الدلالة)ن، نەك یەك ماناگەیێن (قطعية الدلالة).

بۆ نموونە: وشەی (قرء) لە ڕستەی: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ..﴾ (البقرة: ٢٢٨)، هەم بە مانای پاکبوونەوە لە خوێنی حەیزو، هەم بەمانای خودی حەیزیش هاتوە.

## ٤- ڕەچاوکردنی تێگیران و ناچاریی و حاڵەتە نائاساییەکان:

شەریعەتی دادگەرو کاربەجێی خوا، ڕەچاوی حاڵەتە ناهەموارو نائاساییەکانی تاكو کۆمەڵو تێگیرانو ناچارییەکانی کردوەو، ئەمەش هۆکارێکی دیکەی فراوانیی‌و گونجاوییەتی، خوای بەبەزەیی لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿...يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ..﴾ (البقرة: ١٨٥)، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێو نایەوێ سەغڵەتتان بکات، وە فەرموویەتی: ﴿..هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ..﴾ (الحج: ٧٨)، واتە: ئەو (خوایە) هەڵی بژاردوونو لە ئاییندا مایەی سەغڵەتکردنتانی دانەناوە، فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ..﴾ (البقرة: ١٧٣)، واتە:

بێگومان خوا بەس مردارو خوێن‌و گۆشتی بەرازو سەربڕاو بـۆ غـەیری خـوای لێتان قەدەغە کردوە، جا،ئەگەرکەسێك ناچار بوو، بێ ئەوەی بە ئارەزووەوە، یان زیاد لە ئەندازەی پێویست بخوات، ئەوە گوناهی ناگاتێ...

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {إن الله يحبّ أن تُؤْتَى رُخَصَهُ، كما يحُبُّ أن تُؤْتَى عَزائِمُهُ} (رواه أحمد وابن ماجه)، واتە: خوا وەك چۆن پێی خۆشە فەرزەکانی جێ بەجێ بکرێن، ئاواش حەز دەکات مۆڵەتەکانی وەربگیرێن.

## ٥- گۆڕانی فەتوا بەهۆی گۆڕانی کات و شوێن و عورفەوە:

ئەمیش کە وەك بنچینەیەکی شەرعیی، زانایانی ئیسلام لەسەری ڕێککەوتوون، هۆکارێکی دیکەی گشتگیریی‌و فراوانیی‌و ئاسانکاریی شەریعەتەو شەرعزانانی زەبردەستی وەك: (القرافي)و (إبن القيِّم)و (إبن عابدين)، کە یەکەمیان مالیکی مەزهەب‌و دووەمیان حەنبەلیی‌و سێیەمیشیان حەنەفییە، باس‌و خواسی زۆریان لەو بارەوە نووسیون و، هەردوو مەزهەبی کۆن‌و نوێی (شافیعی)یش لە عێراق‌و میصر، زۆر باوو ئاشکران‌و بەڵگەی گۆڕانی بیروڕاو فەتوان[1]!

ئنجا خوێنەری بەڕێز! بە پێویستی دەزانم بەرلەوەی کۆتایی بەم بوارەی سێیەمی خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی بێـنین، لـە باسـی داهاتووماندا تیشکێك بخەینەسەر چەمك‌و واتـای وشـەی ئـایین (دیـن)، کـە بەداخەوە بەهەڵەداچوون‌و حاڵی نەبوون لەو بارەوە، کەسانێکی تووشی هەڵـەو چۆرتمی زۆر بێڕەزاو کوشندە کردوە.

---

(١) تێبینـی: بـۆ نووسـینی ئـەم باسـە: ((هۆکارەکـانی نـەرمیی و گونجـاویی شـەریعەتی ئیسـلامیی)) سـوودم لـە کتێبـی: (التطرف العلمـاني في مواجهـة الإسـلام)ی د. یوسـف القرضاوي، وەرگرتوە، ص٦٤ تا ٦٩.

## چەمك و واتای وشەی ئایین (دین)و هەڵەیەکی سەرلێشێوێن:

خوێنەری بەڕێز! یەکێك لەو هەڵە زەقانەی زۆربەی هەرەزۆری سیکۆلاریستەکان -،ئەگەرنەڵێین هەموویان- گیرۆدەی بوون، بریتیە لە خراپ تێگەیشتن لە چەمکی وشەی (ئایین)و، پاشان بنیاتنانی دیواری کۆمەڵێك ئەنجامگیریی هەڵەو سەیرو سەمەرە لەسەر ئەو بناغە لارە!

با بزانین چۆن؟

جارێ ئەوان لە سەرەتاوە پێیان وایە وشەی ئایین (دین)، ناوونیشانێکە تەنیا بەرنامە ئاسمانییەکان (الشرائع السماوية) دەگرێتەوە! پاشان هەڵەیەکی دیکەش دەخەنە پاڵ ئەم هەڵەیانو وادەزانن، کە بەرنامە خواییەکان (الشرائع الإلهية) لە (ئایین بوون)دا هەموویان وەك یەكو یەکسانن! ئنجا دوایی لەسەر ئەم دوو تێگەیشتنە هەڵەیە، دێنن چەندان ئەنجامگیریی هەڵەو سەقەت دەکەن، کە زۆر لە حەقو ڕاستییو واقیعەوە دوورن، بۆ نموونە:

کاتێك دەبیستن، یان دەخوێننەوە، کە (مارکس) گوتوویەتی: (ئایین تلیاکی گەلانە)، یان دەبیستنو دەخوێننەوە، کە کاتی خۆی لە سەدەکانی نێوەڕاستدا کڵێساو نەصرانییەت لەگەڵ زانستو زانایاندا تێکگیراون، پێیان وایە شتێکی ڕاستو ڕێكو بێ گرێو گۆڵو ڕەوایە، کە هەم حوکمەکەی (کارڵ مارکس)و هەم هەواڵەکەی لەگەڵ زانستدا تێکگیرانی کڵێساو نەصرانییەت، بێ قەیدو مەرج بگشتێنرێن، بەسەر هەموو بەرنامەکانی خوادا بەبێ جیاوازیی، بە بەڵگەی ئەوە، کە هەموویان هەر (ئایین)ن!!

بەڵام بێگومان ئەو جۆرە هەڵوێست نواندنەو ئەو تەرزە حوکم دانە، ڕەفتارێکی سادەو سەرکێڵانەیەو، وەك ئەوە وایە، کە (کورد)ێك هەڵەو تاوانێکی لێ بپشکوێتەوەو بابایەکی غەیرە کوردیش بێتو ئەو هەڵەو تاوانە بخاتە ملی هەموو کوردێکەوەو بەسەریاندا ببڕێ، تەنیا لەبەر ئەوەی لە (کورد بوون)دا لەگەڵ ئەو بابایەدا یەکدەگرنەوە!!

ئێستاش با كەمێك لەبارەی چەمكو واتای وشەی ئایین (دین)ەوە بدوێین، تاكو دەربكەوێ، كە وشەی ناوبراو لە بەكارهێنانی زمانو قورئاندا تایبەت نیە بە بەرنامەكانی خواوەو، سەرجەم بەرنامەو سیستەمەكان (المناهج والأنظمة) دەگرێتەوە،ڕەواش نیە وابزانرێ، كە كۆبوونەوەی بەرنامە خواییەكان لەژێر ناوونیشانی وشەی ناوبراودا، بەڵگەی وەك یەك بوونو یەكسان بوونیانە!

دیارە وشەی (ئایین) تەرجەمەی وشەی (دین)ەو وشەی (دین)یش، هەم لە زمانی عەرەبیو هەم لە بەكارهێنانی قورئانیشدا، چوار واتای هەن:

یەكەم: سزاو پاداشت [ الجزاء ]:

وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ (الفاتحة: ٤)، واتە: خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە..

دووەم: گەردن كەچیی [ الخضوع ]:

وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ..﴾ (البقرة: ١٩٣)، واتە: وە لەگەڵیاندا بجەنگن، تاكو ئاژاوەو ئازاردان -ی مسوڵمانان- نامێنێو، ملكەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ...

سێیەم: بەرنامەو سیستەمی ژیان [منهج نظام الحياة] بەگشتیی چ لە خواوە هاتبێ چ لە غەیری خوا:

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ﴾ (الكافرون)، واتە: ئەی كافرینە! ئەوەی ئێوە دەیپەرستن

منناپەرستم، ئێوەش ئەوەی من دەیپەرستم ناپەرستن، لە داهاتووشدا من ئەوەی ئێوە دەیپەرستن ناپەرستم، ئێوەش لە داهاتوودا ئەوەی من دەیپەرستم ناپەرستن، بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان‌و بەرنامەی خۆشم بۆ خۆم.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ..﴾ (الفتح: ٢٨)، واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی‌و بەرنامەی ڕاستەوە ڕەوانەکردوە، تاکو بەسەر هەموو بەرنامەکاندا سەری بخات..

هەر لەو بارەوە، کە وشەی (دین) بە مانای بەرنامەو سیستەمی ژیانە، خوا فەرموویەتی: ﴿..كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ..﴾ (یوسف:٧٦)، واتە: ئاوا بەو جۆرە تەگبیرمان بۆ یوسف کرد (کە بنیامێنی برای لای خۆی گل بداتەوە)، ئەگەرنا بەپێی بەرنامەی پادشا -ی میصر- بۆی نەبوو برایەکەی بگێڕێتەوە...

چۆنیەتی دەلالەتی ئەم ئایەتانەش لەسەر ئەوە، کە یەکێك لە مانایەکانی وشەی (دین) بریتیە لە بەرنامەو سیستەمی ژیان‌و گوزەران، چ لە خواوە هاتبێ، چ لە غەیری خوا، بەم شێوەیە:

أ- لە سوورەتی (الکافرون)دا خوا سبحانه وتعالی فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات،کە بە کافرەکان بڵێ: من ئەوە ناپەرستم، کە ئێوە دەیپەرستن... ئایینی خۆتان بۆ خۆتان‌و ئایینی خۆشم بۆ خۆم.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە وشەی (الکافرون) ئەلیف‌و لامی (تعریف)ی لەسەرە، تێکڕای کافران دەگرێتەوە، کەواتە: سەرجەم کافرەکان هەر بەرنامەو ڕێبازێکیان هەبێ، مانای وایە ئایینێکیان هەیەو،شوێن (دین)ێك کەوتوون، کە غەیری ئیسلامە، جادیارە،ئەگەرخاوەن کتێب بن وەك جوولەکەو دیانەکان، ئەوە بەرنامەیەکی خوایی تێکدراو (محرَّف)یان هەیەو، ،ئەگەرخاوەن کتێبی

ئاسمانییش نەبن، ئەوە ئایینەکانیان ئەو بەرنامەو سیستەمانەن، کە زادەی بیروهۆشی مرۆڤــن.

ب- ئایەتەکەی (الفتح)یش، کە لــە (التوبة)و (الصف)یشدا هاتــوە، خوا ﷻ تێیدا ختوویەتەڕوو، کە پێغەمبەری کۆتایی خـۆی (محمد) ﷺ ی بە ڕێنمـایی‌و بەرنامەیـەکی حـەق‌و ڕاستەوە ناردوە، تـاکو لەڕووی حەق‌و ڕاست بوونەوەو، بە بەڵگە بەسەر تێکڕای ئایینەکانـدا زاڵـی بکـات، کەواتـە: ئیسـلام‌و بەرنامـەو سیستەمەکانی دیکـە هەموویان لە ئایین (دین) بووندا،یەکن، ئەوەندە هەیە ئیسلام ئـایینی حەق‌و ڕاستەو ئەوانیش ناهەق‌و ناڕاست.

ج- لە ئایەتەکـەی (یوسـف)یشـدا خـوای کاربـەجێ ڕوونـی کردۆتـەوە، کە،ئەگەرئەو تەگبیرەی بۆ یوسف عليه السلام نەکردبایە، ئەوە بەپێی ئـایینی پادشای میصر نەیدەتوانی برایەکـەی بـە بارمتـە لـەلای خـۆی گـل بداتـەوە، تەگبیرەکـەش ئـەوەبوو، کـە (یوسـف) بـەپێی شـەریعەتی (یعقوب) عليه السلام و برایەکانی مامەڵە لەگەڵ بنیامینی برایدا بکات، کە بەرواڵەت دزیی لێ ئاشکرا بووە، نەك بە گـوێرەی ئـایین‌و بەرنامــەی پادشا (دین الملك)، جا دیارە بەپێی شەریعەت‌و ئایینی یەعقووب عليه السلام بۆی هەبووە برایەکەی لە بەرانبەر دزییدا، بە بارمتە لەلای خۆی گـل بداتەوە، بەڵام بەپێی ئایینی پادشا سزایەکی دیکەی هەبووە!

وەك دەبینین خوا ﷻ سیستەم‌و بەرنامەی پادشا کافرەکەی میصری بە ئایین (دین) ناوبردوە، کەواتە هەموو بەرنامـەو سیسـتەمێکی ژیـان‌و گوزەران جۆرە (ئایین)ێکە.

## چوارەم: ئیسلام، دوایین بەرنامەی خوا [المنهج الإلهي الأخير]:

بەڵێ! مانای چوارەمی وشەی (دین) بریتیە لە ئیسلام، دوایین بەرنامـەی خوا بۆ مرۆڤــایەتیی، جا شایانی باسە، کە هەرکاتێك خوای بەرزو مەزن

وشەی (دین)ی بۆ پێناسەکردنی ئیسلام بەکارهێنابێ، وەسفو بەند (قید)ێکی جیاکەرەوەی خستۆتەسەر، وەك:

١- دین الله: ﴿ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ﴾ (النصر: ٢)، واتە: خەڵکت بینی کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە نێو بەرنامەی خواوە..

٢- دین الحق: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ .. ﴾ (الفتح: ٢٨)، واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی‌و بەرنامەی ڕاستەوە ڕەوانەکردوە..

٣- الدین القیّم: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ .. ﴾ (الروم: ٤٣)، واتە: جا ڕووی خۆت بەرانبەر بە بەرنامەی ڕێك‌و ڕاست، ڕێك بکە..

٤- دیناً قِیماً: ﴿دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا .. ﴾ (الأنعام: ١٦١)، واتە: بەرنامەیەکی ڕاستە، ڕێبازی ئیبراهیمە هیچ لاریی تێدانیە..

٥- الدین: ﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ .. ﴾ (آل عمران: ١٩)، واتە: بێگومان بەرنامە -ی پەسند- لای خوا، تەنیا ئیسلامە..

ئنجا دیارە بەپێی سیاقی ئایەتەکانیش بۆمان دەردەکەوێ، کە وشەی (دین) بەکام لەو مانایانە بەکارهاتوە،هەرکات وشەی (دین) بەمانای بەرنامەو ئایین بەکارهاتبوو، ئەگەرهیچ وەسف‌و قەیدی لەسەر نەبوون، ئەوە مەبەست پێی ئایین‌و بەرنامەیە بە گشتیی، بەڵام،ئەگەربە وەسف‌و قەیدێك تایبەت کرابوو، کە مەبەست پێی مەدح بوو، ئەوە لەو شوێنەدا مەبەست پێی ئیسلامە.

کەواتە: وشەی ئایین (دین) لە بەکارهێنانی زمان‌و قورئاندا، مەبەست پێی بەرنامەو ڕێبازی ژیان‌و گوزەرانە بەگشتیی، جا چ ئەو بەرنامەیە خوایی‌و ئاسمانیی بێت، چ بەشەریی‌و زەمینی،ئەگەرخوایی‌و ئاسمانییش بوو، چ بە ساغیی‌و دەستکاریی نەکراویی مابێتەوە، کە تەنیا ئیسلامە، چ دەستکاریی کرابێ‌و گۆڕرابێ، وەك: جوایەتی‌و دیانەتیی (الیهودیة والنصرانیة).

چا بینا لەسەر ئەوە، کە ڕابرد دەڵێین:

یەکەم: هەر فیکرەو بیردۆزەیەك، کرابێتە بەرنامەو ڕێبازی ژیانو گوزەران سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە ئایین (دین) دادەنرێ و، بەو پێیە وەك چۆن بەرنامەکانی: ئیسلامو جوایەتیو دیانەتیی، ئایین (دین)ن، بە هەمان شێوەش بەرنامەکانی وەك: کاپیتالیزمو سۆسیالیزمو لیبرالیزمو سیکۆلاریزم و...هتدیش، ئایینن.

دووەم: وەك چۆن بەرنامەو ئایین بوونی هەرکام لە کاپیتالیزمو سۆسیالیزم ئەوە ناگەیەنێ، کە لە هەموو شتێکدا وەك یەكو یەکسانن و، بگرە وەك یەکیش دەچن! بە هەمان شێوەش ئایین (دین) بوونی ئیسلامو دیانەتیی (نصرانية)یشو لە ئەسڵدا، لە خواو ئاسمانەوە هاتنیان، مانای وانیە، کە وەك یەكو یەکسانن و، هەر حوکمێك یەکێکیانی گرتەوە، ئەوی دیکەشیان دەگرێتەوە!

ئاخر بەڕاستی سەیرە، کە بە بیانووی ئایین بوونو ئاسمانیی بوونی هەرکام لە ئیسلامو نەصرانییەتەوە، بخرێنە تەرازوویەکەوەو بەیەك چاو سەیر بکرێن و، هەموو ئەو عەیبو عارو ناتەواوییانەی، کە بەهۆی گۆڕرانو شێوێنرانو خراپ بەکارهێنران (استغلال)ەوە لە نەصرانییەتدا پەیدا کراون، وەك: دژی عەقڵو زانست بوون و، لە بەرەی ستەمکارو چەوسێنەراندا بوون و، دژایەتی کردنی ئازادیی و...هتد پاڵ بدرێنە لای ئیسلامیش و، ئیسلامی پاكو بێ خەوشو بەرنامەی کۆتایی خوا بۆ مرۆڤایەتی، باجی نەصرانییەتی شێوێنراوو بەرنامەیەکی لە ئەسڵدا بۆ قۆن و هەلو مەرجێکی تایبەتی نێرراو، بدات! ئایا ڕەوایە نووسەرە بوێرو هەقبێژو دڵسۆزەکان، هەر چونکە لە (نووسەر)بووندا، لەگەڵ نووسەرە هەلپەرستو دەهۆڵ کوتو موخەننەتەکاندا پێك دەگەنەوە، باجی هەڵەو پەڵەکانی

ئەوان بدەنو بەیەك چاو تەماشا بکرێن؟!![1]

کەواتە: لەمەودوا، با لایەنگرانی تەوژمی سیکۆلاریزمو خەڵکی دیکەش، ئەگەردەیانەوێ شێوازی نووسینو ئاخاوتنیان زانستییانە بێت، نەك سەرکێڵو دیماگۆگیی نە، هەرکاتێك بەگشتیی باسی ئایین (دین)یان کرد، ئاگاداری چەمكو واتایەکەی بن و، بزانن کە عەلمانییەتەکەی خۆشیان جۆرە ئایینێکە، بەڵام زەمینییو مرۆڤکرد، هەرکاتێکیش باسی بەرنامە ئاسمانییەکانیان کرد، بەتایبەت ئیسلامو نەصرانییەت، با دیاریی بکەن، مەبەستیان پێ کامەیانەو یەك وشەو پێناسە بۆ هەموویان بەکارنەهێنن، چونکە بێگومان ئیسلامو نەصرانییەت - بەم حاڵەی ئێستایەوە - نێوانیان ئاسمانو ڕێسمانەو، وەك گوتراوە: (بەس خوایان یەکە!).

خوێنەری بەڕێز!

لێرەشدا کۆتایی بە توێژینەوەمان لەبارەی: ((خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانی نێوان تەوژمی ئیسلامییو عەلمانیی لە بواری فیکرو زانستدا)) دێنینو، خوا یاربێ لە ئاڵقەی داهاتوومانددا لە بواری حوکمو سیاسەتدا، سەرنجی خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانی هەردوو تەوژمی ئیسلامییو عەلمانیی دەدەین.

---

[1] یان ئایا ڕەوایە کە میدیای ئازاد و ڕەسەن و سەربەخۆ، لەگەڵ ئەوەدا کە پێی دەگوترێت (میدیای سێبەر) و من پێی دەڵێم (میدیای پاشکۆ و وابەستەو دابەستە)، کە لەلایەن حیزبە پارەدارەکانەوە تەمویل و ئاراستە (توجیە) دەکرێن، بخرێنە تەرازوویەکەوە؟!



## ئاڵقەی چوارەم:

## لە بواری دەوڵەتداریی و حوکمڕانییدا

**خوێنەری سەنگین!**

**لە باسەکانی ڕابردوودا لە هەرسێک بواری: (بوونناسیی)و (بیروبڕوا)و (فیکرو زانست)دا، باسی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانی تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانییمان کردو، بە شێوەیەکی گشتیی خستمانەڕوو، کە لە کوێو کوێو لە چیو چیدا پێک دەگەنەوە،یان لەیەک جیادەبنەوە، شایانی باسیشە،کەئێمە لە ڕیزکردنی هەرسێک بواری ڕابردووی پێکەوە بەراوردکراوی ئەو دوو تەوژمەدا، ڕەچاوی ڕیزبەندیی (ترتیب)ی مەنتیقیمان کردوە، چونکە - وەک پێشتریش ڕوونمان کردۆتەوە- جۆری بوونناسیی و تێڕوانینی مرۆڤ بۆ خوا ﷻ و بوونەوەرو ژیانو دنیاو دوارۆژ، کە بیروبڕوایەکەی دیاری دەکات و، بیروبڕواش بناغەی بیرکردنەوەیەو کاریگەریی ئەوتۆی لەسەر حاڵەتی فیکریی و زانستیی مرۆڤ هەیە.**

ئنجا لەم ئالْقەیەشدا لە بوارێکی دیکەی گرنگدا، سەرنجی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە لێکچووو لەیەك جیایەکانیان دەدەین، کە بریتیە لە بواری (دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانیی) یان (حوکم‌و سیاسەت)، بۆ سێناکردنی خستنەڕووو فامکرانی بابەتەکەش، دەیکەینە سێ بەشەوە، لە بەشی یەکەمیاندا -کە ئەم باسەی ئێستایە- سێ مەسەلەی گرنگ دەخەینەڕوو، کە تیشك دەخەنە سەر سروشتی ئیسلام‌و سیکۆلاریزم‌و جۆرو چۆنیەتی پەیوەندییان بە حوکم‌و سیاسەتەوە، لە بەشی دووەمیشیاندا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر سروشتی هەرکام لە ئیسلام‌و سیکۆلاریزم لە بواری حوکم‌و سیاسەتدا، لە بەشی سێیەمیشیاندا، بەراوردێك لەنێوان ئیسلام‌و عەلمانییەت‌و، ئیسلامیی‌و عەلمانییەکاندا دەکەین، کە ئایا لە بواری دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانییدا خاڵەکانی پێکگەیشتن‌و لەیەك دوورکەوتنەوەیان چی‌و چین؟

ئێستاش ڕاستەوخۆ دەچینە سەر بەشی یەکەمی بابەتەکەمان:

## سروشتی هەرکام لە ئیسلام و سیکۆلاریزم لەبواری حوکم و سیاسەتدا

### (١) سروشتی هەرکام لە ئیسلام و سیکۆلاریزم، هەبوونی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی دەخوازێ:

بەڵێ، هەرکام لە ئیسلام‌و سیکۆلاریزم بە سروشت، هەبوونی قەوارەی سیاسیی دەخوازن، چونکە وەك لە ڕابردوودا خستمانەڕوو، هەردووکیان بەرنامە(دین)ن‌و دەشیانەوێ سەرجەم بوارو لایەنەکانی ژیان‌و گوزەرانی مرۆڤ بگرنەوە و، ئاشکراشە،کەئایین‌و بەرنامەیەکی وا گشتگیر، ناگونجێ بەبێ دەوڵەت‌و قەوارەی سیاسیی جێبەجێ بکرێ.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتریش دەڵێین:

پێویستی هەبوونی ئیسلام بە دەوڵەت لەو ڕووەوەیە، کە ئیسلام بە پێچەوانەی حاڵی بوونی هەندێك کەسەوە، وەك ئایینی شێوێنراوی نەصرانیی نیە، کە تەنیا پەیوەست بێ بە تاك(فرد)ەوەو، لە جوغزی لایەنی عەقیدەیی و ڕووحیی و ئەخلاقییدا کورت هەڵهاتبێ!

بەڵکو ئیسلام ئایینو بەرنامەیەکی هەمەلایەنەو گشتگیرە، کە پەیوەندی بەتاكو خێزانو کۆمەڵگاوە هەیەو، دەروونو دەر (باطن وظاهر)ی مرۆڤو سەرجەم لایەنەکانی ژیانو گوزەرانی تاکییو خێزانییو کۆمەڵایەتییو مەعنەوییو ماددیی، دەگرێتەوە، بگرە وێڕای ژیانی دنیای زووتێپەڕ، پەیوەندی بە ڕۆژی دواییشەوە هەیەو، لە ڕێنماییو یاساکانیدا حیسابی ڕۆژی دواییش کراوە!

جا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئێمە هەم لە کتێبی: (ئیسلامو مسوڵمانەتییو کاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا)[1]، داو هەم لە نامیلکەی: (سیاسەتی ئیسلامییو چەند ڕوونکردنەوەیەك)دا[2]، تا ڕاددەیەکی باش تیشکمان خستۆتە سەر ئەم بابەتە، لێرەدا چیدی بەدوای ناکەوینو دەپرسین:

ئایا ئیسلامێك، کە لەسەر شوێنکەوتوانی خۆی فەرز کردوە، کە:

١- دادگەریی لەنێوان خۆیاندا بچەسپێنن: ﴿..وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ..﴾ (الشورى:١٥)، وە لەنێو خەڵکیشدا دادگەریی بەرقەرارو سەقامگیر بکەن: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ..﴾ (الحديد:٢٥).

٢- بەشێوەیەکی دادگەرانە لەنێو خەڵکیدا بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەو مشتو مڕەکانیان دادوەریی بکەن: ﴿..وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ..﴾ (النِّساء: ٥٨).

---

(١) چاپی یەکەم/٢٠٠٦.

(٢) چاپی یەکەم/٢٠٠٧.

٣- هەرکەسێك هێمنیی‌و ئاسایشی خەڵکی خستە مەترسییەوەو دەستدرێژیی کردەسەر گیان‌و سامانیان، بەگوێرەی تاوانەکەی، یەکێك لە چوار سزای: کوشتن، هەڵواسین، دەستی ڕاست‌و پێی چەپ برین،دوورخستنەوەلەوڵاتی، بەسەردا بچەسپێنن: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ ..﴾ (المائدة: ٣٣).

٤- هەرکات دوو کۆمەڵ لە مسوڵمانان پێکەوە بەشەڕهاتن، پێویستە ئاشتەوابیان لەنێواندا بکەن و،ئەگەرلایەکیان هەر وازی نەهێناو لەسەر ئاژاوە سوور بوو، پێویستە،ئەگەر بەجەنگ‌و کوشتاریش بووە، دەستی بگرن‌و لە سنووری خۆیدا ڕایگرن: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾ (الحجرات: ٩).

٥- هەرکات لایەنێك شەڕی پێ فرۆشتن‌و یەخەی پێ گرتن‌و دەستدرێژیی کردنەسەر، جەنگی لەدژ بکەن‌و بەرپەرچی ستەم‌و دەستدرێژییەکەی بدەنەوە: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ ..﴾ (البقرة: ١٩٠)، ﴿..فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ (البقرة: ١٩٤).

بەڵێ، ئایا ئیسلامێکی ئاوا، دەگونجێ بەبێ دەوڵەت‌و قەوارەی سیاسیی بەڕێوە بچێ‌و، هیچ کام لەم پێنج ئەرکە گرنگەی پێ جێبەجێ بکرێن، چ جای هەموویان و، چ جای چەندان ئەرك‌و کاری دیکەی گەورەو گرنگ؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا دەربارەی پێویست بوونی قەوارەو دەسەڵاتی سیاسیی بۆ سیکۆلاریزم، دەڵێین:

کاتی خۆی -وەك پێشتر باسمان کرد- سیکۆلاریزم لە کاردانەوەی حکوومـەتی ئایینی (تیۆکراسی) لـە ڕۆژئـاوادا سـەری هەڵـدا، دوای ئـەوەی نەصـڕانییەت‌و کڵێسایەکەی، بۆ ماوەی چەندان سەدە بەناوی خـوا و (مەسـیح)ەوە حوکمڕانییـان کرد، بەڵام چ حوکمڕانییەك!

بە شێوەیەك، کە کڵێساو چینی ئەکلیرۆس، خۆیان لە خەڵك‌و جەماوەر کردبوو بە خاوەنی موتڵەقیان و، خەڵك‌و جەماوەر لە بەرانبەریاندا، نەك هەر خاوەنی ماڵ‌و سامان، بگرە ڕووح‌و عەقڵ‌و ویژانیشیان نەبوون!

جـا دیـارە شـتێك لـە کاردانـەوەو لـەدژی شـتێکیش پەیـدابێ، دەبێتـە جێگرەوە(بدیل)ی و، بە کردەوەو لە واقیعیشدا سیکۆلاریزم، پاش بەزانـدن‌و جـێ پێلێژکردنی کڵێساو چینی ئەکلیرۆس، بەر لە هەر شتێك لـە دەوڵـەتی نەتـەوەیی (الدولة القومية)و دەستەڵاتی زەمەنیی (السلطة الزَّمنيَّة) دا بەرجەستە بوو.

کەواتە: بەڵێ سروشتی هەرکام لە ئیسلام‌و سـیکۆلاریزم، هـەبوونی قـەوارەی سیاسیی و دەوڵـەت دەخـوازێ، بـەڵام جیـاوازی نێـوان سروشـتەکانیان‌و شـێوەی دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانییەکەشیان لەیەك جیایە، هەرچەندە خاڵی هاوبەشیشیان لە نێواندا هەن، وەك تۆزێکی دیکە دەیخەینەڕوو.

**(٢) وردەکارییـەکان ( تفاصـيل )ی حـوکم و سیاسـەت و میکـانیزمی پێکهێنانی دەوڵەت و دەزگایەکانی و، پێویست بوونی قەوارەی سیاسیی لە ئیسلام دا، دوو شتی لەیەك جیان:**

شتێکی ئاشکرایە، کە لـە دەقـەکانی قورئـان‌و سـوننەتدا، وردەکارییـەکانی چـۆنیەتی بنیاتنـانی دەوڵـەت ودام‌و دەزگایـەکانی‌و، میکـانیزمی بـەڕێوەبردنی نەخراونەڕوو، حیکمەتی ئەوەش - وەك لە نامیلکەی (سیاسـەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونکردنەوەیەك)دا باسمکردوە- ئەوەیە،کەشەریعەتی تێروتەواوی خوای کاربەجێ، لەبواری هەڵسوکەوتەکان (معاملات)دا -کە بێگومـان حوکم‌و سیاسەتیش بەشێکی گرنگی ئەو بوارەیە- لە سۆنگەی ئەوەوە، کە گەشەکردن‌و گۆڕانکاریی زۆریان تێدا

ڕوو دەدات، تەنیا هێڵە گشتییەکانو بنەما سەرەکییەکانی داناوەو، نەچۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، بەڵکو ئەو مەیدانەی بە بۆشایی بۆ گۆڕانکارییەکانی ژیانو گوزەران بەجێ هێشتوە، تاکو مرۆڤ لەبەر ڕۆشنایی شەرعو پێداویستی واقیعدا کۆششیان بۆ بکاتو ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە.

بەڵام پێویستە بزانرێ، کە نوختە لەسەر پیت دانەنانی ئیسلام لە بواری حوکمو سیاسەتداو،وازهێنانی بەدیاریکردنی چوارچێوەیەکی فراوانو هێڵە گشتییەکان، ئەوە ناگەیەنێ، کە ئیسلام هەبوونی قەوارەی سیاسییو بنیاتنانی دەوڵەت، بە پێویست نازانێ! چونکە ئەو دوو مەسەلەیە لەیەك جیان، چونکە وەك پێشتر گوتمان: سروشتی ئیسلام لە خودی خۆیدا هەبوونی دەوڵەت دەخوازێ و، بەبێ قەوارەو دەسەڵاتی سیاسیی، مسوڵمانان ناتوانن زۆربەی هەرەزۆری ئەرکەکانیان ڕاپەڕێنن و، ئامانجە مەزنەکانی ئیسلام بچەسپێنن، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ ﷻ هێنانەدی چوار ئامانجی گەورەو سەرەکی: (نوێژ بەرپاکردنو زەکات دانو فەرمان بەچاکەکردنو ڕێ لە خراپەگرتن)ی پەیوەست کردوە بە هەبوونی قەوارەی سیاسییەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿..وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ۝ الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ (الحج: ٤٠-٤١).

بەڵام لەبەر حیکمەتێك - کە ئاماژەمان پێکرد- ئیسلام چوونە نێو وردەکارییەکانی حوکمو سیاسەتی بەپێویست نەزانیوەو، ناوچەیەکی زۆری لەو بوارەدا بەبۆشایی هێشتۆتەوە، تاکو مسوڵمانان بە گوێرەی گۆڕانو پەرەستاندنی زەمانو پێداویستی ژیانو گوزەرانیانو، لەڕێی بیرکردنەوەو کۆشش کردنو بەرهەمی عەقڵو ئەزموونی خۆیانو خەڵکی دیکەوە پڕی بکەنەوە.

کەواتە: نەبوونی وردەکارییەکانی چۆنیەتی بنیاتنانی دەوڵەتو دامودەزگایەکانی میکانیزمی بەڕێوەبردنی، بەڵگەی پێویست نەبوونی قەوارەو دەسەڵاتی سیاسیی نیە، وەك بەداخەوە هەندێك کەس واحاڵی بووەو تووتییانە ئەو

قسانەی (علي عبدالرازق) دووبارە دەکەنەوە، کە لـە کتێبـی: (الإسـلام وأصـول الحكم)دا کردوونیی‌و، پاشانیش لێیان ژیوان بۆتـەوە، دوای ئـەوەی ژمارەیـەك لـە زانایان بەرپەرچیانداوەتەوەو (الأزهر)یش سزایداوەو نازناوی زانایی(العالِميّة)ی لیّ ستاندۆتەوە[1]!

(٣)- هەرچەندە شەریعەت و ردەکارییەکانی دەوڵەت و حوکمڕانیی باس نەکردوون، بەڵام چوارچێوەیەکی فراوان و هێڵە سەرەکییەکانی دیاری کردوون:

دەتوانین لەم حەوت خاڵەی خوارەوەشدا، بەکورتی ئامـاژە بـۆ ئـەو چوارچێوە فراوان‌و ئەو هێڵە گشتیی‌و سەرەکییانە بکەین:

## ١. حوکمڕانێتی باڵا هی خوایە کە لە سەروەریی شەریعەتەکەیدا بەرجەستە دەبیّ:

ئەم ڕاستییە بەردی بناغـەی سیاسـەت‌و حوکمڕانێتییـە لـە ئیسـلامداو، مەبەستیش پێی ئەوەیە،کەمسوڵمانان لەسەریان پێویسـتە، خـوای بـەرزو مـەزن، وەك چـۆن تاکـە بەدیهێنـەرو پەروەردگاریانـەو تاکـە پەرستراو(معبود)یانە - بە چەمکی تایبەتی خواپەرستیی-، تاکـە حـاکم‌و حەکەمیشیان بێت‌و، بێجگە لە بەرنامەو ڕێبازو حوکمی وی، هیچ بەرنامەو ڕێبازو حوکمێکی دیکـە بـۆ ڕێکخسـتن‌و بـەڕێوەبردنی ژیـان‌و گوزەرانیـان بەکارنەهێنن، ئەگەرنا، وەك چۆن بە سەجدەو ڕکووع بردن‌و نوێژ بەرپا کردن‌و ڕۆژووگرتن‌و قوربانی سەربڕین بۆ غەیری خوا، دووچاری هاوەڵ بۆخوا دانان (الإشراك بالله) دەبن‌و لە بازنـەی ئیمـان‌و ئیسـلام دەردەچـن، بـە هـەمان

---

(١) بڕوانە کتێبی: (حكم هيئة كبار العلماء في كتـاب الإسـلام وأصـول الحكـم) ط٢ ص ٣١، ٣٢.

شێوەش بەوەرگرتنی بەرنامەو حوکم لە غەیری خواو شوێن نەکەوتنی شەرعو ئایینی خواش، گیرۆدەی شیركو كوفر دەبن، چونکە خوا ﷻ وەك چۆن فەرموویەتی: ﴿..وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًا﴾ (الكهف: ١١٠)، فەرمووشیەتی: ﴿..وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا﴾ (الكهف: ٢٦).

هەروەها بەڕاشکاویی ڕایگەیاندوە، کە هەرکەسێك ملکەچی بەرنامەو حوکمی غەیری خوابێ، ئەوە دەچێتە ڕیزی هاوبەشدانەران (مشرکین)ەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿..وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام: ١٢١)، هەروەها خوای کاربەجێ کورت هەڵهێننی حوکم لەخواداو تەنیا بەندایەتیکران بۆ خوای، وەك دوو ڕووی یەك دراو دانـاون: ﴿..إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ..﴾ (یوسف: ٤٠)، واتە: حوکم تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە، کە جگە لەو نەپەرستن، ئائەوەیە ئایینی ڕاست..

بۆیەش گوتوومانە: حوکمڕانێتی باڵا (الحاكمية العُليا)، چونکە مرۆڤەکانیش لە سێبەری حوکمڕانێتی خواو لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتەکەیدا، حوکمڕانێتییەکی بچووکیان هەیەو،بۆیان هەیە بۆ هەموو ئەو مەسەلانە، کە شەریعەت یاساو بڕیاری بۆ دیاری نەکردوون، یاساو بڕیاری گونجاو لە چوارچێوەی شەریعەتدا دابنێن.

بۆیەش گوتوومانە: حوکمڕانێتی باڵای خوا لە سەروەرێتی شەریعەتەکەیدا بەرجەستە دەبێ، چونکە خوا ﷻ فەرمانی بەپێغەمبەری خۆی (محمد) ﷺ و پەیڕەوانی کردوە، کە بەپێی ئەو کتێبو شەریعەتەی ناردوویەتە خوارێ، حوکمڕانییو دادوەریی بکەن:

﴿وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ..﴾ (المائدة: ٤٩).

## ٢. دەستەڵات هی خەڵکەو بەرپرسیاریێتی سپاردەیەو پێویستە خەڵکی بە کەسانی شایستەی بسپێرن:

بەڵگە لەسەر ئەوە، کە خاوەنی ئەسڵی دەستەڵات (سلطة) لـە سیستـەمی حوکمڕانیی ئیسـلامداخەڵك‌و جـەماوەری مسـوڵمانە، ئەوەیە،کەسـەرجەم دواندنەکان (خطابات)ی قورئان، ڕوویان لە خەڵکـە بەگشـتیی‌و بەتایبـەت ڕوویان لە مسوڵمانانە، بۆ نموونە:

* ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ .. ﴾ (البقرة: ٢١).
* ﴿يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ..﴾ (الأعراف: ٣١).
* ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ .. ﴾ (النساء:٥٩).
* ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ .. ﴾ (البقرة: ١٨٣).
* ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى .. ﴾ (البقرة: ١٧٨).
* ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّـٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ ..﴾ (النساء: ١٣٥).

بەڵگەش لەسەر ئەوە، کە بەرپرسیاریێتی لە ئیسلامدا سـپاردەیەو لەسـەر خەڵکی مسـوڵمان پێویستە، کە بەوریاییەوە بە کەسانی شایستەی بسپێرن ئەوەیە،کەخوای زاناو شارەزا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ..﴾ (النسـاء: ٥٨)، واتـە: خـوا فەرمانتان پێدەکات،کە سپاردەکان بە خەڵکی خۆیان بسپێرن، توێژەرەوانی قورئانیش لێرەدا گوتوویانە: مەبەست لـە سـپاردەکان (الأمانـات) ئـەرك‌و بەرپرسیارێتییەکانن.

کەواتە:

وەك چۆن لە ئەسڵدا حوکمڕانێتیو یاسادانان (تشریع) هـی خوایـەو، هـیچ کەس بۆی نیە بەبێ مۆڵەتی ویو، لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتی ئەو دانـەبێ، یاساو دەستوور بۆ خۆی، یان خەڵك دابنێ، دەستەڵاتی سیاسـییو دانـانی مشوورخۆرو حوکمڕانانیش، مافی ڕەواو بێ گرێو گۆڵی خەڵكو جەماوەرەو پێویستە خۆیان کاربەدەستو مشوورخۆرانی خۆیان دیاری بکەن و، ئـەرکی بەرپرسیارێتی (مسـئولیة)یان پێ بسپێرنو، شەرعییەتی حوکمڕانییکردنیان پێ بدەن.

## ٣. ڕاوێژ بناغەی حوکمو سیاسەتەو هەم لەسەر کۆمەڵگا بەگشتییو هەم لەسەر کاربەدەستانیش بەتایبەت فەرزە:

وەك خوای کاربەجێ لە وەسفو پێناسـەی کۆمـەڵی بڕوادارانـدا فـەرمـوویـەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ (الشوری: ٣٨).

واتە: ئەوانەی وەڵامی پەروەردگاریانیان داوەتـەوەو نوێـژیان بـەرپاکردوەو کاروباریان بە ڕاوێژە لە نێوانیانداو لەوەی پێمانداون دەبەخشن.

کەواتە: کاروبار بەڕاوێژ بەڕێوەبردنی مسوڵمانان وەك ئیمانو نوێژو زەکات، لەسەریان پێویستە!

ئەوە بۆ کۆمەڵگا بە گشتیی، بۆ کاربەدەستانیش بەتایبەت،کە لەسـەریان فەرزە ڕاوێژ بکەنە بناغەی کاروبار راپەراندنیان، خوا ڕوو بە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿..وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ..﴾ (آل عمران: ١٥٩)، واتە: لە کاروباردا ڕاوێژیان پێ بکە!

جا بێگومان، ئەگەرلەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ پێویست بووبێ ڕاوێژ بـە هاوەڵانی بکات، دیارە بۆ خەڵکی دیکەی بەرپرس لەپێشترو پێویستترە!

بەلگەش لەسەر ئەوە زۆرن، کە ئەنجامی ڕاوێژ بۆ بابای بەرپرس‌و کاربەدەست پابەندکەر (مُلْزِم)ە، بەلاّم لێرەدا مەودای خستنەڕوویانمان نیەو، خوایاربێ لەو لێکۆڵینەوە تایبەتەدا، کە لەبارەی دەوڵەت‌و حوکمڕانییەوە دەیکەین، باسیان دەکەین.

## ٤. خەڵکی لە: بۆدابین کرانی ڕێزو ماف‌و ئازادییەکانیاندا یەکسانن:

بەلگەش لەو بارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ..﴾ (النساء: ١).

واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن، کە لەیەك نەفس هێناونیەدی‌و هەر لەویش هاوسەرەکەی هێنایەدی، لەو دوانە پیاوان‌و ئافرەتانی زۆرو زەوەندی بلاوکردەوە..

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات: ١٣).

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروستکردوەو گێڕاومانن بە چەند گەل‌و تیرەیەك، تاکو یەکدی بناسن، بێگومان کێتان پارێزکارتر بێ لەلای خوا بەڕێزترە، بەڕاستی خوا زانای شارەزایە.

* ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ..﴾ (الإسراء: ٧٠).

واتە: بەڕاستی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە..

* {يا أيها الناس! ألاَ إن ربَّكم ﷻ واحد، ألا وإنَّ اباكم واحد، ألاَ لاَفضلَ لعربي على أعجمي، ألاَ لاَفضلَ لأحمرَ على أسود إلاَّ بالتقوى، ألاَ هلْ بلَّغتُ؟ قالوا: نعم، قال: ليبلِّغ الشاهد الغائب} (رواه أحمد في المسند بسند صحيح).

شایانی باسە، ئەمە بەشێکە لە وتارە مێژوویی‌و مەزنەکەی پێغەمبەری خواﷺ، کە لە حەجی ماڵئاواییداو لەو ڕۆژە گەورەو مێژووییەدا

فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! بزانن کە پەروەردگارتان ﷻ یەکە، بزانن، کە بابتان یەکە، ئاگادار بن، کە عەرەب لە غەیرە عەرەب چاکتر نیە، بزانن، کە سپی پێست لە ڕەش پێست چاکتر نیە، مەگەر بە پارێزکاریی، ئایـ گەیاندم؟! گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: دەبا ئەوەی ئامادەیە بەوە ڕابگەیەنێ، کە لێرە نیە.

* هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {..اَللَّهُمَّ ربَّنا وربَّ کل شيءٍ أنا شهيد انَّ العباد كلَّهم إخوةٌ} (رواه أحمد وأبوداود عن زيد بن أرقم).

واتە: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شتێك! من شایەدم، کە بەندەکان هەموویان خوشكو بران. دیارە وشەی (إخوة) لە زمانی عەرەبیدا بۆ نێر ومێیان بەکاردێ، هەروەها وشەی (عباد)یش مەبەست پێی تێکڕای مرۆڤەکانە، بە نێرو مێو بڕوادارو بێ بڕواوەو، مەبەستیش لە برایەتیی و خوشکایەتیی و خوشكو برایەتی، یان پەیوەندی ڕەچەڵەك(نسب)ە.

## ٥. فەرمانبەریی لە سنووری شەرع دایە:

بەڵێ فەرمانبەریی خەڵکی و گوێڕایەڵییان بۆ حوکمڕانو کاربەدەستانی ن، تەنیا لە جوغزو بازنەی شەریعەت دایەو، هیچ حوکمڕانێك بۆی نیە ئەرکێك بخاتە سەرشانی خەڵکی، کە پێچەوانەی شەریعەت (عەقڵو نەقڵ) بێ، بەڵگەش لەو بارەوە زۆرن، کە خەڵکی نەك هەر لە سەریان پێویست نیە، بگرە بۆشیان ڕەواو دروست نیە، کە لە ناشەرعییدا بە قسەی حوکمڕانو کاربەدەستانیان بکەنو، مل بۆ شتی ناهەقو ستەمکارانە بدەن، بۆ نموونە:

* خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿..وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ..﴾ (الممتحنة:١٢)، واتە: ئافرەتانی مسوڵمان (ئەی موحەممەد!) لە شتی باشدا سەرپێچیت لێ ناکەن.

وەك دەبینین خوای کاربـەجێ، بـە قسـە کـردن‌و فەرمانبـەریی ئافرەتـانی مسوڵمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ مەرجـدارو بەنـددار (مشـروط ومقيَّـد) کردوە بە چاکە (معـروف)ەوە، تاکو بزانرێ، کە گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبـەریی مسوڵمانان بۆ کاربەدەست‌و حوکمڕانەکانیان، تەنیا لە سنووری شەرع‌و لـە جوغزی چاکەدایە، ئەگەرنا بێگومـان پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە چاکەو خێر فەرمان بە هیچی دیکە ناکات!

* {إنَّما الطاعة في المعروف} (متفق عليه عن علي رضي الله عنه).

واتە: بێگومـان فەرمانبەریی بەس لە چاکەدایە.

* {السمع والطاعة حَقٌّ على المرء المسلم فيما أحبَّ وكره، ما لم يُؤْمَرْ بمعصيةٍ، فإذا أُمِر بِمَعْصيةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ} (متفق عليه عن إبن عمر رضي الله عنهما).

واتە: بیستن‌و فەرمانبەریی کـردن هەقێکـە، لەسـەر مرۆڤـی مسـوڵمان لەوەدا، کە حەزی لێدەکات‌و حەزی لێناکات، مادام فەرمانی بە سەرپێچی لە خوا پێ نەکرا، بەڵام هەرکات فەرمانی پێکرا بە سەرپێچی خـوا، ئـەوە نەگوێڕایەڵیی دروستەو نە فەرمانبەریی.

## ٦. هەمـوو لایەك بەرپرسیارن لە بەرانبەر کۆمـەڵگاو دەوڵەت دا:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە بنەما گرنگەکان‌و هێڵە گشتییەکانی سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلامدا، لەو بارەشەوە بەڵگـەی زۆر هـەن لـە دەقـەکانی قورئان‌و سوننەتدا، هەرچەندە هەرشتێك عـەقڵی ساغ دەلالـەتی لەسـەرکردو بە پێویستی زانی لە بواری مامـەڵەکان (المعاملات)دا، پەکی لەسەر دەقـی نەقڵیی نەکەوتوە:

* ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ.. ﴾ (التوبة: ٧١). واتـە: وە پیـاوانی ئیمانـدارو ئافرەتـانی

ئیماندار، هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە چاکە دەکەنو قەدەغەی خراپە دەکەن..

* {کلکم راعٍ وکلکم مسئول عن رعیَّته..} (متفق علیه عن إبن عمر رضي الله عنهما).

واتە: هەرکامێکتان چاودێرەو، هەرکامێکیشیتان بەرانبەر بە کۆمەڵگاکەی بەرپرسیارە..

* {الدِّینُ النَّصیحةُ، قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: لِلهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسولِهِ وَ لأئمة المسلمین وعامَّتهم} (متفق علیه واللفظ لمسلم).

واتە: ئایین دڵسۆزییە، گوتمان (واتە هاوەڵانێك کە گوێبیستی ئەم فەرمایشتە بوون) بۆکێ؟! فەرمووی: بۆ خواو بۆ کتێبەکەیو بۆ پێغەمبەرەکەیو بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانو بۆ تێکڕایان بەگشتیی.

دیارە کەسێکیش دڵسۆزی کەسێك بێتو دڵسۆزی شتێك بێتو بە خەمییەوە بێ، لە هەڵەو کەمو کورییەکانییەوە ڕانامێنێو، چی بۆی باش بێت ئەنجامی دەدات.

* {إنَّ مِنْ أَعْظَمِ الجِهَادِ كَلِمَةُ عدلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائرٍ} (رواه الترمذي عن أبي سعید الخدري رضي الله عنه، وصحَّحه شعیب وعبدالقادر الأرناؤوط).

واتە: گوتنی وشەیەکی هەقو دادگەرانە لەلای حوکمڕانێکی ستەمکار لە گەورەترین جیهادە.

* {إذا رأَيتَ أُمَّتي تَهَابُ الظَّالِمَ أَنْ تَقولَ لَهُ: أَنْتَ ظالِمٌ!، فقد تُوُدِّعَ مِنْهُم} (رواه أحمد عن عبدالله بن عمر، وصحَّحه الشیخ شاکر برقم: ٦٧٧٦).

واتە: هەرکات ئۆمەتمت بینی نەیوێرا بە ستەمکار بڵێ: تۆ ستەمکاری! ئەوە کاریان تەواو بووەو حیسابیان ڕۆیشتوە.

## ٧. چەسپاندنی دادگەریی‌و دابینکردنی بەرژەوەندی خەڵك، گەورەترین ئەرك‌و بەرزترین ئامانجی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییە:

ئەم ئەسڵ‌و بنەما گەورەو گرنگەش، وێڕای عەقڵ‌و فیترەتی ساغ، چەندان دەقی قورئان‌و سوننەتیش پشتگیریی دەکەن، بۆ نموونە:

* ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ..﴾ (النحل: ٩٠)، واتە: بێگومان خـوا فـەرمان بـە دادگەریی دەکات..
* ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ..﴾ (الحديد: ٢٥)، واتە: بە تەئکیـد ئێمـە پێغەمبـەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە ڕەوانـە کـردوەو، کتێـب‌و تـەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوارێ، تاکو خەڵکی دادگەریی بچەسپێنن..

بەڵێ، دادگەریی، هەم خوا ﷻ زۆر بە جەختکردنەوە فەرمانی پێکردوەو، هەم سەرجەم پێغەمبەرانی خۆیشی - عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام- بـە کتێـب‌و تەرازووەوە بۆ چەسپاندنی ڕەوانەکردوە.

* دابینکردنــی خێــرو چــاکەو بەرژەوەنــدی خــەڵکیش، کــە بەرهــەمی دادگەرییە، ئامانجی گەورەی پێغەمبەرانی خوا بووە، وەك (شعیب) عليه السلام فەرموویەتی: ﴿..إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ..﴾ (هود: ٨٨)، واتـە: جگە لە چاکسازیی‌و هێنانەدی چاکەو خێر، هیچ مەبەسـتێکی دیکـەم نیە، ئەوەندەی بۆم بکرێ..
* ئنجا وەك چۆن دادگەریی‌و خێرو بەرژەوەندی خەڵکی، دوو شتی پێکەوە گرێدراون، بە پێچەوانەوە ستەمکاریی‌و خراپەکارییش، دوو شتی پێکەوە پەیوەست‌و تێکهەڵکێشن، وەك خوای کاربەجێ لەبارەی گـەلی (عــاد)و (ثمود) و(فرعـون)ەوە فەرموویـەتی: ﴿الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ﴾ (الفجر: ١١-١٢)، واتە: ئەوانەی، کە لە وڵاتەکاندا سەرکێشیی‌و ستەمکارییان کردو، ئاشووب‌و خراپەی زۆریان تێدا پەیداکرد..

* ﴿.. ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ (الحج: ٤١).

واتە: - خوا کەسانێك سەردەخات- کە،ئەگەردەستەڵاتمان پێدان، لە زەویدا نوێژ بەرپادەکەنو زەکاتێ دەدەنو فەرمان بە چاکە دەکەنو رێگریی لە خراپە دەکەن، سەرەنجامی کارەکان بۆ لای خوایە.

شایانی باسیشە،کەنوێژ گەورەترین دروشمی مەعنەویی تاكو کۆمەڵی مسوڵمان و، زەکاتیش پایەیەکی گرنگی لایەنی ماددییو ئابووری ژیانو گوزەرانیانەو،وشەی (المعروف) و(المنكر)یش، کە ئەلیفو لامی (تعريف)یان لەسەرە، جینسی چاکەو خراپە بە تێکڕایی دەگرنەوە، چ لە بواری عەقیدەو فیکرداو، چ لە بواری کۆمەڵایەتیی و، چ سیاسیی و، چ ئابووریی و..هتددا.

کەواتە: چەسپاندنی خێرو چاکەکانو دابین کردنی بەرژەوەندییەکان و، لابردنو ریشەکێشکردنی خراپەو شەڕو دوورخستنەوەی زیانەکان، هاوکات لەگەڵ ئەوەی،کە ئەرکی تاك تاکی مسوڵمانانو سەرجەم کۆمەڵگاشە، ئەرکی سەرشانی دەوڵەتیشە.

خوێنەری بەڕێز!

لێرەدا کۆتایی بەم باسە دێنینو، خوا یاربێ لە باسی داهاتوومانـدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر سروشتی هەرکام لە ئیسلامو سیکۆلاریزم، لە بواری دەوڵەتدارییو حوکمڕانییدا.

# سـروشـتی ئیسـلام و عەلمـانییەت
# لە بواری حوکم و سیاسەتـدا

خوێنەری بەڕێز!

لەباسی پێشوودا تیشکمان خستە سەر چەند مەسـەلەیەك، لەمـەڕ سروشـتی هەرکام لە ئیسـلامو سـیکۆلاریزم لـە بـواری حـوکمو سیاسـەتدا، ئـەم باسـەش هەرتەواوکەری باسی پێشوویەو، هەوڵ دەدەین تیشکی زیاتر بخەینە سەر سروشتی هەرکام لە ئیسلامو سیکۆلاریزم لە بواری دەوڵەتـدارییو حوکمڕانییـداو دەڵـێین: سروشـتی ئیسـلامو ژمارەیـەك لـە دەقـەکانی قورئـانو سـوننەت، مسـوڵمانان ناچاردەکەن، کەسیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لەسەر بناغەی ڕاوێـژ (شـوری) بنیات بنێن، بەڵام سیکۆلاریزم لە سۆنگەی ئەوەوە، کە سروشتێکی دیاری کراوی نیە، شوێنکەوتوانی ناچار ناکات،کە نە دیموکراسییو نەهیچ سیستەمێکی دیکەی حوکمڕانیی دیاریکراو تەبەننی بکەن.

بۆ ئیسپاتی ئەوەش، کە ئیسـلام، چ وەك سروشـتەکەیو، چ وەك دەقـەکانی، مسوڵمانان ناچار دەکات ڕاوێـژ بکەنـە بناغـەی سیسـتەمی حـوکمڕانیی، هـەر بەکورتی دەڵێین: ئاشکرایە، کە بیرو بـڕوا (عقیـدة) لـە ئیسـلامدا دەوری بناغـە دەبینێو، کاکڵو جەوهەری بیروبڕوای ئیسلامییش بریتیە لە خـوا بەیـەك گـرتن (توحید الله)، بەتایبەت خوا بەیەك گرتن لەپەرستراوێتیدا (توحیدالله في الألوهیة)، ئنجا خوا بەیەکگرتنیش، سەرجەم مرۆڤـەکان لەبەرامبـەر خـوادا ﷻ یەکسـان دەکات، چونکە تەنیا پەرستراوێتی خوا، یەکسـەر بەنـدە (عبـد)بـوونی تێکـڕای مرۆڤـەکانو پێکەوە برابوونو وەك یەکبوونیان دەخوازێ، وەك پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: {أللهم ربّنا وربّ کل شيء أنا شهیدٌ أنّ العبـاد کلّهـم إخـوة}

(رواه أحمد وأبوداود عن زيد بن أرقم)، واتە: ئەی خوایە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شتێك، من شایەدم، کە بەندەکان هەموویان خوشكو بران..

هەروەها فەرموویەتی: {..وکونوا عبادالله إخواناً} (متفق عليه)، واتە: ..بەندەی خواو پێکەوە برابن!

کەواتە: بیرو بڕوای ئیسلامییو خوا بەیەك گرتنو تەنیا خواپەرستن، مسولْمانان ناچار دەکات،کە پێکەوە براو تەبابنو، بەهیچ جۆرێك بیر لە کوێخایەتی بەسەریەکدا کردنو یەکدی چەوساندنەوە نەکەنەوەو، برایانەو تەبایانەش پێکەوە دینداریو دنیاداریی بکەن،بۆیە لەنێو کۆمەڵگایەکی مسوڵمانو هەڵگری عەقیدەی ئیسلامییدا، بەهیچ شێوەیەك جگە لە ڕاوێژو پرس و ڕا پێکەوەکردن، بیر لەهیچ میکانیزموسیستەمێکی دیکەی کاروبار هەڵسوڕاندنو حوکمڕانیی کردن ناکرێتەوە.

هەر بۆیەش خوای کاربەجی ﷻ ، هاوکات لە گەڵ ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەدا، کە هەموو پێغەمبەرانی خۆی - عَلَيْهِم الصَّلاة والسَّلام- بۆ ئەوە ناردوە، کە (تەنیا خواپەرستن) لە خەڵکی بگەیەننو پێیان بڵێن: بەس بەندەی خوابن، هاوکات لەگەڵ ئەوە، ڕاستییەکی دیکەش دەخاتە ڕوو، کە بریتییە لەوەی: خوا ﷻ بە پێغەمبەرانی خۆی ڕاگەیاندوەو فەرمانی پێکردوون، کە بە خەڵکی بڵێن: خۆتان لە طاغووت دوور بگرن! طاغووتیش بریتییە لە هەر پەرستراو (معبود)ێك، جگە لە خوا، بە تایبەت ئەو حوکمڕانە ستەمکارانەی، کە بەزەبرو زەنگ خۆ بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنن، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ .. ﴾ (النحل: ٣٦).

کەواتە: ئیمانو خوا بەیەك گرتنو تەنیا خوا پەرستیی، وەك چۆن گیانی برایەتییو یەکڕیزییو تەبایی بەبەر بڕواداراندا دەکات، واشیان لێدەکات،کە هەرچی کۆتو پێوەندی دەستو پێو گەردنیانە بیپسێننو، مل بۆ هیچ طاغووتو ستەمکارێك دانەنەوێننو ئازادی ڕاستەقینە وەدەست بێنن! پێشتریش - لە باسی

پێشوودا- ئاماژەمان بە چەند دەقێك كرد، كە ڕاوێژكردنە بناغەی كاروبار لەسەر مسوڵمانان فەرز دەكەن، چ وەك خەڵك و كۆمەڵ و، چ وەك حوكمڕان و كاربەدەستان، ئنجا سیرەو ژیانی پێغەمبەری خواش (محمد) ﷺ بە جوانترین شێوە: (ڕاوێژكردنە بناغەی كارو بار بەڕێوەبردن)ی تێدا درەوشاوەتەوە.

هەر بۆیەش (أبو هريرة) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: {مَا رَأَيتُ أحـداً أكثـر مشورةً لأصحابه من رسول الله ﷺ} (رواه الترمذي). واتە: هیچ كەسم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر ڕاوێژ بە هاوەڵانی بكات.

هۆكاری ئەوەش، كە سیكۆلاریزم، شوێنكەوتوانی ناچار ناكات، نەدیموكراسیی و نەهیچ سیستەمێكی دیكەی حوكمڕانیی تەبـەننی بكـەن، ئەوەیە،كەعەلمانییـەت خاوەنی سروشت و عەقیـدەو بەرنامەیـەكی دیـاریكراوو، بگـرە جیهانبینییـەكی دیاریكراویش نیە، وەك لە باسەكانی ڕابردوودا خستمانە ڕوو، بەڵكو سیكۆلاریزم ڕەوتێكی فیكریی و سیاسیی و كۆمەڵایەتیی بـوو، كـە لـە كاردانـەوەی كڵێسـاو نەصرانییەتدا سەری هەڵداو، كرۆكەكەشی بریتیە لە دوور خستنەوەی خواو ئایین و وەحی، لەبواری سیاسەت و حوكمڕانیی، واتـــە: ئەوەی بەلای عـەلمانییەتەوە گرنگە ئەوەیە،كە(خوا) ﷻ دەست وەرنەداتە كاروباری دەوڵەت و حـوكمڕانیی و، مرۆڤــــ بۆخۆی بەرنامـەی ژیان و گوزەران و سیستـەمی حوكمڕانیی خۆی دابنـێ، جـا ئـەو بەرنامـەیەو ئەو سیستـەمە هەرچی هەیە، باببێ، گرنگ ئەوەیە هـی خـوا نـەبێ و بەناوی ئەوەوە نەبێ! شایانی باسیشە،كەسیكۆلاریستەكان بـۆ ئـەم مەسـەلەیەی گوتمان، تەعبیری (داڕنینی پیرۆزیی لە دەستەڵات) بەكاردێنن، چونكە ئەو كاتەی كە كڵێساو چینی ئەكلیرۆس بـەناوی خـواو ئایینەكەیـەوە حوكمڕانییـان كـردوە، خۆیان و سیاسەت و حوكمڕانییەكەیشیان بە پیرۆزو پارێزراو لـە هەڵـە (معصـوم) داناوەو، سیكۆلاریزمیش لە كاردانەوەدا ئەو تەعبیرەی بەكار هێناوە. ئنجا هــەر بۆیەش هەر لە بەرەبەیانی سەر هەڵدانی سیكۆلاریزم و دووركەوتنەوە لـە كڵێسـاو ئایینەكەیەوە، هەتا ئێستا، تـەوژمی سیكولاریسـت چـەندان بەرنامـەو ڕێبـازی

تەبەنی کردوونو، پەنای بۆ چەندان میکانیزمو سیستەمی حوکمڕانیی بردوە، بێئەوەی هەست بەهیچ جۆرە سەغڵەتییەك بکات، یان هیچ کەس بتوانێ بڵێ: فلاَن ڕێبازو بەرنامەیەو فیسارە میکانیزمو شێوەی حوکمڕانییە، پێچەوانەی عەلمانییەتەو بەلادان (إنحراف) لێیدادەنرێ! بۆ نموونە: لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستی زایینییدا، هاوکات لەگەڵ ئەوەی،کە لە هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، وەك بەریتانیاو فەرەنساو ئەمریکا، ڕژێمە سیکۆلاریستەکان، دیموکراسییان وەك سیستەمی حوکمڕانیی تەبەنی کردبوو، وڵاتانێکی دیکەی وەك ئەڵمانیاو ئیتاڵیا، سیستەمی ئۆتۆکراسیی (Autocracy)و دیکتاتۆریی (Dectatorship)یان تەبەنی کردبوو، هیتلەرو موسۆلینی وەك دوو دیکتاتۆری زەبەلاح، جڵەوی کارو باری ئەو دوو وڵاتەیان بەدەستەوە گرتبوو، ئنجا لەولاشەوە هەرکام لە چینو یەکیەتی سۆڤیەت، سیستەمی (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا)یان بۆ بەڕێوەبردنی خۆیان هەڵبژاردبوو! لە حاڵێکدا، کە هەرکام لە حکومەتو ڕژێمی ئەو وڵاتانە، خۆی بە سیکۆلاریستێکی تەواو عەیار دادەناو، لەڕاستیشدا هەموویان عەلمانیی بوون، چونکە لەهیچ کامیاندا کەمو زۆر، حیساب بۆ خواو ئایینەکەی نەدەکرا!

بۆیەش ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەم بە پێویست زانی، چونکە لە ڕۆژگاری ئێستاماندا هەندێك نووسەری سیکۆلار مەشرەب -،ئەگەرنەشڵێین زۆربەیان، یان هەموویان!- پێیان وایە، یان دەیانەوێ خەڵك وابزانێ، کە تەبەنی کرانی دیموکراسیی وەك سیستەمی حوکمڕانیی، زادەو بەرهەمی سیکۆلاریزمەو دیموکراسیی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە عەلمانییەتەوە هەڵدەقوڵێ! کە وەك ڕوونمان کردەوە وانیەو، ئەوەی بۆ سیکۆلاریزم گرنگە ئەوەیە،کەلە بەرنامەی ژیانو سیستەمی حوکمڕانییدا حیساب بۆ خواو بەرنامەکەی نەکرێو، بەشەر بۆخۆیو بەبێ گەڕانەوە بۆلای خوا مشووری کاروباری خۆی بخوات، بەڵام ئەوە،کەبەرنامەکە (کاپیتالیزم)ە، یان (سۆسیالیزم)،سیستەمی حوکمڕانییەکە (ئۆتۆکراسی)یە، یان

(دیموکراسیی)، ئەوە هیچ پەیوەندی بە سروشتی عەلمانییەتەوە نیەو، بەیەکسانی تەماشایان دەکات، مەگەر دوایی میزاجو ویستی سیکۆلاریستەکان خۆیان، بەدەر لە سروشتی سیکۆلاریزم، یەکێك لە بەرنامەو ڕێبازەکان، جۆرێك لە سیستەمەکانی حوکمڕانیی هەڵبژێرێ. ئنجا لێرەدا ڕەنگە پرسیارێك لە دڵو مێشکی هەندێك کەسدا سەرەتاتکە بکاتو، بڵێ: جا خۆ وەك چۆن بەناوی سیکۆلاریزمەوە ڕژێمانێکی دیکتاتۆریی - دیکتاتۆرییەتی تاك، یان حیزب، یان چین، یان بنەماڵەو عەشیرەت- هەبوونو هەن، لە مێژووی ئیسلامو مسوڵمانانیشدا بەناوی ئیسلامەوە حوکمی میراتییو تاکڕەوییو خۆسەپێنەر (مُسْتَبِدّ)انە هەبوون! ئێمەش لەوەلاّمدا دەڵێین: بەڵێ، ئەوە ڕاستییەکەو نکوولّیی لێناکرێ، بەلاّم لەو مەسەلەیەدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئیسلامو سکۆلاریزمدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە: لە سۆنگەی ئەوەوە -وەك پێشتر گوتمان- ئیسلام بە سروشتو بەپێی چەندان دەقی ڕوونو ڕاشکاوی قورئانو سوننەتو سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺو چوار خەلیفە سەرڕاستەکانی: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی، (خوا لێیان ڕازی بێ)، لەسەر پەیڕەوانی پێویست دەکات،کە ڕاوێژ (شوری) بناغەی کاروباریان بێ، دەبینین کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بناغەی سیستەمی حوکمڕانیی لە ڕاوێژو هەڵبژاردنو بەیعەتکردنی ئازادانەوە دەگۆڕێ، بۆ سەپاندن (إستبداد)و میراتییو بەیعەتی زۆرە ملێیانە، لەگەڵ ناڕەزاییو ڕەخنەی توندی مسوڵماناندا، ڕوو بەڕوو دەبێتەوە، بۆ نموونە:

أ- کاتێك (مروان بن الحَكَم) والی موعاویە لە مەدینە، لە کۆتایی تەمەنی موعاویەدا، داوا لە خەڵکی دەکات،کە بەیعەت بە (یزید)ی کوڕی موعاویە بدەن، (عبدالرحمن بن أبي بكر الصديق) خوا لەخۆیو بابی ڕازی بێ، ڕەخنەی لێ دەگرێو دەڵێ: {يابني أُمَيّة! إنَّ هذا الأمر كان لرسول الله وقد كان في

أهله مَنْ لوجعله فيه لكان له أهلاً، فلم يفعل، فأعدتموها يابني أُمَيَّة أعجمية كلَّما هلك هرقل قام هرقل}[١].

واتە: ئەی بەنی ئومەییە! ئەم کارە -واتە حوکمڕانیی- بەدەست پێغەمبەری خواوە بوو، لەنێو خزمەکانیشیدا،ئەگەرپێی سپاردبان، کەسانی وا هەبوون، کە شایستەی بن، بەڵام شتی وای نەکرد، جا ئەی بەنی ئومەییە! ئێوە ئەم کارەتان وەك عادەتی بیانییەکان داناوەو تەماشاتان کردوە، هەرکە هیرەقلێك ڕۆیی، هیرەقلێکی دیکە شوێنی بگرێتەوە!

ب- کاتێك موعاویە داوای لە (عبدالله بن الزبير) خوالێیان ڕازی بێ، کرد، کە پەیمان بداتە یەزیدی کوڕی وەك (ولي العهد)، ڕەفزی کردو پێی گوت: (یان وەك سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەمان لەگەڵ بکە، کە خەڵکی جێهێشت بۆخۆیان، کێیان پێباش بوو دوای وی دایبنێن، یان وەك ئەبوبەکر بکە، کە پیاوێکی جێی ڕەزامەندیی ئۆممەت پێشنیار بکەی، کە خزمی خۆت نەبێ، یان وەك عومەر بکە، کە کردیە ڕاوێژ لە نێوان کەسانێکی ناسراوی جێگای ڕەزامەندیی مسوڵمانانداا، کە هیچ کامیان خزم‌و نزیکت نەبن، باتۆش‌و ئێمەش ئەوان بکەینە سەر مەشق)[٢].

ج- هەروەها هەر لەوبارەوە (عائشة)ی دایکی بڕواداران (خوا لێی ڕازی بێ) بە موعاویە دەڵێ: (إنما هو مُلْكٌ بباطلٍ تجعلونه بني أُمية فيمن تَهْوُونَه)[٣].

واتە: بێگومان ئەی بەنی ئومەییە! ئەوە حوکمڕانییەکی بەناهەقە، بەئارەزووی خۆتان بەم‌و بەوی دەسپێرن!

---

(١) بڕوانە: (تثبيت دلائل النبوَّة) القاضي عبدالجبار، ج٢،ص٥٧٥، وە (الأسلام وفلسفة الحكم) د.محمد عمارة، ص٢٨٦.

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج٢،ص٥٧٦، وە (الأسلام وفلسفة الحكم ) ص ٢٦٨.

(٣) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ‌و لاپەڕە.

ئاشکراشه،کەئەو هەڵوێستەی مسوڵمانان لەبەرامبەر موعاویەدا، هـەڵقوڵاوی سروشتی ئیسلامو دەقەکانی قورئانو سوننەتو سیرەو ژیـانی پێغەمبـەری خـوا ﷺو چـوار جێنشـینه سەرڕاسـتەکانیەتی، بـەلاّم بێگومـان عەلمانییـەت، نـه سروشتەکەی وایه سیستەمێکی حوکمڕانیی دیاریکراو بخوازێو، نـەدەق (نـص)ی وای هەن، که لەو بارەوه بەبەڵگه بهێنرێنەوەو، ئەو ڕژێمانەش، که لەسەری بنیات نراون، خاوەنی چـەندان جـۆره بەرنامـەو سیسـتەمی حـوکمڕانیی بـوونو، هـیچ کامیشیان نەیتوانیوه سیفەتی سیکۆلاریست بوون بۆخۆی قۆرخ بکـاتو لـەوانی دیکەی بسێنێتەوه، لەحاڵێکدا، که سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، تـەنیا تـا ئەو کاته به ئیسلامیی دادەنرێو لەسەر ئیسلام حیساب دەکرێ، کەلەسەر بناغەی ڕاوێژ (شـوری) بنیات دەنرێ، ئەگەرنا، کاتێـك لەسـەر ئـەو بناغـەیـه لادەبـرێو دەکرێته شتێکی میراتییو دیکتاتۆریی، ئەوه بەهیچ شێوەیەك ڕەوانیه پاڵ بدرێته لای ئیسلام، هەرچەنده ئەو کەسانەی ئەو جۆره حوکمڕانییه بەڕێوه دەبەن، خۆیان به مسوڵمان دابنێنو به مسوڵمانیش له قەڵەم بدرێن، بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییه زۆرن، بۆ نموونه:

أ- کاتێك (إبراهیم) عليه السلام لەلایەن خوای کاربەجێوه بۆ خەڵکی بەپێشەوا (إمام) دادەنرێ، داوا دەکات،که وەچەکەیشی ئەو پلەوپایەیان پێبدرێ، بەلاّم خوای زاناو شارەزا بەڕاشکاویی پێیڕادەگەیەنێ، که پەیمانی وی -به هەڵبژێرران به پێشـەوا- سـتەمکاران ناگرێتـەوه: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (البقرة:١٢٤).

جا زۆربەی زانایانی ئیسلام، ئەگـەر نـەڵێین هـەموویان، ئـەم ئایەتـەیان کردۆته بەڵگەی ئەوه، که بابای ستەمکار حوکمڕانێتییەکەی دروسـت نیـەو شـەرعییەتی نیـه، ئەگەرلـەکاتی دانرانیـدا دادگـەر بـووبێ، بـەلاّم دوایـی ستەمکاریی کردبێتـه پیشـەو ڕاوێـژکردنی پشتگوێخسـتبێ، ئـەوه دیسـان

شەرعییەت لەدەست دەدات‌و پێویستە لابدرێ(١).

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەنگاربوونەوەی حوکمڕانانی ستەمکاری لەلایەن مسوڵمانانەوە بە فەرز زانیوە، بگرە هەقبێژیی لەبەرانبەر حوکمڕانیی ستەمکاردا بەگەورەترین جیهاد داناوەو، کەسێکیش، کە لەو پێناوەدا دەکوژرێ وەك (حمزة)ی مامی - خوا لێی ڕازی بێ- بەچاکترین شەهیدی ناوزەد کردوە، وەك فەرموویەتی:

* {إن من أعظم الجهاد كلمة عدلٍ عند سلطانٍ جائر} (رواه الترمذي).
* {خير الشهداء حمزة ثم رجلٌ قام الى إمامٍ جائرٍ فأمره ونهاهُ في ذات الله تعالى فقتله على ذلك} (أخرجه الحاكم).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بەر هەڵستی نەکردنی حوکمڕانی ستەمکارو بەرەنگارنەبوونەوەی بەهۆکاری تۆڵەو سزای خوا داناوە، بۆ ئەو خەڵکەی، کە مل بۆ ستەم‌و بێدادی رادەکێشن، وەك فەرموویەتی:

* {إن الناس إذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يديه أوشك أن يُعمهَّم الله بعقابٍ منه} (رواه الترمذي عن أبي بكر الصديق رضي الله عنه).

ج- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە، کە هەتا سی (٣٠) ساڵ دوای خۆی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی لەسەر ڕێبازی وی دەڕوات، بەڵام پاش ئەوە دەبێتەوە پادشایەتی، وەك فەرموویەتی: {خلافة النبوّة بعدي ثلاثون سنة ثم يؤت الله مُلْكَهُ مَن يشاء} (رواه أحمد والترمذي والنَّسائي وأبو داود).

ئەو سی ساڵەش ماوەی حوکمڕانیی هەرچوار جێنشینە سەرڕاستەکەیەتی‌و، دوای ئەوان سیستەمێکی دیکەی حوکمڕانیی لەسەر دەستی موعاویە دەستی

---

(١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)ی (القرطبي). ج٢، ص ٢٤٩-٢٥١، وە: (مفاتيح الغيب)ی (فخرالدين الرازي) ج٣،ص١٢٠-١٢٢، کە لە بارەی حوکمڕانێکەوە کە ڕاوێژ ناکات گوتوویانە: (كان عَزْلُه واجباً بلا خلاف)، واتە: بەبێ ڕاجیایی -لەنێو زانایان دا- لادانی پێویستە.

پێکرد، کە سیستەمی حوکمڕانیی پادشایەتیی‌و میراتیــی‌و خێڵــەکیی بــوو، وەك ئەوەی،کە لەو ڕۆژگارەدا لەنێو فـارس‌و ڕۆم‌و گـەلانی دیکـەدا بـاو بــووە! ئنجـا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە، کە یەکەمین کەس، کـە ڕێبازەکـەی دەگـۆڕێ یەکێکە لە تیرەی ئومەییە (بني أُميَّة) وەك فەرموویەتی: {أوَّل مـن يُغيِّـر سنَّتي رجلٌ من بني أمية} (بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ی (الألباني) ژمارە: ١٧٤٩)، ئەلبانی (خوا لێی خۆش بێ) گوتوویەتی: ((لعلّ المراد بالحديث تغيير نظام إختيار الخليفة وجعله وراثة وهو الظاهر)) واتە: ڕەنگە مەبەست لەم فەرموودەیە گۆڕینی سیستەمی هەڵبژاردنی خەلیفەو گێڕانی بە میراتیی بێ‌و، هەر ئەوەش دەردەکەوێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ زەمی ئەو لادان‌و گۆڕینەی کردوەو ناوی لێناوە پادشایەتییەکی بە چنگ‌و ددان گیراو (مُلْكاً عاضّاً) وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (أحمد) هێناویەتی‌و (الألباني)یش بەڕاست (صحيح)یداناوە(١).

شایانی باسیشە،کەماوەی حوکمڕانیی یەکەمین خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر (خوالێی ڕازی بێ) (٢) ساڵ‌و (٣) مانگ‌و، هی عومەر (خوالێی ڕازی بێ) (١٠) ساڵ‌و (٦) مانگ‌و، هی عوسمان (خوالێی ڕازی بێ) (١٢) ساڵ‌و، هــی عەلی (خوالێی ڕازی بێ) (٤) ساڵ‌و (٩) مانگ بووە، ئنجا ،ئەگـەر(٦) مـانگی ماوەی حوکمڕانیی (حەسەنی کوڕی عەلی)یش بخەینە سەرێ، دەکاتــە ســی (٣٠) ساڵی تەواو.

دیارە، کە دەشڵێین: لەدوای حوکمڕانیی چوار جێنشینەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ سیستەمی حوکمڕانیی لەسەر سـکەی شــەرعیی‌و ئاسـایی خـۆی تـرازاوە، مەبەست ئەوە نیە، کە لەو کاتەوە دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانیی ئیسلامیی لە هەموو ڕوویێکەوە ئیسلامیی‌و شەرعیی نەماوە! بەڵکو تەنیا مەبەستمان ئەوەیە،کەلـە ڕووی چۆنیەتی‌و میکانیزمی دانانی دەستەڵاتی سیاسیی‌و کاربەدەستانی دەوڵەتی

---

(١) بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ی (الألباني) ژمارە (٥)، وەبڕوانە کتێبی: (ئیسلام‌و مسوڵمانەتی‌و کاری ئیسلامی..) لاپەڕە (٢٢٨،٢٢٧)، چاپی یەکەم/ ٢٠٠٦.

ئیسلامییەوە، لەسەر سکەی شەرع لایداوەو، حوکمڕانەکان لەسەر بناغەی ڕاوێژو بە هەڵبژاردنو پەیمان پێدانی ئازادانەی خەڵكو جەماوەرەوە نەهاتوونە سەرکار، ئەگەرنا بێگومان دەوڵەتی ئیسلامییو دامو دەزگاکانی، هەرچەندە کەمو کورپیی‌و لادانیشیان تێدابووە، بەڵام لەزۆر ڕووەوە هەر پابەند بوون بەشەریعەتەوەو، کەمو زۆر گوێڕایەڵی زانایانی ئیسلام بوونو، بەگوێرەی یاساکانی شەرع بەڕێوە چوون.

ئنجا لێرەدا پێویستە ئاماژە بە مەسەلەیەکی گرنگ بکەین، ئەویش ئەوەیە کە: لە سۆنگەی ئەوەوە، کە کۆمەڵگای ئیسلامیی لەسەرەتاوە شارەزاو بەرچاو ڕوونتر بووەو لە قورئانو سوننەتەوە نێزیکتر بووە، دەبینین، کە هەڵوێستی توندترو جیددیتری لەبەرانبەر حوکمڕانانی لادەرو خۆسەپێنی ئومەوییو عەبباسییدا نواندوە، بەبەراورد لەگەڵ چاخەکانی دواییداو، لەماوەی کورتی حوکمڕانیی ئومەوییەکاندا، چەندان ڕاپەڕینو شۆڕش ڕوویانداوەو، لەلایەن چەند کەسایەتییەکی بەرجەستەو دیاری نێو مسوڵمانانەوە ڕابەرایەتییان کراوە، بۆ نموونە:

١- (حسين بن علي بن أبي طالب) کە ساڵی (٦٠)ی کۆچی لەدژی (يزيد بن معاوية) ڕاپەڕی.

٢- (عبدالرحمن بن الأشعث) کە لەساڵی (٨٥)دا دژی (عبدالملك بن مروان)و والی یەکەی (حجاج بن يوسف الثقفي) ڕاپەڕی.

٣- (زيد بن علي بن حسين) کە ساڵی (١٢٢) لە دژی (هشام بن عبدالملك) ڕاپەڕی.

٤- (يحي بن زيد بن علي) کە ساڵی (١٢٦) دا لەدژی (هشام...) ڕاپەڕی.

٥- (عبدالله بن معاوية) کە لەساڵی (١٢٧)دا هەر لەدژی (هشام) ڕاپەڕی.

٦- (الحارث بن سُرَيج) کە لەساڵی (١٢٨)دا دیسان دژی (هشام) ڕاپەڕی.

هەروەها لەدژی حوکمی بنەماڵەی عەبباسییش، بەتایبەت لەسەرەتاوە کۆمەڵێك شۆڕشو ڕاپەڕین بەرپاکراون، کە دەرفەتی سەرژمێرو ئاماژە پێکردنی ن نیەو، تەنیا ئاماژە بە یەکێکیان دەکەین، کە گرنگترینیشیانەو بریتیە لە ڕاپەڕینی

هەردوو برا: (محمد بن عبدالله بن الحسن)، کە بە (ذو النفس الزکیة) ناسراوەو (إبراهیم بن عبدالله بن الحسن)، کە لەساڵی (١٤٥)ی کۆچی لەمەدینەو بەصرە لە دژی حوکمی (أبو جعفر المنصور) دووەمین حوکمڕانیی بنەماڵەی عەبباسی ڕاپەڕینو، (مالك بن أنس)یش، کە ئەو کاتە پێشەوای خەڵکی مەدینە بوو پشتگیریی کردنو، لەسەر ئەوە تووشی سزاو جەزرەبەش بوو[1].

بەڵێ، هەتا کۆمەڵگای ئیسلامیی لەقورئانو سوننەتدا شارەزاترو بەرچاو ڕوونتر بوو، لە بەرانبەر ئەو لادان (إنحراف)ەدا، کە لەسیستەمی حوکمڕانییدا کرا، هەستیارترو خاوەن هەڵوێستتر بووو، چەند شۆڕشو ڕاپەڕینی یەك لەدوای یەکی بەرپاکردن، بۆ هێنانەوە سەر هێڵی شەرعو ڕاستکردنەوەی باری لاری دەستەڵاتو سنووردانان بۆ ستەمکارانی خۆسەپێن، بەلام بەداخەوە دوای ئەوەی وردە وردە کۆمەڵگای ئیسلامیی بەهەموو پێکهاتەکانییەوە، لە قورئانو سوننەت دوور کەوتەوە، ئەو حاڵەتی لادانو ترازانە لەجادەی شەریعەتیان - لەڕووی سیاسییەوە- لەلا بووە شتێکی ئاساییو دەقیان پێوەگرت، هەتا سەرەنجام وای لێهات،کە،ئەگەرلەسەرەتاوە تاکە ڕێی شەرعیی چوونە سەر کورسی حوکمڕانیی، بریتی بوو لە هەڵبژێررانی بابای حوکمڕان لەلایەن خەڵکەوەو بەیعەت پێدرانی لەسەر بناغەی ڕاوێژ، لەوەودوا وێڕای ئەو تاکە ڕێبازو شێوازە شەرعییە، دوو میکانیزمو شێوازی دیکەش لەلایەن زۆرێك لەپسپۆرانیی بواری سیاسەتی شەرعییەوە، شەرعێنران! کە بریتین لە:

(ولایة العهد)و (ولایة المتغلّب)، کە مەبەست لە یەکەمیان ئەوەیە بابای حوکمڕان هەر لەحاڵەتی زیندوێتی خۆیدا وەصیەت بکاتو، کوڕێکی، یان برایەکی پاش خۆی لەجێی خۆی دابنێ! مەبەستیش لەدووەمیان ئەوەیە،کەهەرکەسێك بەزەبری هێزو دەستەڵات خۆی سەپاند، ئەوە شەرعییەت وەردەگرێو دەبێتە

---

(١) بڕوانە: (الأسلام وفلسفة الحکم) ص ٥٠٦-٥٦٦.

حوکمڕان!! هیچ گومانیشی تێدا نیە، کە هیچ کام لەو دوو شێوازو میکانیزمەی بوونە حوکمڕان، کەمو زۆر پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نیە، چونکە:

أ- ئەگەربۆ هی یەکەمیان وەصیەتکردنی (أبو بکر الصدیق) بۆ(عمر بن الخطاب) خوا لێیان ڕازی بێ، بە بەڵگە بهێنرێتەوە، ئەوە ڕاست نیە، چونکە وەصیەتەکەی ئەبوبەکر بۆ عومەر تەنیا پێشنیار (إقتراح) بووەو وەك (إبن تیمیة)و زانایانی دیکە گوتوویانە: ،ئەگەرمسوڵمانان ڕازی نەبووبانو بەیعەتیان پێ نەدابایە، تەنیا بەو وەصیەتە نەدەبوو بە حوکمڕان. (ابن تیمیة) لەو بارەوە گوتوویەتی: (وکذلك عمر لما عهد الیه أبوبکر إنَّما صار إماماً لما بایعوه وأطاعوه، ولو قدِّر أنهم لم ینفِّذوا عهد أبي بکرٍ ولم یباعوهُ ولَمْ یَصِرْ إماماً)[1]، واتە: (هەروەها عومەر کاتێك ئەبوبەکر وەصیەتی بۆ کرد، تەنیا کاتێك بوو بەپێشەوا، کە بەیعەتیان پێداو فەرمانبەرییان بۆکرد، ئەگەرنا ،ئەگەر گریمان وەصیەتەکەی ئەبوبەکریان جێ بەجێ نەکردبایەو بەیعەتیان پێ نەکردبایە، نەدەبوو بەپێشەوا). ئنجا وێڕای ئەوەش وەصیەتەکە پاش پرسو ڕاوێژکردن بە مسوڵمانان بووەو، عومەریش هیچ خزمایەتییەکی لەگەڵ ئەبو بەکردا نەبووە، خوا لێیان ڕازی بێ.

ب- بەڵام هی دووەمیان ئەوە هەر زۆر ڕوونو ئاشکرایە، کە فەتواو بڕیارێکی بەزیوانەی هەڵقولاوی واقیعو هەلو مەرجی پڕ ستەمو زۆری ئەوسایەو، پێچەوانەو دژی دەیان ئایەتو فەرموودەشە،کە پێشتر - ئاماژەمان بە هەندێکیان کردوە، بەتایبەت ڕستەی: ﴿...لَایَنَالُ عَهۡدِی ٱلظَّٰلِمِینَ﴾ (البقرة: ١٢٤)-، ئنجا بەڕاستی سەیرە کەسانێك، کە خوا لەعنەتی لێیان کردوە هەر لەبەر ئەوەی زەبرو زەنگو دەستەڵاتیان هەیە، بە گەورەو حوکمڕان دابنرێن! ئاخر خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿...أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِینَ﴾ (هود: ١٨)!!

---

(١) بڕوانە: (منهاج السنَّة) ج١ ص١٤١-١٤٢.

جا ئایا بە چ عـەقڵ‌و نـەقڵێك ڕەوایـە، کەسـانێکی سـتەمکاری نـەفرین لێکراو(ملعون)بە پێشەواو گەورەو مشوور خۆری ئوممەتێك دابنرێن، کە نازناوو پێناسەی پێغەمبەرەکەی ﴿رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ەو، گەورەترین ئامانجی بەرنامەکەی چەسپاندنی دادگەرییە لەهەموو سـەر زەمینـدا: ﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ...﴾ (الشورى: ١٥)؟!

لە کۆتایی ئەم باسەشدا دەڵێین:

بێگومـان ئەوەی،کە بەئایین (دین)ی خوای دادەنـرێ‌و، بـۆ ئێمـە پابەنـد کـەر (مُلْزِم)ە، تەنیاو تەنیا کتێبی بێ خەوشی خواو سوننەتی ساغ‌و ڕاستی پێغەمبەری خوایەو، غەیری ئەو دوو سەرچاوە ڕوون‌و بێ چەندو چوونە، ئەوەی دیکـە قسـەو فەتواو بڕیارو ئیجتیهادی هەرکەسێك بێ، هەر بە بەرهەم‌و کەلەپووری زانایـان‌و، جۆری تێگەیشتنی ئەوان لەبارەی قورئان‌و سوننەتەوە دادەنرێ‌و، بۆ ئێمە پابەندکەر (مُلْزِم) نیەو، ئێمە لە بەرانبەریدا ئازادو سەرپشك (حُرٌّ ومختار)ین‌و، عەقڵمان بڕی وەریدەگرین‌و، عەقڵمان نەیبڕی هیچ.

جا ئەو بەرهەم‌و کەلەپوورەی زاناو پێشەوایانمان (خوا لێیان خۆشـبێ) لەهـەر بارێکەوە بێ‌و لەهەر بوارێکدابێ، هەر ئەوە حوکمەکەیەتی کە گوتمان.

ئەم مەسـەلەیەشم بۆیە خستەڕوو، چونکە هەندێك لە مسوڵمانان، هەتا ئێستا وەك پێویست سنووری نێوان خودی (ئایین)و (تێگەیشتن دەربارەی ئایین) لەیەك جیا ناکەنەوەو سەرەنجام خۆیـان گـیرۆدەی زۆر کێشـەو گرفـت‌و پرسـیاری بـێ وەڵام‌و ئیشکالی بێ چارەسەر دەکەن، بۆ نموونە:

کاتێك لە بەرانبەر کتێبێکی وەك (الأحكام السلطانية)ی (الماوردي)دا خۆیـان دەبیننەوەو، دەبینن زۆر شتی لەبارەی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسـلامیی یـەوە تێدایە، کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ عەقڵ‌و مـەنتیق‌و، پێشـتریش لەگـەڵ شـەرعدا ناگونجێ، تووشی سەراسیمەیی دەبن! بەڵام بێگومان هیچ حەپەسان‌و سەراسیمەیی ناوێ‌و، ئەوەی بۆ ئێمە ئایینەو پابەندکەرە، بەس قورئان‌و سوننەتەو، دیارە هـەر

شتێكیش لە زانیاریی‌و حیكمەتی بێ سنووری خواوە هەڵبقوڵێ، مسۆگەر لەگەڵ هەموو چاخ‌و ڕۆژگارێكدا دەگونجێ‌و هەر تازەیە، بەڵام بەرهەمی بەشەر وەك خۆیەتی‌و گۆڕانی كات‌و شوێن (زَمَان وَمَكَان) كاری تێدەكات‌و، مەرج نیە،ئەگەركاتی خۆی ڕاست‌و گونجاویش بووبێ، ئێستا وابێ، چ جای، كە زۆر جاریش شت بەناوی ئیسلامەوە كراوەو گوتراوە، كە دژو پێچەوانەی ئیسلام بووە، بۆ نموونە: حوكمی میراتیی‌و حوكمی زۆرە ملیی، كە بەداخەوە زۆر لە كتێبەكانی سیاسەتی شەرعیی ،تەنانەت هاوچەرخیش نەك هەركۆن -وەك پێشتر گوتمان- وێڕای حوكمی ڕاوێژیی (الحُكْمُ الشوريّ) كە تاكە ڕێبازو شێوازی سیستەمی حوكمڕانییە لەئیسلام دا، باسی ئەو دوو شێوازو ڕێبازەشیان كردوە لەژێر ناونیشانی: (ولاية العهد)و (ولاية المتغلّب)دا، بە شێوەیەك كە بابای نەشارەزا واهەست دەكات ئەو دوو شێوازو میكانیزمە نەفامییەش ڕاست‌و دروستن‌و لەسەدا سەد شەرعیین‌و هیچ خەوشیان تێدا نیە!! لێرەشدا كۆتایی بەم باسە دێنین‌و خوا یاربێ لەباسیداهاتووماندا بەراوردێكی خێرێی نێوان ئیسلام‌و سیكۆلاریزم دەكەین ئەو خاڵانەی كە تێیاندا پێك دەگەنەوە پەنجەیان دەخەینە سەر.

# بەراوردی نێوان گرنگترین پێکهاتەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام و عەلمانییەت

لەم باسەمانداو لەباسیداهاتووشماندا بەراوردێك لەنێوان گرنگترین پێکهاتەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام‌و سیکۆلاریزم دا دەکەین‌و پەنجە دەخەینە سەر خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیـ ن.

بەڵام لێرەدا یەکێك بۆی هەیە لێمان بپرسێ‌و بڵێ: باشـە ئـەوە زانیمـان، کـە (ڕاوێژ) بناغـەی سیسـتەمی حوکمڕانییــە لەئیســلامدا، بـەڵام ئایـا سـیکۆلاریزم لەحاڵێکدا، کە سروشتەکەی داخوازی هیچ سیستەمێکی دیاریکراو ناکات‌و، تەنیا مەرجی ئەوەیە پیرۆزیی (قدسـية) لەدەسـتەڵاتی سیاسـی دابڕنـرێ‌و، خـوا ﷻ و ئایینەکەی دوور بخرێنەوەو، مرۆڤــ خۆی بڕیار بەدەست‌و هەمە کارەی خۆی بـێ، ئایا لەسەر چ بناغەیەك‌و بەگوێرەی کام سیستەمی حـوکمڕانیی، بـەراوردی پـێ دەکرێ لەگەڵ ئیسلام‌و سیستەمە حوکمڕانییەکەیدا؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: لەسۆنگەی ئەوەوە، کە لــەم ڕۆژگارەمانـدا، زۆربـەی هــەرە زۆری- ئەگەرنەڵێین هەموو- ڕژێمــە سیکۆلاریستـەکان بەڕاسـت، یـان بـەدرۆ، ڕایانگەیاندوە، کە دیموکراسییان بۆ شێوازی حوکمڕانیی هەڵبژاردوە، ئێمە لەسـەر ئەو بناغەیە ئەو بەراوردە دەکەین، واتە: ئێمە بەراورد لەنێوان ئیسلام‌و سیستەمە ڕاوێژیی (النظام الشـوري)یەکـەی و، عـەلمانییــەتی دیموکراسـیی تەبـەننی کـەردا دەکەین.

سەرەتا با سەرنجی خاڵە هاوبەش، یان ڕاستتر بڵێین: لەیەکچووەکانی ئیسـلام‌و عەلمانییەت لەبواری سیستەمی حوکمڕانییدا بدەین:

# خاڵە هاوبەش و لەیەکچووەکانی
# سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام و سیکۆلاریزم

## یەکەم: خەڵك و جەماوەر سەرچاوەی دەسەڵاتە:

ئەم ئەسڵ‌و بنەمایە، وەك چۆن یەکێکە لەچوار بنەماو پایە گرنگەکانی دیموکراسیی، کە بریتین لە:

١- باڵادەستیی گەل.

٢- سەروەریی یاسا.

٣- دابین کردنی ماف‌و ئازادییەکان.

٤- لەیەك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان.

بەهەمان شێوەو بەر لەسەر هەڵدانی دیموکراسییش، یەکێك بووە لەپایەو بنەما گرنگەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام (نظام الحكم الإسلامي)، بگرە بەدرێژایی مێژووی پێغەمبەران - عَلَيْهم الصَّلاة والسَّلام- هیچ کاتێك یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا نەیتوانیوە قەوارەو دەسەڵاتێکی سیاسی دابمەزرێنێ، مەگەر پاش هۆشیارکردنەوەی خەڵك‌و بەرچاو ڕوونکردنەوەو تێگەیاندن‌و پێگەیاندن‌و بنیاتنانی بنکەیەکی جەماوەریی، واتە: تەنانەت پێغەمبەرانی هەڵبژاردەو پایە بەرزی خواش - عَلَيْهم الصَّلاة والسَّلام- بەتەنیا شەرعییەت پێدرانیان لەلایەن خوای بەرزو مەزنەوەیان نەکردۆتە بەڵگەو بناغەو پاساوی بنیاتنان‌و جاڕدانی دەسەڵات‌و قەوارەی سیاسیی، بەڵکو پاش وەرگرتنی شەرعییەتی خەڵك‌و جەماوەر، ئەوجار ئەو هەنگاوەیان ناوە، وێڕای شەرعییەتی ئاسمان، شەرعییەتی سەر زەوییشیان مسۆگەرکردوە، ئەوجار ئیعلانی قەوارەو دەوڵەتیان کردوە، بۆ نموونە:

(مووسا) عليه السلام هەتا گەلی (بني إسـرائيل)ی لەژێر نیری ستەمو زۆری فیرعەون دەرنەهێناو نەیبردنە سەر زەمینێکی ئازادو، نەبوونە خاوەنی ئـیرادەی ئازادانـەی خۆیان، خوای کاربەجێ بەرنامەو پەیڕەوێك، کە بـەبێ ئـیرادەو ئیـدارەی ئـازادو سەربەخۆ بەڕێوە ناچێو جێ بەجێ ناکرێ، بۆی نەنارد، کەمەبەسـتمان (تـوراة)ە، وەك خـوا فەرمووویـەتی: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ... ﴾ (المائـــدة: ٤٤). بەڵگـــەش لەســـەر ئەوە،کـــە لەئیسلامداخەڵكو جەماوەر سەرچاوەی دەستەلاَتە، زۆرن، بۆنموونە:

١- دواندنەکان (خطـاب)ی قورئان هـەموویان ڕاسـتەوخۆ ئاڕاسـتەی خـەڵك (النـاس)و ئاڕاسـتەی بـڕواداران ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ کـراون: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾.

٢- خوای کاربەجێ ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ کۆمەڵگای مسوڵمانانندا کردوەو فەرمانی پێکردوون، کە سپاردەکان (أمانـات) بەکەسانی شایستەی خۆیـان بسپێرن: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ... ﴾ (النساء: ٥٨)، دیارە بەرپرسیارێتی (مسؤلية)و کاربەدەستێتی (ولاية)یش گەورەترین سپاردەیەو، (إبن تيمية)ش لەکتێبی (السياسة الشرعية في إصـلاح الراعـي والرعيـة)دا وشەی(أمانة)ی بەبەرپرسـیارێتی تەفسـیرکردوە، هـەروەها زۆر لـەزانایانی دیکەش.

٣- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەرچەندە بێگومـان لەیەکـەمین ڕۆژی وەحـی بـۆ نێررانییەوە پێغەمبەری خوا بووەو شەرعییەتی خوایی‌و ئاسمانیی هـەبووە، بەلاَم هەتا نوێنەرانی شاری (يثـرب)ی بەرجەستە لەهەردوو تـیرەی (أوْس)و (خَـزْرَج)دا هەردوو پەیمانی یەکـەمو دووەمـی (عقبـة)ی لەگـەڵ نابەسـتنو، شەرعییەتی خەڵكو سەرزەمینیش پەیدا ناکات، هیچ هـەنگاوێك لـەبواری پێکهێنـانی دەوڵەتو قەوارەی سیاسیدا نانێ، بۆ بەرچاو ڕوونیـی زیـاتریش

لەو بارەوە، دەتوانی سەرنجی کتێبی: (ئیسلام‌و مسوڵمانەتیی‌و کاری ئیسلامیی...) بدەی، وانەی حەوتەم: (چۆنیەتی سەرهەڵدان‌و بنیاتنانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی) لاپەڕە (٢٣٠) تاکو (٢٧٣).(١)

دووەم: کارو چالاکی سیاسی، مافی سەرجەم هاووڵاتیانە بەبێ هەڵاواردن؛

ئەمیش خاڵێکی دیکەی هاوبەش‌و لەیەکچووی نێوان ئیسلام‌و عەلمانییەتەو، هەردووکیان لەسەر ئەوە کۆك‌و تەبان کە کارو چالاکی سیاسی مافێکی گشتیی خەڵکەو لەسەر هیچ کەس تاپۆو بۆ هیچ کەس قۆرخ‌و پاوان نەکراوە.

بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ئەم بنەمایەی سیستەمی سیاسی ئیسلامیی، دەڵێین: ئاشکرایە، کە لەئیسلامدامسوڵمانان هەموویان وەك یەکن‌و لەما و ئازادییەکاندا یەکسانن - وەك پێشتر باسمان کرد- و بەبێ ئەوەش فەرمایشتی خوا ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ﴾ (الحجرات: ١٠)، نێوەرۆکی خۆی - لەژیانی مسوڵماناندا- لەدەست دەدات، ئەوە بەنسبەت بڕوادارانەوە، بۆنامسوڵمانانێکیش، کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین‌و هاووڵاتین‌و خاوەن پەیمان (أهل الذمّة)یان پێ دەگوترێ، ئەوە ئەوانیش وەك مسوڵمانان خاوەن مافن بەبێ جیاوازی، مەگەر شتێك بەدەقێکی شەرعیی ڕوون‌و بێ چەندو چوون هەڵاوێررابێ، وەك لەبەندی (٢٥)ی دەستووری مەدینەدا هاتوە - کە بە (الصحيفة)و (الوثيقة) ناسراوە-، کە دەڵێ: (وانَّ يهود بني عوف أُمَّةٌ مع المؤمنين.. لليهود دينهم وللمسلمين دينهم مواليهم وأنفسهم..) واتە: جوولەکەکانی بەنی عەوف کۆمەڵێکن

---

(١) هەروەها ئاڵقەکانی سەرەتای : (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی) لە بەرنامەی (سەرنج)ی کەناڵی ئاسمانیی پەیام دا.

لەگەڵ بڕواداران.. جوولەکە ئایینی خۆیانیان هەیەو مسوڵمانانیش ئایینی خۆیان، هەم خۆیانو هەم هاوپەیمانەکانیان[١]..

هەروەها زانایانی ئیسلام لەبارەی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ نامسوڵمانانی هاوولاتی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەم قسەیەی (علي بن أبي طالب)یان -خوا لێی ڕازی بێ- وەك بنچینەیەکی شەرعی داناوە، کە دەڵێ: (إنّما قَبِلوا عَقدَ الذِّمَّةِ لتكون أموالهم كأموالنا ودماؤهم كدمائِنا)[٢]، واتە: بۆیە گرێبەندیی پەیمانداریێتیی هاوولاتێتییان قبووڵ کردوە، تاکو سامانیان وەك سامانمانو خوێنیان وەك خوێنمان بێ، کە دیارە لێرەدا مەبەست یەکسانبوونیانە لەگەڵ مسوڵماناندا لەبواری مافو ئازادییەکاندا. نموونەیەکیش لەوشتانەی، کە بەدەقێکی شەرعی ڕوون لەو یاسا گشتییە هەڵاوێرابێو تایبەت کرابێ بە مسوڵمانانەوە، سەرۆکایەتیکردنی قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامییە، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ... ﴾ (النساء: ٥٩)، واتە: ئەی بڕوادارینە! فەرمانبەریی خوا بکەنو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەنو، هی کار بەدەستانێك کە لەخۆتانن..

بەڵام غەیری سەرۆکایەتیو پێشەوایەتی باڵای مسوڵمانانو قەوارەکەیان، زۆربەی زانایانی ئیسلام بەشەرعییو ڕەوایان زانیوە، کە غەیری مسوڵمانان لەدامو دەزگاکانی دەوڵەتدا کارو بەرپرسێتییان پێ بسپێررێ، مەگەر شتێك، کە تایبەتمەندیی ئیسلامو مسوڵمانان بێ، وەك بەرپاکردنی دروشمەکان (إقامة الشعائر)، کە دیارە لەمەدا مسوڵمانانو نامسوڵمانان یەکسانن، نابێ هیچ کەس دەست وەربداتە کاروباری ئایینییو تایبەتی ئەوی دیکەوە[٣].

---

(١) بڕوانە: (مجموعة الوثائق السياسية في العهد النبوي)ی (محمد حميدالله).

(١) بڕوانە: (القانون والعلاقات الدولية في الأسلام) صبحي المحمصاني ص١١٤.

(٢) بڕوانە: (النظام السياسي الأسلامي مقارناً بالدولة القانونية) د. منير حميد البياتي، (المساواة أمام وظائف الدولة)ص ١٥٣-١٥٥.

لەمەوە، کە ڕابرد دەردەکەوێ، کە ئیسلام بەهیچ ڕەنگێک ڕێ بەهیچ چین‌و توێژو کۆمەڵ‌و دەستەیەك نادات، کە کارو چالاکی سیاسیی، یان ئەرك‌و بەرپرسێتی بۆخۆی قۆرخ بکات و، خەڵك‌و جەماوەری لێ بێبەش بکات، جا چ بەناوی ئایینەوە بێ - بەچەمك‌و واتا باوەکەی، کە بەرنامە ئاسمانییەکان دەگرێتەوە- وەك کاتی خۆی کڵێسا چینی ئەکلیرۆس (طبقة رجال الدین)ی کردبوو بە هەمەکارەی خەڵك‌و ولات، چ بەناوی حیزبەوە بێ، وەك (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا)ی یەکیەتی سۆڤیێتی پێشوو، چ بەناوی توێژێکی کۆمەڵایەتیی‌و ئابوورییەوە بێ، وەك چینی ئەریستۆکراسی (الطبقة الأستقراطیة) ولاتانی ڕۆژئاوای کاتی خۆی.

**سێ یەم: حکومەت مەدەنییە، نەك ئایینی و، حوکمڕانیش وەکیلی خەڵکە نەك هی خوا:**

خوێنەری بەڕێز!

بۆ ئەوەی چەمك‌و نێوەرۆکی (حکوومەتی مەدەنیی)و (حکوومەتی ئایینی‌و تیۆکراسی)و (وەکیلی خوا بوون)و (وەکیلی خەڵك بوون) چاکتر ڕوون بێتەوە، پێویستە بەکورتی ئاماژەیەك بەمێژووی دیاردەی دەوڵەت (ظاهرة الدولة)و ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەریدا هاتوون بکەین:

هەر لەڕۆژگاری زووەوە لەنێو سەرجەم گەلانی دنیادا حاڵەتی: ئاوێتە بوونی دەوڵەت لەگەڵ خودی حوکمڕاندا (إمتزاج الدولة بشخص الحاكم) باو بووە، لە ئەورووپاو ڕۆژئاواشدا ئەو حاڵەتە درێژەی کێشاوە، هەتا بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسا لەساڵی (١٧٨٩)دا، کە لەوساوە ئەو حاڵەتە ورده ورده گۆڕا، هەتا دەوڵەت بەم شێوەیەی ئێستای لێهات. بەڵام پێویستە لێرەدا ئاماژە بە دوو حاڵەتی تایبەتی‌و هەڵاوێرراو بکەین لەمێژووی دەوڵەتی ئاوێتە بوو بەکەسی حوکمڕان، کەیەکەمیان: ئەزموونی حوکمی دیموکراسیی ڕاستەوخۆی شارەکانی یۆنانە، لەچاخی ئیغریقییەکاندا، بۆ نموونە: هەردوو شاری: (ئەثینا)و

(ئەسپارطە)،دووەمیان: دەوڵەتی ئیسلامییە بەتایبەت لەسەرەتای دروستبوونیەوەو بەگشتیی، هەتا کۆتایی تەمەنی، چونکە ،تەنانەت لەوکاتەشەوە، کە لادان لەچۆنیەتی دانانی حوکمڕانەوە دروست بوو، کە لەڕۆژگاری ئومەوییەکانەوە دەستی پێکرد، بەڵێ، لەوکاتەشەوە حاڵەتی ئاوێتە نەبوونی شەخسی حوکمڕان لەگەڵ دەوڵەتدا هەر بەردەوام بووە و، بابای حوکمڕان هەر خۆی بەنوێنەری خەڵك‌و جێبەجێکەری شەریعەت زانیوەو نەیتوانیوە بڵێ: بۆخۆم دەوڵەت‌و بەرنامەو یاسام!

شایانی باسیشە،کەبیرۆکەی ئاوێتە بوونی دەوڵەت‌و حوکمڕان، بناغەی بنیات نرانی تیۆکراسییە بەهەرسێك جۆرەکانییەوە، چونکە حکومەتی ئایینی (Theocracy) بەگشتیی سێ جۆرە:

١- بیردۆزەی: بەخوا زانینی حوکمڕانەکان (نظرية الطبيعة الإلهية للحكّام).

٢- بیردۆزەی: نوێنەری ڕاستەو خۆی خوابوون (نظرية التمثيل المباشر لله).

٣- بیردۆزەی: نوێنەری ناڕاستەو خۆی خوابوون (نظرية التمثيل غير المباشر لله).

دیارە ئامانج‌و مەبەستی هەرسێك بیردۆزەکەش ئەوە بوو، کە خەڵك‌و جەماوەر بەهەموو شێوەیەك گەردنکەچی حوکمڕانەکان بن‌و، بەهیچ شێوەیەك زات نەکەن نەڕەخنە بگرن، نەلاملیی بکەن، چونکە لەحاڵێکدا حوکمڕان (خوا)بێت - پاکیی‌و بەرزیی بۆخوا- یان نوێنەری ڕاستەو خۆ، یان ناڕاستەو خۆی خوابێت، دیارە ناگونجێ هەڵە بکات‌و هەمیشە لەسەر هەق دەبێ، کەواتە: چۆن دەبێ ڕەخنەی لێ بگیرێ، یان سەرپێچی لێ بکرێ؟! ئنجا پێویستە بشگوترێ، کە هەرکام لە (نەمروود)ی سەردەمی (إبراهیم) عليه السلام و (فیرعەون)ی ڕۆژگاری (مووسا) عليه السلام، لەوپادشاو حوکمڕانە دیکتاتۆرانە بوون، کەخۆیان بە (خوا)، یان لانیکەم نوێنەری خوا زانیوە، چونکە: هەرچی نەمروودە، پاش ئەوەی ئیبراهیم پێی دەڵێ: خوای من دەژیەنێ‌و دەمرێنێ، ئەویش دەڵێ: منیش دەژیەنم‌و دەمرێنم! ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ

﴿ قَالَ أَنَا أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ .. ﴾ (البقرة: ٢٥٨)،فیرعەونیش لەكاتی وتووێژ لەگەڵ مووسادا دەڵێ: هیچ ڕایەكتان بۆ دانانێم، جگە لەوەی خۆم هەڵی دەبژێرم،ئەوەی منیش دەیڵێم تەنیا ڕای ڕاست پیشاندانە!: ﴿ ..قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾ (غافر: ٢٩).

لەمەشەوە بۆمان دەردەكەوێ، كە پێغەمبەرانی خوا - علیهم الصلاة والسلام- هەر لەئادەمەوە هەتا خاتەم، هەمیشە دوژمنی سەرسەختی نەمروودو فیرعەونەكانو حوكمڕانە خۆبەخواو پەروەردگارو پەرستراو زانەكان بوون و، بانگەوازە خوا بەیەككگرتنەكەشیان، هەڵتەكێنەری بناغەی هەرسێك جۆرو بیردۆزەكانی (ثیوكراسی)بووە، چونكە ئەوان هاتوون، هەم بە حوكمڕانەكانو هەم بەخەڵكو جەماوەرەكانیش بڵێن: كە ئێوە هەمووتان وەك یەك بەندەی خوانو بەس خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوو حوكمڕانی بالاو ڕەهاتانە، وەك خوا ﷻ لەبارەی حیكمەتو ئامانجی ڕەوانەكردنی سەرجەم پێغەمبەرانییەوە یەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ... ﴾ (النحل: ٣٦).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ (الأنبیاء: ٢٥)، بەڵێ، سەرجەم پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا عَلَيْهِم الصَّلاة والسَّلام- بۆ ئەوە ڕەوانەكراون، كەخەڵكی لەكۆیلایەتی بۆ طاغووتەكان قوتار بكەنو تێیان بگەیەنن كە جگە لەخوا هیچ كەس شایستەی پەرسترانو بەندایەتی بۆكران نیە.

هەر لێرەشەوە ئەو ڕاستییەشمان بۆ دەردەكەوێ كە هەموو ئەوانەی سیستەمی سیاسی ئیسلام بە (ثیوكراسی)و حكومەتی ئایینی دەزانن، زۆر خراپ بەهەڵەداچوونە، جامن پێم وایە یەكێك لەهۆكارە گرنگەكانی ئەو بەهەڵە داچوونەیان ئەوەیە،كەلەسۆنگەی نەشارەزایی یان بەئیسلام، وا دەزانن كە وشەی ئایین (دین)و وشەی (إسلام) هاو واتا (مترادف)ن و، كە زانیویشیانە (ثیوكراسی

(Theocracy) بەمانای حکوومەتی ئایینی یە، یەکسەر ئەوەیان هەڵێنجاوە کـە دەوڵەتو حکوومەتی ئیسلامیش کتو مت وەك (ثیوکراسی) وایەو هیچ ڕوویـان لەیەکدی وەرنەگێراون! بەلاّم پێشتر لەباسێکی سەربەخۆدا ڕوونمان کردەوە کە وشەی (دین) لەزمانی عەرەبیو لەقورئانیشدا بەچوار واتا بەکار هاتوە، کـە یـەکێکیـ ن بەرنامەی ژیان (منهج حیاة)ە بەگشـتیی، چ لـەخواوە هـاتبێو چ لەمرۆڤـــەوە سەری هەڵدابێ، کە بەم واتایەیان هـەم سـیکۆلاریزمو هـەم سـەرجەم سیسـتەمە مرۆڤـــکردەکانی دیکەش جۆرە ئایین (دین)ێکن! ئنجا ئاشکرایە کە وشەی ئـایین (دیــن) ،ئەگەرهــەر بەچـەمكو واتـا باوەکەشـی بـەکاربێ کـە مەبەسـت پێـی بەرنامەکانی خوا (شرائع الله)یە، ئەوە هەر ناگونجێو پێچەوانەی عەقڵو زانستە، کە بەوشـەی ئـایین لەیـەك کـات دا ئیسـلامو جوایـەتی (یهودیـة)و گاورایـەتی (نصـرانیة)و یەزیدییایەتیو مەجووسیەتت مەبەست بێ، چونکە هـەرکام لەمانـە لەگەڵ یەکدیدا زۆر جیاوازییان هەیەو هەر خوایان یەکە!

پاشان دەڵێن: چۆن دەگونجێ دەوڵەتو حکوومەتی ئیسلامیی بە حکوومـەتی ئایینی (ثیوکراسی) دابنرێ، لەحالێکدا کە لەحکوومـەتی ئایینیدا -وەك لەولاّتانی ڕۆژئـاواداو لـەژێر سـایەی کلێسـاو چـینی ئـەکلیرۆسو کەهـەنووت (Clrgy)دا لەحکوومەتی قەیسەرو پادشایەکاندا بەرجەستە بوو بوو- حاڵ بەم شێوەیە بوو:

١- حوکمڕان خۆی بە سێبەری خواو وەکیلی خوا دەزانی و پێی وابـوو لـەخواو ئاسمانەوە شـەرعییەتی پێدراوەو پێویستی بە شـەرعییەت وەرگـرتن لەخـەڵكو جەماوەر نیە[١]!

٢- حوکمڕان قسەو بڕیارەکانی خۆی بەبێ هەڵە (معصوم) دەزانیو بە شێوەیەکی ڕەها (مطلق) حوکمڕانیی دەکردو، پێی وابوو هیچ کەس مافی ڕەخنە گـرتنو تێبینییو سەرنجی نیە[٢].

---

(١) بڕوانە: (الأنظمة السياسية) د. محمد رفعت عبدالوهاب، ص٢١،٢٠.

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٢١.

٣- حوکمڕانان چینێکی دیاریکراوو تایبەت بوون، کە بە چینی ئەکلیرۆس ناسراوەو لە: (پاپا)و (ئەسقەف)و (کاردنیال)ەکان پێکهاتبوو، پێیان وابوو ئیرادەی خوا لەسەر زەوی لەواندا بەرجەستە بووەو، هەرچی ئەوان لەسەر زەوی گرێی بدەن یان بیکەنەوە، لەلێی خواش گرێ دەدرێ‌و دەکرێتەوە.

٤- ئەو دەوڵەت‌و حکوومەتە حاڵەتێکی دۆگماو وەستاوی هەبوو و، هیچ جۆرە گۆڕانکاریی‌و گەشەکردنێکی (تغیّر وتطور)ێکی قبووڵ نەدەکرد.

٥- حوکمڕان‌و دارو دەستەکەی بۆ سەپاندنی دەستەڵاتی خۆیان پەنایان دەبردە بەر ترساندن‌و تۆقاندن لەهەرسێك بواری فیکریی‌و ڕووحیی‌و جەستەییدا: فیکریی بە قەدەغەکردنی ڕەخنەو، وە ڕووحیی بە هەڕەشە کردنی بێبەش بوون (حرمان) لەبەزەیی خواو بەهەشت، وەجەستەیی بەئازاردان‌و ئەشکەنجەیەك کە دادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش) ناو بانگیان پێیەوە دەرکردبوو!

بەڵام لەئیسلام‌و سیستەمە سیاسییەکەیدا ڕاست بەبەراوەژووەوەیە:

١- جاری حوکمڕان لەدەوڵەتی ئیسلامییدا نەخۆی بەسێبەرو وەکیلی خوا ﷻ دەزانێ‌و، نەلافی ئەوەش لێدەدات،کە لەئاسمانەوە شەرعییەتی حوکمڕانیی کردنی پێدراوە، بەڵکو وەك هەموو خەڵکی دیکە خۆی بەبەندەی خوا دەزانێ، وەك خوا دەفەرموویەتی: ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴾ (مريم : ٩٣)، واتە: هیچ کەس لەئاسمانەکان‌و زەویدا نیە کە بە بەندایەتی نەیەتە لێی خوای بە بەزەیی، وە حوکمڕان لەئیسلامداخۆی بە نوێنەری مسوڵمانانێك دەزانێ کە لەسەر بناغەی ڕاوێژ هەڵیان بژاردوەو، بەشێوەیەکی ئازادانە پەیمانیان پێداوە، تاکو شەریعەتی خوایان بە سەردا جێ بەجێ بکات، بۆیەش خوای کاربەجێ لەو ئایەتەدا کە فەرمان بە مسوڵمانان دەکات فەرمانبەریی کاربەدەستەکانیان بکەن، پێش ئەوە فەرمانیان پێ دەکات،کە ملکەچی خواو پێغەمبەر ﷺ بن، وە پاشان فەرمان بە حوکمڕان‌و خەڵکیش دەکات،کە هەرکات،کەوتنە کێشەو مشت‌و مڕێکەوە -

واتە خەڵك و حوكمڕان- بیگێڕنەوە بۆلێی كتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەر:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ...﴾ (النساء: ٥٩).

ئەوە،كەدەبێ حوكمڕان لەسەر بناغەی ڕاوێژو بە پەیمان پێدانی ئازادانەی ڕاستەو خۆی خەڵك یان نوێنەرانی شەرعییەت وەربگرێ، قسـەی تێكـڕای زانایـانی ئیسـلامە، بـۆ نموونـە: هـەركام لـە: (الغزالـي)و (البـاقلاني)و (الماوردي)و (البغدادي)و (إبن خلدون)و (إبن قدامة المقدسي)و (إبن تيميـة) لەكتێبەكانی خۆیاندا باسیان كردوە[1].

٢- حوكمڕانی مسـوڵمان، نەك هەر خۆی پـێ حـوكمڕانی ڕەهـا نیـەو قسـەو بڕیارەكانی خۆی هەموو پێ ڕاستو تەواو نین، بەڵكو هەوڵ دەدات لەهەموو مسـوڵمانان پابەندتربێت بە شەریعەتەوەو بۆ یاساو بڕیارەكانی ملكەچتربێت، وەك خوا ﷻ بە یەكەمین حوكمڕانو سەرۆكی دەوڵەتی ئیسلامیی پێغەمبەری خوا (رسول الله)ی فەرمووە: ﴿ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ فَٱتَّبِعۡهَا ...﴾ (الجاثيـة: ١٨)، واتە: پاشان تۆمان خستە سـەر بەرنامەیـەك دەجـا شـوێنی بكەوە..

حوكمڕانی مسوڵمانو سەرۆكی دەوڵەتی ئیسلامیی، نەك هەر بەرەخنەو ئامۆژگـاری قـەڵس نـابێ، بـەڵكو فەرمانیشـی پێـدەكات، وەك یەكـەمین جێنشینی پێغەمبەری خواو دووەمین بەرپرسی دەوڵەتی ئیسلامیی (أبو بكر الصديق) خوا لێی ڕازی بێ، پـاش هەڵبـژێررانیو لەیەكـەمین وتاریـدا بـە مسـوڵمانانی گوت: {إنّي قـد وُلِّيـتُ علـيكم ولَسْـتُ بِخَيْـركم فـإن أحسَـنْتُ فأعينوني وأن أسأتُ فَقَوِّمـوني}[2]، واتە: ئەوە من بە حوكمڕانتان دانراوم،

---

(١) بڕوانە: (النظام السياسي الإسلامي مقارنـاً بالدولـة القانونيـة) د. مـنير حميـد البيـاتي، ص٢٠٩-٢٣٩.

(٢) بڕوانە: (الكامل في التأريخ)ی (إبن الأثير) ج٢ ص٢٢٥،٢٢٤.

بەڵام چاکترینتان نیم، جا ،ئەگەرچاکەم کرد هاوکاریم بکەن‌و، ،ئەگەرخراپەم کرد ڕاستم بکەنەوە.

٣- حوکمڕان‌و کاربەدەستان لەدەوڵەتی ئیسلامییدا چین‌و دەستەیەکی تایبەت نین، بەڵکو هەموو تاکێکی کۆمەڵگای ئیسلامیی بۆی هەیە بە گوێرەی شایستەیی خۆی هەر کارو پۆستێك‌و هەر پلەو پایەیەك وەربگرێ‌و، لە ئیسلامدابۆ ئەرك‌و کار پێ سپێرران، تواناو شایستەیی کەسەکان سەنگی مەحەك‌و پێوەرە، نەك ڕەچەڵەك‌و چین‌و توێژو مەسلەك‌و مەشرەبیان، وەك خواﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ (السجدة : ٢٤)، دیارە زانایانیش لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا وەك بنچینەیەکی شەرعیی لەبواری سیاسەت‌و حوکمڕانیدا گوتوویانە: (بالصبر واليقين تُنال الأمامة في الدين)، هەروەها (یوسف)یش ﷺ کاتێك بە پادشێی میصر دەڵێ بمکە بەرپرسی ئابووریی وڵات، نالێ لەبەر ئەوەی پێغەمبەرم‌و باب‌و باپیرانم پێغەمبەرن! بەڵکو دەڵێ: ﴿ قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴾ (یوسف: ٥٥)، واتە: لەسەر خەزینەکانی وڵاتم دابنێ، چونکە من پارێزەری زانام.

٤- دەوڵەتی ئیسلامیی دەستی کراوەیە بۆ وەرگرتنی هەر بیرۆکەو هەر هۆکارو ئامرازێك کە دەبێتە مایەی بەرەو پێشبردنی وڵات‌و دابین کردنی بەرژەوەندی زیاتر بۆ خەڵك‌و هێنانەدی بەختەوەریی‌و خۆشگوزەرانیی چاکتر، ئنجا ئەوەش کە وێی کردوە دەوڵەتی ئیسلامیی دەستی کراوەبێ لە بەرانبەر گۆڕانکاریی‌و گەشەکردنەکانداو بەگوێرەی بەرژەوەندی خەڵك‌و کۆمەڵگا هەنگاو بنێ، ئەوەیە،کە-وەك پێشتریش گوتوومانە- ئیسلام لە بواری هەڵس‌و کەوتەکان (معاملات)دا کە حوکم‌و سیاسەت گرنگترین بەشیەتی، چەند دەقێکی کەمی هێناون کە زیاتر ڕۆڵی هێڵی گشتیی‌و چوار چێوەی

فراوان دەبینن، بۆیە مسوڵمانان لەبواری هـەڵس‌و کەوتەکانـدا کـە ئەسـڵ تێیاندا ڕێپێدران (إباحة)و دەستکراوەیی یە، مـەودایەکی زۆریان هەیـە بـۆ کۆشش کردن‌و داهێنان (إجتهاد وإبداع)، هـەر بۆیـەش پێغەمبـەری خـوا فەرموویەتی: {أنتم أعلم بأمور دنياكم} (رواه مسلم عن أنس عائشة رضي الله عنها برقم: ٢٣٦٣)، واتە: ئێوە لەکارو باری دنیاتانـدا شـارەزاترن، کـە وەك لەسیاقی فەمایشـتەکەو هـۆی هـاتنی (سـبب الـورود)یـەوە دەردەکـەوێ، مـەبەستی ئەو کاروبارانەن کە پسپۆڕیی‌و ئەزموون دەوریان تێـدا دەبیـنن، وەك بابەتەکانی: کشت‌و کاڵ‌و پیشەسازیی‌و بازرگانیی‌و جەنگ‌و ...هتد.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەشەوە کە بواری حوکم‌و سیاسەت گۆڕانکاریی زۆری تێدا دەبێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بەوە کردوە کە بابـای کـار بەدەست‌و حوکمڕان پێویستە کۆشش (إجتهاد) بکـات‌و فەرموویـەتی: {إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران، وإذا اجتهد الحاكم فأخطأ فله أجرٌ واحد} (متفق عليه)، واتە: حوکمڕان هەر کات کۆششی کردو پێکێی دوو پاداشـتی هەن، وە هەرکات حوکمڕان کۆششی کردو نەیپێکا پاداشتێکی هەیە.

٥- لە دەوڵەتی ئیسلامییدا ماف‌و ئازادییەکان بۆ سـەرجەم هاووڵاتیانـدابین دەکرێن، هەر لەمافی ژیان‌و گوزەرانێکی سەر بەرزانەی مرۆڤـانەوە، هـەتا مـافی ئازادی بـیرورا دەربـڕین‌و کاروچـالاکی سیاسـیو...هتد، وە بـەهیچ بیانووو پاساوێکەوە ڕێ بەهیچ کەس‌و دەزگایەك نادرێ کە پەنا بەرێتە بەر هەڕەشەو ترساندن‌و فشاریش چ جێی ئازارو ئەشکەنجەدان! جا هەڵبەتە ئێمە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نیە بچینە نێو درێژەی ئەم باسەوەو خوا یاربێ لـە ئاڵقەیەکی سەر بەخۆی ئەم زنجـیرە باسـەدا، بەتایبـەت باسـی هەڵوێسـتی

ئیسلام لەبارەی ئازادی بیروراو عەقیدەوە دەکەین، وە لەکتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا ئاڵقەی سێیەمان بۆ توێژینەوە لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە تەرخان کردوە بەناوونیشانی: (مافەکانی مرۆڤ لەنێوان ئیسلامو ڕۆژئاوادا)(١).

ئنجا لەباسەکانی پێشوودا باسمان کرد کە لەئیسلامداچینی کەهەنووتو ئەکلیرۆس نیە و، زانای ئایین (عالم الدین) جگە لەڕێنماییو شارەزاکردنی خەڵكو ئامۆژگاری کردنی ن، هیچ پلەو پایەیەکی دیکەی نیە، ئەوەتا خوای تەنانەت بە پێغەمبەری کۆتاییش دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية: ٢١-٢٢)، واتە: بیریان بخەوەو ئامۆژگارییان بکە! بێگومان تۆ بەس بیرخەرەوەو ئامۆژگاریو هیچ دەسەڵاتت بە سەریاندا نیە، دیارە هەرکەسێکیش لەمسوڵمانان شارەزێی قورئانو سوننەت بێتو کەمو زۆر پێیانەوە پابەند بێ، بە زانای ئیسلام دادەنرێ و جگە لەزانیاریی بە شەریعەتو پێوە پابەند بوونی بۆ بە زانا (عالم) دانران، هیچ شتێکی دیکەی وەك بەرگو پۆشاکی تایبەتو ...هتد بە مەرج نەگیراوە!(٢) لەبارەی ئازارو ئەشکەنجەدانیشەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بەسە کە (هشام بن حکیم بن حزام) لێی گێراوەتەوە: {إن الله يُعَذِّبُ الذين يُعذِّبون الناس في الدنيا} (رواه مسلم برقم ٢٦١٣)، واتە: بێگومان خوا ئەوانە ئازار دەدات،کە خەڵکی لەدنیادا ئازار دەدەن.

---

(١) بڕوانە: چاپی پێنجەم/ نوسینگەی تەفسیر-٢٠٠٥. بەڵام لێکۆڵینەوەی تێروتەسەلتری ئەم بابەتە لە زنجیرە باسی: (ئیسلام و دەوڵەتداری و حوکمڕانی)دایە لە باسی: (بنەماکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی) بنەمای حەوتەم: دابینکردنی ماف و ئازادییەکان بۆ هەمووان، کە ئێستاکە لە بەرنامەی (سەرنج)ی کەناڵی ئاسمانی پەیام دا پێشکەش دەکرێن.

(١) لە کتێبی: (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!)دا بەدرێژیی باسی زاناو پێشەوایانی ئیسلامman کردووە.

ئێستاش پاش خستنە ڕووی ئەم سێ بنەما گرنگەی حوکم و سیاسەت، کە خاڵی هاوبەش و لێکچووی نێوان ئیسلام و عەلمانییەتن، لەباسیداهاتوماندا سەرنجێکی گرنگترین خاڵە لەیەک جیایەکانی ئەو دوو ئایین و ڕێبازە دەدەین.

## خاڵە جیاوازەکانی
## سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام و سیکۆلاریزم

خوێنەری بەڕێز!

ئەم باسەمان کە باسی کۆتایی یە لەڕوونکردنەوەی چوارەمین بواری بەراوردی نێوان ئیسلام و سیکۆلاریزم دا، هەوڵدەدەین بەگوشراویی گرنگترین خاڵە جیاوەزەکانی نێوان سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام و سیکۆلاریزم بخەینەڕوو:

### یەکەم: حوکمڕانیتی باڵاو ڕەها لەئیسلامدا هی خوایەو لەعەلمانییەت دا هی مرۆڤە:

ئەمە یەکەمین و سەرەکی ترین خاڵی جیاوازی نێوان ئیسلام و سیکۆلاریزمەو، بەڵگەش لەسەر ئەوە، کەحوکمڕانێتی باڵا و ڕەها (الحاكمية العليا والمطلقة) تەنیا هی خوایە، زۆرن، بۆ نموونە:

* ﴿..إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ..﴾ (یوسف: ٤٠)، واتە: حوکمڕانیی بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە کە تەنیا ئەو بپەرستن، ئەوەیە بەرنامەی ڕاست...

* ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ..!!﴾ (الشورى: ٢١)، واتە: یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە بەرنامەیەکیان بۆ داناون خوا ڕێی پێ نەداوە!

لەم دوو ئایەتەوە بەڕوونیی دیارە کە هەرکەسێك بیەوێ بە خواپەرست دابنرێو بە دیندارێکی ڕاست حیساب بکرێ، دەبێ تەنیا خوا ﷻ بە حوکمڕانو بەرنامە دانەری خۆیو خەڵکی بزانێ، وەهەرکەسێك ئاینو بەرنامەی ژیانو گوزەرانی لەلایەن غەیری خواوە دابنرێ، ئەوە دووچاری هاوبەش بۆ خوادانان بووەو ئەو غەیرەی وەك خوا تەماشا کردوە! بەڵام ڕاستییەك هەیە نابێ لێی بێ ئاگابین ئەویش ئەوەیە،کە،ئەگەرحوکمڕانێتی ڕەهاو بالاّ تەنیا هی خوایە ﷻ، ئەوە مرۆڤیش لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتی خوادا -کە بەرجەستە کەری حوکمڕانێتی خوایە- حوکمڕانێتی بچووك (الحاكمية الصغرى)ی بۆ دانراوە کە ئەمیش لەکۆشش کردنو یاسادانان (إجتهاد وتشريع)ی زانایاندا خۆی دەبینێتەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران وإذا اجتهد الحاكم فأخطأ فله أجرٌ واحد} (متفق عليه)، شایانی باسیشە،کەکۆمەڵگایەك حوکمڕانێتی بالێی خوا کە لەشەریعەتەکەیدا بەرجەستەیە، تێیدا بەرقەرارە، زۆر جیاوازە لەکۆمەڵگایەك کە مەرجەعی سەرەتاو کۆتایی مرۆڤە، چونکە پابەندیی بە شەریعەتی خواوە مایەی پارێزرانی کۆمەڵگایە لەهەر جۆرە لادانێکی فیکرییو ڕووحییو ئەخلاقییو سیاسییو ئابووریی، با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست چەند نموونەیەك بێنینەوە:

أ- کاتێك شەریعەتی خوای کار بەجێ بە ڕوونو ڕاشکاویی قەدەغە کردنی مەی (خمر)و هەموو مادده سەرخۆشکەرەکانو قومارو بتپەرستییو یانسیب، ڕادەگەیەنێ بە کردەوەی شەیطانو بە شتێکی پیسیاندادەنێ، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ (المائدة :٩٠)، ئەوە بێگومان چەند ڕاستییەکی گرنگ دەخاتە بەردەستی مرۆڤ کە عەقڵو فیطرەتو زانستو واقیعو ئەزموون، پشتگیرییان دەکەن، کە بریتیە لەوەی هەرکام لەو

کارانە پیسو زیان بەخشنو دەردو نەخۆشیین، لەهەموو بوارەکانی فیکریی‌و ڕەوشتو کۆمەڵایەتیدا.

ب- هەروەها کاتێك شەریعەتی تێرو تەواوو لەگەڵ عەقڵو سروشت دا گونجاوی خوا ﷻ بێ پێچو پەنا رایدەگەیەنێ کە بازرگانی‌و مامەڵـە ڕەوایـەو سـوود خۆریی (ربا) قەدەغەیە، وەك خـوا فـەرموویوتی: ﴿..وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ..﴾ (البقرة: ٢٧٥)، ئەوە مانای وایـە لـەبوارێکی گرنگـی ئابووریـیدا چوارچێوەیەکی دیاریکردوەو کۆمەڵگای لـەدەردێکی کوشـندەی ئـابووری‌و کۆمەڵایەتی پاراستوە، کە بریتیە لە کەڵەکە بوونو پەزمەندە بوونی مـاڵو سامان لەدەست چەند کەسێکی کەم دا، لەسەر حیسابی هەژاریی‌و نەداریی خەڵکێکی زۆر بە هۆی سوود خۆرییەوە.

ج- هەروەها کاتێك شەریعەتی خوا لەسەر مسوڵمانان فەرز دەکات،کە بەبێ مۆڵەت وەرگرتنو سـلاوکردن نەچـنە مـاڵی یەکـدی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا...﴾ (النـور: ٢٧)، وەکاتێك لەسەر هەرکام لەپیاوانو ئافرەتانی پێویست کردوە کە خۆیان لەبۆ یەکدی ڕوانینی حەرامو ئارەزوو بازانە بپارێزنو، خۆیان لەداوێنپیسـی بپارێزنو، لەسەر ئافرەتان پێویست دەکات،کەسەرپۆش بکەنو جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی لەکاتی عیبادەت داوبە عادەت دەردەکەوێ، کـە دەمو چـاوو هـەردوو دەسـتە هـەتا مەچـەك: ﴿قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ٣٠ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ...﴾ (النور: ٣٠-٣١)، ئەوە مانـای وایە پەرژینێکی مەحکەمی مەعنەویی‌و ئەخلاقیی بـۆ کۆمـەڵگا دانـاوەو لەداڕووخان پاراستوویەتی.

## دووەم: سیاسەت و حوکم لەئیسلام دا بە عەقیدەو خوا پەرستیی و ئەخلاقەوە پەیوەستە:

ئەمیش جیاوازییەکی دیکەی گرنگی نێوان ئیسلام‌و سیکۆلاریزمە لەبواری حوکمڕانییدا، چونکە لەئیسلامداحوکم‌و سیاسەت وەك هەر جم‌وجۆڵ‌و چالاکییەکی دیکەی تاك‌و کۆمەڵ، بە ئیمان‌وعەقیدەوە پەیوەستەو ئیمان‌و عەقیدە بناغەی هەموو شتێکە، هەروەها کارو چالاکی سیاسی لەئیسلامدامادام ڕاست‌و سا (خالص وصواب)بێ، بە جۆرێك لەطاعەت‌و خوا پەرستییدادەنرێ، وەك لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ: ﴿ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ...﴾ (يوسف: ٤٠-٣٩)، واتە: ئایا چەند پەروەردگار -وخاوەن‌و سەروەرو پەرستراو- ێکی پەرتەوازە باشترن (بپەرسترێن) یان خوای تاکی ملپێکەچکەر؟ ئێوە ئەو شتانەی لەجیاتی خوا دەیانپەرستن هیچ نین جگە لەچەند ناوێك کە خۆتان‌و باب‌و باپیرانتان ناوتان ناون و، خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردوونەخوار، بێگومان حوکمڕانیی بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەو -هیچ شتێك- نەپەرستن، ئائەوەیە ئایینی ڕاست‌و دروست..

لەبارەی پەیوەست بوونی حوکم‌و سیاسەت بە خوو ڕەوشتیشەوە ئەم چەند دەقە بە نموونە دێنینەوە:

* ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ (القصص: ٨٣)، واتە: ئەو مەنزڵگای دوا ڕۆژە دەدەینە کەسانێك کە خۆسەپاندن‌و خراپەکاریی یان ناوێ لەزەوییدا وە سەرەنجام بۆ پارێزکارانە.

* {مامن راعٍ يسترعيه الله رعيةً، يموت يوم يموت وهو غاشٌ لِرَعِيَّتِهِ الاّ حرَّم الله عليه الجَنَّةَ} (متفق عليه)، واتە: هەر بەرپرسێك خوا کارێکی بخاتە

دەستو لەگەڵ ئەوانەى لەبندەستيدان ناپاك بىٚ، كاتێك كە دەمرىٚ بە تەئكيد خوا بەهەشتى لىٚ قەدەغە دەكات.

* {ما مِنْ أميرٍ يلي أمر المسلمين ثم لايجهدْ لهم ولايَنْصَحْ لهم الاّ لم يَدْخُل معهم الجَنَّة} (رواه مسلم)، واتە: هەر بەرپرسێك كارى مسوڵمانان بە ئەستۆوە بگرىٚ، پاشان خۆى بۆيان ماندوو نەكاتو بۆيان دڵسۆز نەبىٚ، ئەوە لەگەڵيان ناچێتە بەهەشتىٚ.

* {مَنْ وُلِّيَ من أمر المسلمين شيئاً فَوَلّى رجُلاً وهو يَجِدُ من هو أصلح للمسلمين منه فقد خان الله ورسولَهُ} (رواه الحاكم).

واتە: هەركەسێك لەكاروبارى مسوڵماناندا بەرپرسێتييەكى پىٚ بدرىٚ و، ئەويش پياوێك بكاتە بەرپرسى كارێك، لەحاڵێكدا كە هى لەئەويش شايستەترو چاكترى بۆ مسوڵمانان پىٚ شك بێت، ئەوە خيانەتى بە خواو پێغەمبەرەكەى كردوە.

وەك لەم ئايەتو فەرمايشتانەوە دەردەكەوىٚ مەسەلەى حوكمڕانيى لەئيسلامداپەيوەندى بە ئيمانو عەقيدەو طاعەتو خواپەرستيىو خوو ڕەوشتى بەرزو پەسندەوە هەيە، بەلاّم شتێكى ئاشكرايە كە لەسيكۆلاريزم دا وانيەو، سكۆلاريستەكان پێيان وايە كە مەسەلەى سياسەتو حوكمڕانيى، پێويستە جگە لەهێنانە دى ئامانجەكانو گەيشتنە مەبەست، هيچ شتێكى ديكەى تێدا ڕەچاو نەكرىٚو گوىٚ بە هيچ شتێكى ديكە نەدرىٚ! هەر بۆيەش عەلمانييەكان (ميكياڤيلى) خاوەنى كتێبى (ئەمير) لەبوارى هونەرى سياسەتو حوكمڕانييدا بەسەر مەشقى خۆيان دەزانن و، پشتگيريى راو بۆچوونەكانى دەكەنو بنچينەى: ئامانج پاساوى هۆكار دەداتەوە: (الغاية تُبَرِّرُ الوسيلة) كەنێوەڕۆكو كاكڵى سياسەتى ميكياڤيلييانە بەرجەستە دەكات، لەلێى سياسەتمەدارانى تەوژمى عەلمانيى، يان زۆربەى هەرە زۆريان، شتێكى نەك هەر ئاسايى بگرە پەسندو پێويستيشە!

بەلاّم سیاسەتی میکیاڤیلیانە هەرگیز لەئیسلامداجێی نابێتەوە و، لەئیسلامداوەك چۆن ئامانجەکانت پێویستە شەرعیی‌و پەسندبن، ئەو هۆکارو ئامرازانە (الأسباب والوسائل)ەش کە بۆ هێنانەدی ئامانجەکانت بەکاریان دێنیّ، پێویستە هەر وابن، جا لەو بارەوە زانایان بنچینەیەکی شەرعییانداناوە، کە دەڵێ: ئامرازەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە (للوسائل حكم المقاصد).

بۆ نموونە: بە هیچ شێوەیەك لەئیسلامدالەبواری هەڵس‌و کەوت دا ،تەنانەت لەگەڵ نەیارو ناحەزانیشدا درۆو پەیمان شکاندن دروست نیە، بەڵکو بەیەکێك لەتاوانە هەرە زلەکاندادەنریّ، وەك خوا سبحانه وتعالى فەرموویەتی: ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِن بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلًا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ .. ﴾ (النحل: ٩١-٩٢).

واتە: وەهەرکاتێك پەیمانتان بەست پەیمانی خوا جێ بەجێ بکەن‌و پاش ئەوەی سوێندە پتەوەکان دەخۆن هەڵیان مەوەشێننەوە، لەحاڵێکدا کە خواتان بەسەر خۆتانەوە کردۆتە کەفیل. وە وەك ئەو -ئافرەت- ە مەبن کە پاش ڕستن ڕیسەکەی خۆی دەکردەوە خوری! دیارە کاتێك خیانەت لەبەڵێنەکانتاندا دەکەن - بە پاڵنەری بەرژەوەندییەو- لەبەر ئەوەیە،کەکۆمەڵێك (کە پەیمانەکەی بۆ هەڵدەوەشێننەوە) زیاترو بەهێزترە (لەوەی کە پەیمانەکانی لەگەڵ هەڵدەوەشێننەوە)...

وەك دەبینین خوای کار بەجێ‌و دادگەر زۆر بەجەخت کردنەوە فەرمان بە ئیمانداران دەکات،کە بۆ هیچ بەرژەوەندییەك خۆیان گیرۆدەی پەیمان شکێنیی‌و بێ بەڵێنیی نەکەن، ئەگەرنا دەچنە ڕیزی ئەو ئافرەتە گێل‌و نەفامەوە، کە هەتا ئێوارە تەشی بادەدات‌و خوری‌و مووو تووك دەڕێسێ، بەلاّم ئێواریّ هەڵی دەوەشێنێتەوەو دەیکاتەوە خوری‌و...هتد!

سێیەم: ئیسلام هەر لەبنەڕەت دا سیاسەت و حوکمڕانەکان بە پیرۆز نازانێ، تاکو پیرۆزییان لێ دارنێ:

سیکۆلاریستەکان زاراوەیەك بەکار دێنن کە ئێمە پێشتر وەك لەگەڵدارۆیشتن (مجارية) بەکارمان هێنا، کە بریتیە لە: (پیرۆزیی دارنین لەدەستەلاَت)، مەبەستیشیان پێی ئەوەیە،کەحوکمڕانەکانو ئەهلی سیاسەت واسەیر نەکرێن کە کەسانێکی پیرۆز (مقدّس)و بێ هەڵەو کەمو کوڕییو ڕەخنە هەڵنەگرن، جا دیارە ئەم بیرۆکەیەش شتێکی هەقو ڕاستەو لەئەسڵیشدا لەکاردانەوەی (ثیوکراسیی)و حکوومەتی ئایینی لەلایەن کلێساوە تەبەننی کراو دا سەری هەڵدا، کەوەك پێشتر باسمان کرد، بەپێی بۆچوونی سیستەمی ثیوکراسیی بابای حوکمڕان وەك خوا یان سێبەرو نوێنەری خواﷻ تەماشا دەکراو، لەسەرووی ئەوەوە بوو کە نەك هەر ڕەخنەی لێ بگیرێ، بەڵکو هەر پێشنیاریشی بۆ بکرێ!

جا بێگومان -وەك پێشتر خستمانە ڕوو- ئەم جۆرە بیر کردنەوە هەر لەبنەڕەتەوە لەگەڵ بناغەی ئیسلامداناکۆك‌و نەگونجاوە لەنێو کۆمەڵگایەکی ئیسلامییدا جێی نابێتەوە.

چونکە لەئیسلام بەس خوا -تعالى وتقدَّس- بەبێ هەڵەو پیرۆز (مُقدّس) دادەنرێ و، غەیری وی هەموو کەس بەهەڵەکار دادەنرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {كل بني آدم خطّاءٌ وخير الخطّائين التوّابون} (رواه أبو داود)، واتە: هەموو وەچەی ئادەم هەڵەکارنو چاکترین هەڵەکارانیش (بۆ لێی خوا) گەڕاوانن. هەربۆیەش کاتێك یەکێك بە خەلیفەی دووەم (عمر بن الخطاب)ی خوا لێی ڕازی بێ، گوت: پارێز لەخوا بکە (إتقِ الله)و یەکێك لەکۆڕەکەیدا ڕەخنەی لێگرت،کە چۆن وا بە گەورەی مسوڵمانان دەڵێی، عومەر گوتی: {دَعْهُ، لاخير فيكم ان تقولوها، ولا خير فينا إنْ لم نَسْمَعْها}، واتە: لێی گەڕێ (بابیڵێ) ئێوە ،ئەگەرنەیڵێن خێرتان پێوە نیە و، ئێمەش ئەگەرنەیبیستین، خێرمان پێوە نیە.

بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئیسلام هاوکات لەگەڵ ئەوەی،کەسیاسەتو

حوکمڕانەکان بەپیرۆزو بێ هەڵە نازانێ، هەر لەڕێوەش بە ڕەشبینی یان لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشایان ناکات!

بەڵکو ئیسلام سەرپەرشتی کردنی کارو باری خەڵكو حوکمڕانیی کردنی شەرعییانەو دادگەرانە، بە طاعەتو عیبادەتێکی گەورەو گرنگ دادەنێو، حوکمڕانی سەرڕاستو دادگەرو بۆ خەڵكو وڵات دڵسۆزو بە پەرۆش، بە کەسێك دەزانێ کە چاکترین پاداشتی هەیەو شایستەی باشترین ڕێزو تەقدیری لێی خواو خەڵکە! بەڵگەش لەو بارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

* خوای بەرزو مەزن لەسیاقی چەند ئایەتێکدا،کە وەسفو پێناسەو مەدحی بەندە چاكو پەسندەکانی خۆییان پێ دەکاتو بە (عباد الرحمن) ناویان دێنێ، لەکۆتایی وەسفو مەدحیاندا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ (الفرقان: ٧٤)، واتە: وەئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان هاوسەرانو وەچەمان بۆ بگێڕە بەمایەی دڵخۆشییو بەختەوەریی وە بۆ پارێزکاران بمانگێڕە بەپێشەوا.

کەواتە: پێشەوایەتی (إمامة) کردنی پارێزکارانو سەرپەرشتی کردنی کارو باری مسوڵمانان بەشێوەیەکی ڕێكو پێكو ڕاستو شەرعییانە، شتێکی هێندە پەسندو چاکە کە بەندە هەڵبژاردەکانی خوا بۆی لەخوا بپاڕێنەوە کە بەقسمەتیان بکات.

* پێغەمبەری خواش ﷺ پێشەواو حوکمڕانی دادگەر (إمام عادل)ی کردوە بەسەر قافڵەو یەکەمینی ئەو حەوت،کەسەی کە خوای بەبەزەیی لەڕۆژێك دا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە کە جگە لەسێبەری وی هیچ پەناو سێبەر نین: {سبعة يُظِلُّهم الله في ظِلّهِ يوم لا ظِلَّ الاّ ظِلُّهُ: إمام عادل...} (متفق عليه).

(أبو حامد الغزالي) لەبارەی گرنگی حوکمڕانێتیو پایەی حوکمڕانانەوە قسەیەکی جوانی هەیە کە دەڵێ: ((إعْلَمْ أن الشريعة أصلٌ والمُلْكَ حارسٌ. وما

لا أصل له فَمَهْدومٌ وما لا حارس له فضائِعٌ))[١]، واتە: بزانە! کە شـەریعەت بناغەیەو حـوکمڕانیی پاسـەوانە، هەرشـتێکیش بناغـەی نـەبێ ڕووخـاوەو هەرشتێکیش پاسەوانی نەبێ فەوتاوە!

هەروەها (إبن تيمية)ش لەو بارەوە گوتوویەتی: (يَجبُ أن يُعْرَفَ أنَّ ولاية أمـر الناس مِنْ أعظم واجبات الدين، بل لا قيام للدين ولا للدنيا الاّ بها...)[٢]، واتە: پێویستە بزانرێ کە سەرپەرشتی کردنـی کاروبـاری خـەڵك لەفـەڕزە گـەورەکانی ئایینە، بەڵکو بەبێ ئەوە نە دینداریی دەکرێو نە دنیاداریی... بەڵێ، حوکمڕانیی کردنو سەرپەرشتی کردنی کاروبـاری خـەڵك بـە شـێوەیەکیدادگەرانە، کـارێکی گرنگو گەورەو طاعـەتێکی یەکجار قورسە لەتەرازووی خێرو چاکەکانی بەنـدەدا، جا دیارە هیچ کاربەدەستێكو حوکمڕانێکیش بەبێ هاوکاریو دەستبارگرتنی خەڵك لەکارەکەیدا سەرکەوتوو نابێ، بۆیـەش ئیسـلام لەسـەر کۆمـەڵگای ئیسـلامیی پێویسـت کـردوە، کـە لەسـەر بناغـەو لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـانو سـوننەت دا، گوێڕایەڵیو فەرمانبەریی حـوکمڕانو مشـوور خۆرەکانیـان بکـەن، وەك پێشـتر خستمانە ڕووو چەند دەقێکمان هێنانەوە و، لێرەشدا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەنموونە دێنینەوە، کە دەفەرموێ: {إنّ الله يرْضى لكم ثلاثةً: أنْ تعبدوه ولا تُشْرِكوا به شيئا، وأن تعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرَّقوا، وأن تُناصِحوا مـنْ ولاّه الله أمركم} (رواه مسلم).

واتە: بێگومـان خوا سێ شتی بۆتان هەڵبژاردوە: کە بیپەرسـتنو هـیچ شـتێك نەکەنە هاوبەشی، وەکە توند دەست بەڕێسمانی خواوە بگـرنو پەرتـەوازە نـەبن، وەکە دڵسۆزیی بنوێنن بۆ هەرکەسێك کە خوا کاروبارتانی خستە دەسـت (مـادام بەپێی شەرع حوکمی گرتبێتە دەستو بەپێی شەرعیش حوکمڕانیی بکات).

---

(١) بڕوانە: (الأقتصاد في الأعتقاد) ص١٣٥.

(١) بڕوانە: (السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية).

## چوارەم: ڕاستكردنەوەو ڕەخنە لێگرتنی دەستەڵات ئەركێكی شەرعییە نەك بەس ماف:

ئەمیش جیاوازییەكی دیكەی نێوان ئیسلام‌و عەلمانییەتە لەبواری حوكمڕانییدا، وە لەڕاستیدائەمیش‌و ئەوانەی پێشووش سەرجەمیان پلەو ئیمتیازی ئیسلامن بەسەر سیكۆلاریزم دا.

بەڵێ، ئەگەربەپێی دیموكراسیی‌و سیكۆلاریزم مافی ڕەوای هەر هاوڵاتییەكە كە ڕەخنە لەحوكمڕان‌و كاربەدەستان‌و سیاسەتمەدارانی وڵات بگرێ و، هەڵەو كەم‌و كووڕیی یەكانیان بخاتە بەرچاوو پەنجە بخاتە سەر برینەكان، ئەوە لەئیسلامداڕەخنە لێگرتن‌و ڕاستكردنەوەی هەڵسووراوانی بواری حوكم‌و سیاسەت، وێڕای ماف بوون، ئەركێكی شەرعیی پێویستیشە! ئاشكراشە،كەئەرك (واجب)و ماف (حق) لەیەك جیان -بەتایبەت لەئیسلام دا-، چونكە مرۆڤ دەتوانێ چاوپۆشی لەمافەكەی بكات‌و دەستبەرداری بێ، بەتایبەت ،ئەگەربزانێ سەرئێشەی بۆ پەیدا دەكات! بەڵام ئەرك چونكە لێپرسینەوەو سزای لەدوایە و، مرۆڤ سەرپشك (مختار) نیە لەكردن‌و نەكردنیدا، وا بەئاسانی دەستی لێهەڵناگرێ! بەڵگەش لەسەر ئەوە،كەڕاستكردنەوەو ڕەخنەلێگرتنی كاربەدەست‌و مشوور خۆران لەئیسلامدالەسەر سەرجەم هاووڵاتیان پێویستە زۆرن، بۆ نموونە:

* ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة: ٧١)، واتە: وەپیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێكیان دۆست‌و پشتیوانی هەندێكیانن، فەرمان بەچاكە دەكەن‌و ڕێگریی لەخراپە دەكەن، وەنوێژ بەرپا دەكەن‌و زەكات دەدەن، وەفەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن، ئائەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بێگومان خوا زاڵی كاربەجێیە. وەك دەبینین خوای پەروەردگار فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لەخراپەی كردوون بە دوو خەسڵەتی سەرەكی بڕواداران‌و كردووشنی بە

مایەی بەزەیی پێدا هاتنەوەی خوا، کەواتە: بەبێ فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە -کە بێگومان ڕاستکردنەوەو ڕەخنە لێگرتنی دەستەڵات، گـرنگترین جۆریـەتی- بابای مسوڵمان چ پیاو چ ئافرەت، دوو خەسڵەتی بنەڕەتیو گرنگی مایەی بەزەیی پێدا هاتنەوەی خوای کەم دەبن!

* ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ (المائدة: ٧٨-٧٩).

واتە: ئەوانەی کافر بوون لەبەنی ئیسرائیل نـەفرینیان لێکـرا لەسـەر زمـانی داوودو عیسـای کوڕی مـەریەم، ئەویش لەسۆنگەی ئەوەوە، کە سەرپێچییان کردو سنوور شکێنییان دەکرد. ئـەوەبوو کـە یەکـدییان لەخراپەیـەك، کـە دەیانکرد قەدەغە نەدەکرد، کە بەڕاستی ئەوە خراپترین شت بوو دەیانکرد.

وەك دەبینین خوای بێ وێنە، یەکدی لەخراپە نەگێڕانەوەی بەنی ئیسرائیلی بە خراپترین کردەوەو مایەی نەفرین لێکرانیان لـەلایـەن (داوودو عیســا)- عَلَيْهم الصَّلاة والسَّلام-ەوە، لەقەڵەم داوە!

* ڕۆژێکیان (أبو بكر الصديق) خوا لێی ڕازی بێ، لەکاتی وتارداندا بەخەڵکی گوت: {أيها الناس! إنكم تقرؤن هذه الآية وتؤولونها على خلاف تأويلها: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ...﴾ (المائدة:١٠٥)، واني سمعت رسول الله ﷺ يقول: ان الناس اذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يَديْه أوشك أن يُعمِهّمُ الله بعقابٍ منه} (رواه الترمذي).

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننـەوە، بـەڵام بـە هەڵـەو پێچەوانە لێکی دەدەنەوە: (( ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەخۆتان وریا بن، ئەگەر ڕێی ڕاست بگرن ئەوانەی گـومڕان زیانتـان لێنـادەن))، بـەڵام مـن لەپێغەمبەری خـوام ﷺ بیسـتوە دەیفـەرموو: هـەرکات خـەڵکی، بابـای ستەمکاریان بینیو دەستیان نەگرتو لەستەمیان نەگێڕایەوە، نیزیکە خـوا

بە گشتیی سزایان بدات. کەواتە: دەست نەگرتنی بابای ستەمکار - کە دیارە بەبێ دەستەڵاتیش ستەم ناکرێ- مایەی سزاو جەزرەبەی دنیاو دوا ڕۆژیشە، چونکە بریتیە لەچواندنی ئەرکێکی شەرعیی گرنگ.

**پێنجەم: ڕاوێژ چوارچێوەکەی شەریعەتە، بەڵام دیموکراسیی هیچ چوارچێوەیەکی نیە:**

جیاوازییەکی دیکەی نێوان سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامو دیموکراسیی، ئەوەیە،کەڕاوێژ (شوری)، شەریعەت چوارچێوەیەکی بۆ دیاری دەکاتو ناهێڵێ لادانو خلیسکانو شوێنکەوتنی ئارەزووەکان لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا ڕووبدات، بە پێچەوانەی دیموکراسییەوە، کە هیچ چوارچێوەیەکی نیەو هیچ بەربەستێك لەبەردەم لادانو خلیسکانو سەرکێشییەکانیدا دانەنراوە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتریش دەڵێین: یەکێك لەو بنچینە شەرعییانەی، کە تێکڕای زانایانی ئیسلام لەسەری پێکهاتوون، ئەوەیە،کە لەکاتێکدا دەق هەبێ بواری کۆشش کردن نیە: (لااجتهاد في معرض النصّ)، واتە: هەر کاتێك دەقێکی شەرعییمان هەبوو لەسەر مەسەلەیەك، کە نوختەی تێدا خرابووە سەر پیت، ئەوە ئەو مەسەلەیە بواری قسەو کۆششکردنی تێدا نەماوەو پێویستە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، کە دەقەکە فەرموویەتی، بۆ نموونە: کاتێك دەزانین خوا سوود خۆریی (ربا)ی قەدەغە کردوەو فەرموویەتی: ﴿..وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ (البقرة:٢٧٥)، ئیدی تازە مەسەلەی مامەڵە کردن بە ڕیبا یەکلایی کراوەتەوەو جێی قسەکردنی تێدا نەماوەو، هیچ زانایەکی کۆششکەر (عالم مجتهد)و هیچ ئەنجوومەنێکی ڕاوێژکەر (مجلس متشاور)، مافی ئەوەی نیە قسە لەسەر مەسەلەیەك بکات،کە خوای کاربەجێو زانا قسەی لەبارەوە کردوەو یەکلایی کردۆتەوە.

هەروەها سەرجەم ئەو مەسەلەو بابەتانەی دیکە، کە دەقەکانی قورئانو سوننەت، قسەی ڕوونو کۆتاییان لەبارەیانەوە کردوونو هەڵیان بڕیون، هیچ کەس بۆی نیە قسەیان لەبارەوە بکات، بۆ نموونە: فەرزبوونی هەرکام لە:

خوا بەیەك گرتن، نوێژ، ڕۆژوو، زەكات، حەج، یادی خـوا، جـەنگ‌و جیهـاد، فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لەخراپە، هاوكارییەكدی كـردن لەسـەر چـاكە كـاریی‌و پارێزكاریی، چەسپاندنی دادگەریی.

وە قەدەغەبوونی هەركام لە:

هاوبەش بۆ خوا دانان، قـەتڵ، سـتەم، سـوود خـۆریی، مـەیخۆریی، قومـار، ڕێگریی، دزیی، داوێن پیسیی، ئازاردانی دڵی باب‌و دایك، پچـڕاندنی پەیوەنـدی خزمایەتی، جادووگەریی، پەیمان شكێنیی.

ئنجا وەك لەپێشەوەش ئاماژەمان پێدا، نوختە تێدا خرانە سەر پیت‌و هەڵبڕانی ئەم مەسەلانەو هاوێنەكانیان، شێرازەو چوارچێوەیەك پێكدێنێ، كـە كۆمـەڵگاو نێوەندودام‌و دەزگا بڕیار بەدەستەكانی، لەلادان‌و سەرەڕۆیی‌و خلیسكان بپـارێزێ. بۆ نموونە: لەكۆمەڵگایەكی ئیسلامیی‌و لـەنێو خـەڵكیكی مسـوڵماندا، هـەرگیز ناگونجێ قسە لەسەر ڕەوایی سوود خۆریی‌و زیناو مەیخواردنەوەو قوماركردن بكرێ، وەك لەكۆمەڵگاكانی ڕۆژئاوادا دەیبینین، بەڵكو خراپتر لەوەش لەپەرلەمانـەكانی وڵاتانی ڕۆژئاوادا، زۆر بەئاسایی قسە لەسەر ڕەوایی دیاردەو نەخۆشـییەكی وەك نێربازیی(الذكورية) دەكرێ، كە لەڕاستیدا بریتیـە لەهەڵگەڕانـەوە لـە فیطـرەت‌و مایەی تەشەنەكردنی چەندان نەخۆشی پیس‌و كوشندە، كە یـەكێكیان (ئایـدز)ەو مایەی قڕەبڕ (إنقراض) بوونی بەشەریشە!

ئنجا هەرلێرەشدایە، كە گەورەیی‌و گرنگیـی‌و پێویسـتیی حـوكمڕانێتی خـوا (حاكمية الله) لـەژیانی بەشـەردا دەردەكـەوێ، كـە وەك پێشـتریش گوتمـان ئـەو حوكمڕانێتییەش لەسەروەر بوونی بەرنامەی خوا (سيادة شريعة الله)دا بەرجەسـتە دەبێ، بەڵێ، لێرەدایە، كە حوكمڕانێتی ڕەهاو باڵای خـوای پـەروەردگار، فریـای مرۆڤـ دەكەوێ‌و، لەبواری حوكمڕانێتی گچـكە (الحاكمية الصغرى)دا دەسـتی دەگرێ‌و ڕێنمایی دەكات‌و، ناهێڵێ تووشی بڕیاری هەڵەو لادان‌و هەڵـدێران ببـێ، كۆتایی ئەم باسەش بەم دوو تێبینی‌و سەرنجە دێنین:

أ- بێگومان بۆ کارا کردن (تفعیل)ی ڕاوێژ، پێویستیمان بەزۆربەی موفرەدەو میکانیزمەکانی دیموکراسیی هەیە، کە لەسەر دەستی ڕۆژئاواییەکان باش درەوشانەوە،وەك: شێوازەکانی هەڵبژاردن، دەستاو دەست پێکردن (تداول)ی دەسەڵات، پێکهێنانو بەڕێوەبردنی ئۆرگانو دەزگاکانی حکوومەتو...هتد، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد، شەریعەت لەبواری مامەڵەکاندا -کە بەشێکی گرنگی حوکمڕانییە- دەقی کەمی داناون، بە پێچەوانەی بوارەکانی عەقیدەو عیبادەتو ئەخلاقو کاروباری خێزانەوە، کە نوختەیان تێدا خراوەتە سەر پیت، ئەم بابەتەشمان پێشتر لەژێر ناوونیشانی (چەسپاوو گۆڕاو لەدینو ژیندا) بەوردی باسکرد، زانایانی ئیسلامییش بەبنچینەی: (تفصیل مالایتغیّر وإجمال ما یتغیّر) جەوهەری ئەم مەسەلەیان خستۆتە ڕوو، واتە: بەدرێژیی خستنە ڕووی چەسپاوەکانو بەکورتیی باسکردنی گۆڕاوەکان، بۆیە مرۆڤی مسوڵمان دەستی کراوەیە، کە بەپشت بەستن بەعەقڵو ئەزموونی خۆیو خەڵکی، بۆشاییەکانی ئەو بوارە بە گوێرەی بەرژەوەندییو پێداویستییەکانی ژیانو گوزەرانی پڕبکاتەوە، خوای کاربەجێش لەمەدحی بڕوادارانێکدا، کە حیکمەتو زانیاریی بەسوود لە هەرکەسێکەوەبێ وەردەگرن، فەرموویەتی: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (الزمر: ١٧-١٨)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {الحكمة ضالّة المؤمن فحيثما وجدها فهو أحق بها} (رواه الترمذي).

ئنجا ئاشکراشە،کە کەلەپوورو ئەزموونیی بەشەر لەهەموو بوارەکانی فیکرو زانستو سیاسەتو ئەدەبو هونەرو... هتددا، هی هەموو گەلانەو هەموویان پشكو بەشیان تێدایەو، کەس لەکەسی زیاتر بەش پێوە نیەو، لەئەنجامی ڕۆڵ تێدا گێڕانو هاوکاری پێکەوە کردنی هەمووشیاندا، هەرکامێکیان لەچاخو قۆناغێکدا، بەرهەم هاتوە.

ب- وەك چۆن کاتی خۆی دیموکراسیی - کە لەگەڵ کەمو کوورپییەکانیشیدا، چاکترین سیستەمی حوکمڕانیی نێو سیستەمە بەشەرییەکانە- بەشەوورۆژێك ئەم قاڵبو شێوەیەی ئێستای وەرنەگرتوە، وەك لەکتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا باسمان کردوە، بەڵکو بەچەندان هەورازو نشێودا تێپەڕیوە، ڕاوێژ (شوری)یش بە سەبرێكو دوو فوان لەو پڕەنسیپو میکانیزمو دەزگایانەدا بەرجەستە نابێ، کە ڕووحی ئیسلامو نەفەسی دەقەکانی شەریعەتوحوکمی عەقڵو پێداویستی واقیع دەیانخوازن، بەڵکو پێویستی بەکارو چالاکیو مشوور خواردنو کۆڵ نەدان دەکات، گومانیشی تێدا نیە، کە گەشەکردنی ڕاوێژی ئیسلامیی لەچاودیموکراسیدا زۆر جیاوازەو بەراورد ناکرێ، چونکە وێڕای هەبوونی هاندەری ئیمانییو ڕووحییو قیامەتییو پشتیوانەی ئەخلاقیی، چوارچێوەیەکیشی هەیە، کە هەر لەڕێوە لەهەڵەو هەڵدێران دەیپارێزێو، سەربارەش دەستبارگرو ئاسانکارێکی چاکیشی دەبێ، بەڵام نابێ لەو ڕاستییەش بێ ئاگا بین، کە گەشەکردنو بەرەو پێشچوونی هەر گەلو کۆمەڵگایەك لەبواری حوکمو سیاسەتداو، پەیوەستە بەبەرەو پێشچوونو گەشەکردنییەوە لەهەموو بوارەکانی دیکەی ژیانو گوزەرانیدا، بۆیە بۆ هێنە نەدی گۆڕانکارییو چاکسازیی سیاسی لەنێو هەر گەلو کۆمەڵگایەکدا، پێویستە بیر لەپاکسازییو چاکسازییو گۆڕانکاریی کردن لەسەرجەم لایەنو بوارەکانیدا بگرێتەوە، لێرەشدا کۆتایی بەم بواری چوارەمەی بەراوردی نێوان ئیسلامو عەلمانییەت دێنین و، لە ئاڵقەی داهاتوومانداخوا یاربێ، لەڕووی: ئابوورییو ژیانو گوزەرانەوە ئەو بەراورد کردنە درێژە پێدەدەین.

شایانی باسیشە،کەبۆ توێژینەوەی بابەتی : (دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی لە ئیسلامدا) لەداهاتوودا پڕۆژەیەکی فراوانم بەدەستەوەیە، خوا یاربێ لێکۆڵینەوەیەکی خەست و خۆڵی لەبارەوە دەکەم.

## ئاڵقەی پێنجەم:

## لە بواری ئابووریی و ژیان و گوزەراندا

**خوێنەری سەنگین!**

**پاش ئەوەی لە بەشەکانی پێشوودا بەراوردێکی نێوان ئیسلامو سیکۆلاریزمان کرد لە هەر چوار بواری: (بیروباوەڕ)و (پەرستن)و (فیکرو زانست)و (حوکمو سیاسەت)دا، خوا پشتیوان بێ ئەمجارە بەراوردێکی خێرای ئەو دوو ئایینو تەوژمە دەکەین لە بواری (ئابووریی‌و ژیانو گوزەران)دا.**



# دید و بۆچوونی سیکۆلاریزم لەمەڕ ئابووریی و ژیان و گوزەرانـەوە

سـەرەتا دێینەسـەر باسی خستنەڕووی هەڵوێسـتی سـیکۆلاریزم لەمـەڕ ژیـانو گوزەرانو ئابووریی‌و دەڵێین:

سـیکۆلاریزم وەك چۆن لـە بوارەکـانی (بوونناسـیی)و (بیروبـڕوا)و (حـوکمو سیاسەت)دا خاوەنی هەڵوێسـتێکی ڕوونو سـەربەخۆ نیـە -وەك پێشـتر ڕوونمـان کردەوە- لە بواری (ژیانو گوزەران ئابووریی)یشدا بە هەمان شێوە دیدو بۆچوونو هەڵوێستێکی ڕوونو سەربەخۆی نیەو، هیچ بەرنامەو پڕۆژەیەکی هێڵی گشتیی بۆ دانراوو چوارچێوە دیاریکراوی نیە، کە شوێنکەوتوانی کـەمو زۆر لەسـەری ڕێـك بکەونو لێك تێگەیشتن (تفاهم)یان لەبارەیەوە هەبێ!

هەر بۆیەش هەر لەو کاتەوە، کە خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا پاش سڵەمینەوەو تێکگیرانیان لەگەڵ کڵێساو ئایینە شـێوێنراوو لـە ئەفسـانە هەڵاخنەراوەکەیـدا، عەلمانییەت (Secularism)یان وەك ئایینو بەرنامـەی ژیانو گوزەرانیان پەسند کرد، شوێنکەوتوانو پەیڕەوانی ئەو ئایینە چەندان جۆرە سیستەمو بەرنامـەی ئابوورییان تەبەننی کردوە، کە هەندێکیان ڕاست دژو پێچەوانەی یەکن، بۆ نموونە: هاوبەشێتی (Socialism)و سەرمایەداریی (Capitalisme) ئنجـا ئاشکراشـە،کەئەو وڵاتانـەی سیستەمی ئابووری سۆسیالیزم (الإشتراكية)یان تەبـەننی کـردوە، لەوانـەی، کـە سیسـتەمی کاپیتـالیزم (الراسمالیـة)یـان تەبـەننی کـردوە، خۆیـان کـەمتر بـە سیکۆلاریست نازانو بەپێچەوانەوەش.

جا ئێمە پاش تۆزێکی دیکە پێناسەیەکی کورتی هـەرکام لـە (سۆسـیالیزم)و (کاپیتالیزم) دەکەین، کە ناودارترین سیستـەمی ئابووری تەبەننی کراون لەلایـەن

پەیڕەوانی ئایینی سیکۆلاریزمەوە، بەڵام ئێستا با سەرنجی دیدو بۆچوونی سیکۆلاریزم بدەین لەبارەی ژیانو گوزەرانەوە بە گشتیی:

ئەگەرسەرنجی پێناسەی (Secularism) بدەین، زۆر بەڕوونیی هەڵوێستی لەبارەی ژیانو گوزەرانی دنیاوە دەزانین، کە بریتیە لە چڕکردنەوەی بایەخدان بە ژیانی دنیاو، زیاتر بەرەوپێشبردنیو خۆشکردنی بە گەورەترین ئامانجو مەبەست دانان!

چونکە سیکۆلاریزم لە باوترین پێناسەیدا ئاوا ناسێنراوە:

((سیکۆلاریزم جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتییە ئامانجی ئەوەیە، کە خەڵکی لە گرنگیيو بایەخدان بە دوارۆژ لابدات بەرەو گرنگییدان تەنیا بەم ژیانە دنیاییە.

ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا خەڵکی زۆر ئارەزوومەندی پشت لەژیانی دنیاکردنو بیرکردنەوەو ڕامان بوون لە خواو ڕۆژی دواییدا، جا بە مەبەستی بەرهەڵستیکردنی ئەم ئارەزووە (Secularism) دەستی کرد بە خۆرانواندن لەمیانەی گەشەپێدانی هەستی مرۆڤگەرایی و، خەڵك لە سەردەمی راپەڕیندا دەستیان کرد بە خستنەڕووی پەیوەست بوونی توندیان بە بەرهەمە کلتوورییو مرۆییەکان و، خستنەڕووی ئەوە،کەدەگونجێ هەر لەم دنیا نزیکەدا ئاواتەکانیان بێننەدی.

ئیدی بەو جۆرە ڕووکردنە (Secularism) بەردەوام لە گەشەکردندابوو، لەماوەی مێژووی هاوچەرخدا بەگشتیی، وەك جووڵانەوەیەکی دژی ئایینو دژی نەصرانییەت.))[1].

کەواتە: سیکۆلاریزم وا تەماشای ژیانو گوزەرانی دنیا دەکات،کە تاکە دەرفەتی ژیانەو پێویستە مرۆڤ هەموو تواناو وزەی خۆی لەپێناویدا تەرخان

---

(١) بڕوانە: (العلمانية) سفر بن عبدالرحمن الحوالي، ص ٢٢، کە لە: (دائرة المعارف البريطانية) (Encg.Britannica Vol.IX P.19) وەری گرتوە و منیش دەقاودەق وەرم گێڕاوەتەسەر کوردی.

بکاتو، بێجگە لە ژیانی دنیاو خۆشیو ئارەزووەکـانی، بایـەخ بەهیچـی دیکـە نەدات!

ئێستاش با پێناسەیەکی کورتی هەرکام لە کاپیتالیزمو سۆسیالیزم بکەین، کە تەوژمی سیکۆلاریزم بە گشتیی ئەو دوو سیستەمەی لە بواری ئابووریدا تەبەنی کردوون:

یەکەم: کاپیتالیزم، (الموسوعة العربية) بـەم شـێوەیە پێناسـەی (Capitalisme) دەکات:

((نظام إقتصادي-إجتماعي تكون فيه معظم وسائل الإنتـاج ملكيـة خاصـة، ويكون دافع الربح والمنفعة فيه محرك النشاط الإقتصادي))[1].

واتە: سیستەمێکی ئابووریی کۆمەڵایەتییە، زۆربەی هۆیەکانی بەرهەمهێنان خاوەندارێتی تایبەتییان دەبێ، پاڵنـەری قـازانجو بەرژەوەنـدیی (تـاك) تێیـدا، بزوێنەری چالاکی ئابوورییە.

هەروەها بڕوانە (الموسوعة الميسرة في الفكـر الفلسـفي والإجتمـاعي، عربـي-إنجليزي) د.كميل الحاج[2]، کە بە هەمان شێوە پێناسەی کردوە.

دووەم: سۆشـیالیزم: هــەمان سەرچـاوەی پێشـوو لـەبارەی (Socialism)ەوە گوتوویەتی:

{نظام إقتصـادي إجتمـاعي يقـوم علـى الملكيـة الإجتماعيـة لوسـائل الإنتـاج الأساسية من أجل تلبية حاجات المجتمع على الوجه الأمثل، والقاعدة الإقتصـادية الأساسية في هذا النظام هـي إلغـاء التقسـيم الطبقـي وإلغـاء إسـتغلال الإنسـان للإنسان}[3].

---

(١) بڕوانە: ج٩، ص ٧١٤.

(٢) ص ٢٥٥ و٢٥٦.

(٣) ج٢، ص ٥٢٦.

واتە: سیستەمێکی ئابووریی کۆمەڵایەتییە، کە لەسەر ئەوە بنیات دەنرێ، هۆیە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان بەدەست کۆمەڵگاوەبن، تاکو بە باشترین شێوە پێداویستییەکانی کۆمەڵگا دابین بکرێن، بنەمای بنچینەیی ئابووریی لەم سیستەمەدا، بریتییە لە نەهێشتنی دابەشکردنی چینایەتیو نەهێشتنی چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ.

هەروەها بڕوانە: (الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي، عربي- إنجليزي)[1]، کە پێناسەیەکی تێرو تەسەلی بۆ وشەی ناوبراو کردوە.

لە پێناسەی کاپیتالیزمو سۆشیالیزمیشەوە بەڕوونیی دیارە، کە پێچەوانەو دژی یەکدین و، یەکەمیان لەسەر حیسابی کۆمەڵگا (مجتمع) بەلای تاک (فرد)دا شکاوەتەوە و، مادام تاک قازانج بکات پەکی بە زەرەرو زیانی کۆمەڵگە نەکەوتوە!، دووەمیشیان لە کاردانەوەیداو بۆ بەرگریی کردن لە بەرژەوەندی گشتیی، بەلای کۆمەڵگادا دایشکاندوەو، تاکی لە مافێکی ڕەواو ئارەزوویەکی خۆڕسکو ڕیشەیی، کە خاوەندارێتی (الملكية)یە داپڕووتاندوەو بێبەش کردوە.

ئێستاش با سەرنج بدەین داخۆ ئیسلام دیدو تێڕوانینی بۆ ژیانو گوزەران چۆنەو، لەبەرامبەر (ئابووریی)شدا، هەڵوێستی چییەو هێڵە گشتییەکانی سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی چیو چین!



---

(١) ص ٣٩.

# دیدو تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیان و گوزەران

دەتوانین لەم حەوت خاڵەی خوارێدا بـەکورتیو گوشـراویی، دیـدو تێڕوانینـی ئیسلام بەرامبەر بە ژیانو گوزەرانی مرۆڤ لە دنیادا بخەینەڕوو:

**١- مرۆڤ جێنشینی خوای بەرزو مەزنە لەسەر زەوی:**

ئەم ڕاستییە مەزنە لە چەندان ئایەتی بەپێزی قورئانی بەرێزدا خراوەتەڕوو، بۆ نموونە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً..﴾ (البقـرة: ٣٠)، واتـە: یـاد بکـەوە، کاتێـك پـەروەردگارت بـە فریشـتەکانی فـەرمووی: مـن جێنشینێك لەسەر زەویدادەنێم...

(القرطبـي) لە لێکدانەوەی ئەم رستە قورئانییەدا گوتوویەتی[1]:

((والمعنى بالخليفة هنا في قول إبن مسعود وإبن عباس وجميع أهل التأويل، آدم عليه السلام وهو خليفة الله في إمضاء أحكامه وأوامره...)).

واتە: مەبەست لە (خليفة) لێرەدا بـەڕای عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعوودو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسو سەرجەم توێـژەرەوان، ئادەمـە عليه السلام، واتـە: ئـەو جێنشینی خوایە لە جێبەجێ کردنی یاساو فەرمانەکانیدا.

دیـارە خەلیفـەی خوابـوونی ئـادەمو وەچەکەیشـی لەسـەر زەوی، مانـای ئەوەیە،کەخوا ﷻ دەستی مرۆڤـی ئاوەڵا کـردوە بـۆ هەڵسـوکەوت کـردنو دەست تێوەردان (تصرّف) لە زەویدا و، ئەمەش ڕاستییەکە لە دنیای واقیعـدا بەرجەستەیەو، ،ئەگەربەڵگەی وەحی (دليل نقلي)یشی لەسەر نەبوایە، بەڵگەی

(١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) ج١، ص ٢٥٨.

عەقڵو واقیع بەس بوو بۆ ئیسپات کردنی.[١]

## ٢- ژیانی دنیا شوێنی تێدا تاقیکرانەوەی مرۆڤــە:

بەڵێ، خوا ﷻ بە مەبەستی تاقیکردنەوە (إمتحان) مرۆڤـــی لەسەر زەوی داناوەو ئەرکی جێنشینایەتی خۆیو هەڵگرتنی سپاردە (أمانـة)ی خـۆی پـێ سپاردوە.

ئەو سپاردەدەیەی، کە تـەنیا مرۆڤـــ شایسـتەیی هـەڵگرتنی هـەبوو لـە بوونەوەرداو هـیچ کـام لـە ئاسمانـەکانو زەویو شـاخەکان ئـەو ئامـادەییو شایستەییەیان نەبوو، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ (الأحزاب: ٧٢).

بەڵگەی قورئانیش لەسەر ئەوە،کە مرۆڤــ بۆ تاقیکرانەوە هێنراوەتە ئـەم ژیانە زەمینییەوە، زۆرن، بۆ نموونە:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴾ (الملـك:٢)، واتە: (خوا) ئەو کەسەیە، کە مــەرگو ژیــانی هێناونــەدی، تــاکو تاقییتـان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی چاکترە، ئەو زاڵی لێبوردەیە.

## ٣- مرۆڤـ بوونـەوەری بـۆ مەیسـەر کـراوەو ئاوەدانکردنـەوەی سـەرزەمینی لەسەر پێویست کراوە:

بەڵێ، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ئەم بوونەوەرە هەمووی شانۆیەکە بۆ تێـدا تاقیکرانەوەی مرۆڤــ سازکراوە، وەك خوا فەرموویەتی:

---

(١) لە بەرگی یەکەمی کتێبی: ( خواپەرستیی ئیسلامیی...)دا بەدرێژی باسی ماناو چەمك و چۆنیەتی خەلیفەی خوابوونی ئادەم و وەچەکەیمان کردوەو بەرپەرچی ئەوانەشمان داوەتـەوە، کـە ئەو ڕایەیان پێ هەڵەیە.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا .. ﴾ (هود: ٧)، واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژاندا (واتە بە شەش قۆناغ) هێناونەدی ، ئـەو کاتە بارەگاکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقییتان بکاتـەوە کامـەتان کـردەوەی باشترە..

شایانی باسیشە ئێمـە لـە بەشـی (بووناسـیی)دا بەدرێـژیی باسـی ئـەم مەسەلەیەمان کردوەو، ئەم ئایەتەشمان بەوردیی توێژیوەتەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە،کە ئاوەدانکردنەوەی زەمین ئەرکێکە خراوەتە ئەستۆی مرۆڤـــەوە، زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی بەپێزن، بۆ نموونە:

﴿ ..ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴾ (هود: ٦١)، واتە: ...خوا بپەرسـتن جگـە لـەو، هـیچ پەرسـتراوتان نـین، ئـەو لـە زەویـدا پێـی گەیانـدوونو ئاوەدانکردنەوەیشی پێ سپاردوون، دەجا داوای لێبوردنی لێبکەنو بگەڕێنەوە لای، بەڕاستی پەروەردگارم نزیکی وەڵامدەرەوەیە.

## ٤- مرۆڤ لە دوو پێکهێنەری بنەڕەتی پێکهاتوە کە گیانێکی خوایی و جەستەیەکی خاکیین:

ئەمیش ڕاستییەکە لە زۆر شوێنی قورئاندا خراوەتەڕوو، بۆ نموونە:

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ (ص: ٧١، ٧٢)، واتە: یاد بکەوە کاتێـك پـەروەردگارت بـە فریشتانی فەرموو: من بەشەرێك لە قوڕ دروست دەکەم. جا هـەرکات ڕێکـم خستو لە گیانی خۆم فووم بەبەردا کرد، کڕنووشی (ڕێزگرتن)ی بۆ بەرن.

دیارە پێکهاتنی مرۆڤـــیش لە جەستەیەکی خاکییو گیانێکی خوایی ئەوە دەخوازێ، کە مرۆڤـ پێویستە ئاگاداری هەردووك پێکهێنەرەکەی بێتو، نـە

وەك دروستکراوێکی ماددیی‌و جەستەیی ڕووت و، نەوەك گیانێکی تەنهاش لە خۆی نەڕوانێ‌و، وریایی تەواوی هەبێ لە پاراستنی هاوسەنگیی (تـوازن)ی نێوان ڕووحە خواییەکەی‌و جەستە خاکییەکەیدا.

٥- خوا هەرچی شتی پاك و چاکەو ژیانی مرۆڤ لە دنیادا پەکی لەسەری کەوتوە بۆی ڕەوا کردوەو هیچ کەس بۆی نیە بەناوی خواو ئایینەکەیەوە نیعمەتەکانی خوا لە بەندەکانی قەدەغە بکات:

لەو بارەشەوە ئایەتی قورئانی بەرزو بەپێز زۆرن، بۆ نموونە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا ..﴾ (البقرة: ١٦٨)، واتە: ئەی خەڵکینە! لەوەی لەسەر زەوی هەیە لە بژێوی حەڵاڵ‌و بەتام‌و چێژ، بخۆن...

﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِ ..﴾ (الأعراف:٣٢)، واتە: بڵێ کێ ئەو جوانییەی خوا بۆ بەندەکانی هێناویەتەدی‌و بژێوە خۆش‌و سوودبەخشەکانی، قەدەغەکردوە؟

بەڵێ هیچ کەس مافی ئەوەی نیە شتێك لە بەندەکانی خوا - بەهیچ پاساوێك‌و لەژێر هیچ ناوونیشانێکدا- قەدەغە بکات، چونکە خوا نیعمەتەکانی خۆی هەر بۆ بەندەکانی بەگشتیی دروست کردوون، کەواتە چۆن شتێکیان لێ قەدەغە دەکات،کە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوانی دروست کردوە؟

٦- لە سۆنگەی ئەوەوە،کەخوا ﷻ پەرستنی خۆی کردۆتە حیکمەت‌و ئامانجی دروستکرانی مرۆڤ و جند، بۆیە سەرجەم چالاکییەکانی مرۆڤ بە خواپەرستیی دادەنرێن، بە مەرجێك لەسەر هەردووك پایەی: بەپێی بەرنامەی خوا بوون و، خوا پێ مەبەست بوون، بنیات نرابن:

وەك خوای کاربەجێ لەبارەی حیکمەت‌و ئامانجی دروستکرانی جندو مرۆڤەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴾ (الذاريات: ٥٦)، واتە: جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروست کردوون، کە بمپەرستن.

بەڵگەش لەڕووی عەقڵییەوە لەسەر ئەوە،کەجموجۆڵ‌و چالاکییەکانی مرۆڤ سەرجەم بە خواپەرستیی دادەنرێن ، ئەگەربێت‌و لە بازنەی شەریعەت دەرنەچن‌و تەنیا خوای پێ مەبەست بن، وێڕای چەندان دەقی قورئان‌و سوننەت، ئەوەیە کە: مادام خوا ﷻ مرۆڤی بەس بۆ پەرستنی خۆی هێناوەتەدی، کەواتە: هەرکەسێك بیەوێ حیکمەت‌و ئامانجی دروستبوونی خۆی بە تەواویی بێنێتەدی، دەبێ هەمیشەو بەردەوام سەرگەرمی خواپەرستیی (عبادة الله) بێت، دیارە ئەمەش مەیسەر نابێ، مەگەر چەمك‌و واتای خواپەرستیی هێندە گشتگیرو فراوان بێ، کە سەرجەم جموجۆڵ‌و چالاکییەکانی مرۆڤ بە پەنهان‌و ڕواڵەتیی‌و تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و ماددیی‌و مەعنەوییەوە بگرێتەوە.

کەواتە: ئەو پەرستن (عبادة)ەی لە ئایەتی ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ دا باسکراوە، هەر ئەو کردەوە چاکە (العمل الحسن)یە، کە لە ئایەتی: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴾دا هاتوە.

**٧- ژیـان وگـوزەرانی دونیـا وەسـیلەی وەدەسـتهێنانی ژیـانی هەتاهـەتایی بەهەشت و ڕەزامەندیی خوایە لە بەهەشت دا:**

وەك خوا ﷻ لەسەر زمانی گەلی (قارووون) لەکاتی ئامۆژگارییکردنیدا، فەرموویەتی:

﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا .. ﴾ (القصص:٧٧)، واتە: مەنزڵگای دواڕۆژ بەوە وەدەست بێنە، کە خوا پێیداوی‌و، بەشی خۆشت لە (پێداویستییەکانی) ژیانی دنیا لەبیر مەکە!

هەروەها خوا لە مەدح‌و پێناسەی ئەوانەدا، کە لە خزمەت پێغەمبەرەکەی (محمد) ﷺ دان، کە وێڕای هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی سەرجەم شوێنکەوتوانی ڕاستەقینەشی دەگرێتەوە، فەرموویەتی: ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا .. ﴾ (الفتح:

٢٩)، واتــە: بەخشــش‌و ڕەزامەنــدیی پــەروەردگاریان داوا دەكــەن‌و هــەوڵی وەدەستهێنـ نیـ ن دەدەن.

بەڵێ، لە ئیسلامدا ژیانی دنیا مەنزڵگای كۆتاییی‌و ئامانجی هەرەبەرز نیە، بەڵكو دنیـ كێڵگەی دوارِۆژەو ئامرازو هۆكاری وەدەستهێنانی بەختــەوەریی‌و سەرفرازیی ڕاستەقینەیە، كە بریتیە لە گەیشتن بە ڕەزامەندیی خواو نیشتەجێ بوون لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبراوەكانی خوای بەخشەرو بەبەزەییدا.

لێرەشدا كۆتایی بەم باسەمان دێنین، خوایاربێ لە باسی داهاتووماندا تیشك دەخەینەسەر هەڵوێستی ئیسلام لەمــەڕ ئــابووریی‌و لایــەنی مــاددیی ژیــان‌و گوزەران.

## هێڵە گشتییەكانی هەڵوێستی ئیسلام لەبارەی ئابوورییەوە

خوێنەری بەڕێز!

لەباسی پێشووماندا وێڕای خستنەڕووی دیدو بۆچوون‌و هەڵوێستی سیكۆلاریزم لەمەڕ ژیان‌و گوزەران‌و ئابووریی، تیشكمان خستە سەر تێڕوانینی ئیسلام لەبارەی ژیان‌و گوزەرانەوە، خوا یاربێ لەم باسەشدا، هەڵوێستی ئیسلام لەمەڕ ئابووریی‌و لایەنی ماددیی ژیان دەخەینە ڕوو، بــەڵام بێگومــان زۆر بــەكورتی‌و گوشــراویی، ئەویش بەخســتنە ڕووی كۆمــەڵێك بنــەماو هێڵــی گشــتیی، كــە بــەرای بەنــدە چوارچێوەی فراوانی سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی پێك دێنن:

### ١- خوا ﷻ بەس خۆی خاوەنی ڕاستەقینەی هەمووشتێكە:

ئــەم ڕاســتییە وەك خــۆر لــەكاتی نیــوەڕۆدا لەئایەتــەكانی قورئانــدا دەدرەوشێتەوە، بۆ نموونە:

* ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ... ﴾ (آل عمران: ٢٦).

واتە: بڵێ ئەی خوایە! خاوەنی موڵك، هەركەسێك بتەوێ موڵكی دەدەیەو، هەر كەسێكیش بتەوێ، موڵكی لەدەست دەردێنی!

* ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ... ﴾ (الرعد: ١٦).

واتە: بڵێ: كێ خاوەنو پەروەردگاری ئاسمانەكانو زەوییە؟ بڵێ خوا..

دیارە زانینو بڕوا پێبوونی ئەم ڕاستییەش، كاریگەرییەكی گەورەی هەیە لەئاراستە كردنی سیستەمی ئابوورییداو، لەبیركردنەوەی مسوڵمانان لەبواری ژیانو گوزەرانی ماددییاندا، كە هیچ كات پێیان وانەبێ خۆیان خاوەنی ڕاستەقینەو سەربەخۆی داراییو سامانەكانیانن‌و ئازادن لەچۆنیەتی هەڵسوكەوت تێداكردنیاندا، وەك گەلی (مَدْیَن) بە پێغەمبەرەكەی خۆیان (شعیب) ؈یان گوت: ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْ؟!.. ﴾ (هود: ٨٧).

واتە: گوتیان: ئەی شوعەیب! ئایا نوێژەكەت فەرمانت پێدەكات،كە ئەوە واز لێبێنین، كە بابو باپیرانمان دەیانپەرست، یان بەو جۆرەی، كە كەیفمان لێیەتی هەڵسو كەوت لەماڵو سامانەكانماندا بكەین؟!

بەڵێ، ئیمان بە خوا ﷻو خوا بەپەروەردگارو خاوەنو هەمەكارەی بوونەوەر زانین، بەردی بناغەی سیستەمی ئابوورییە لەئیسلامداو بێگومانیش كەسانێك بڕوایان وابێ، كە خوا لەسەر زەوی كردوونیە جێنشینی خۆیو، ئەو ماڵو سامانەی پێیداون، سپاردە (أمانة)یە، كە بەشێوەیەكی كاتیی خستوویەتە ژێر ڕكێفیان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ.. ﴾ (الحدید: ٧)، واتە: بڕوا بەخواو پێغەمبەرەكەی بێنن‌و لەوەدا، كە كردوونی بەجێنشین، ببەخشن...

کەسانێکی ئاوا، هەڵس و کەوتیان لەبواری ئابووریی‌دا زۆر جیاواز دەبێ لەهی کەسانێك، کە پێیان وایە خۆیان خاوەنی ڕەهاو سەربەخۆی ماڵ و سامانەکانیانن!

٢- خوا نازو نیعمەتەکانی سەر زەوی و نێو بوونەوەری بۆ هەموو مرۆڤەکان وەك یەك دروست کردوون و، هیچ کەس و لایەك لەو ڕووەوە ئیمتیاز و پلەی بەسەر کەس دانیە:

ئەم ڕاستییەش چەندان ئایەتی قورئان داکۆکییان لەسەر کردوە، بۆ نموونە:
* ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴾ (الرحمن: ١٠)، واتە: وەزەوی بۆ خەڵکیداناوە.
* ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا... ﴾ (البقرة: ٢٩)، واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە ئەوەی لەزەویدایە بۆ هەموانتانی دروستکردوە...[1]
بەڵێ، هیچ کەس لە هیچ کەس بەشی زیاتری بە نیعمەتەکانی خواوە نیە، مەگەر کەسێك زیاتر خۆی ماندوو بکات کۆششی پتر بکات، ئەو کاتە هەرکەسە بەگوێرەی ڕەنج و کۆششی خۆی بەخششی پێ دەبڕێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ (النجم: ٣٩)، واتە: مرۆڤ هیچی دەستگیر نابێ، مەگەر ئەوەی هەوڵی بۆ بدات.

٣- ئەو شتانەی خەڵك بەگشتیی پێویستی پێیانە نابێ بکرێنە موڵکی تایبەت:

پێغەمەری خوا ﷺ چوار شتی، کە لەڕۆژگاری ئەودا خەڵکی بەگشتیی بۆیان ئاتاج بوون، دیاری کردوە، کە خەڵکی بەگشتیی و وەك یەك تێیاندا هاوبەشن و، نابێ بکرێنە موڵکی تایبەت، کە بریتین لە:

---

(١) ئەم ڕستە قورئانییە مانایەکی دیکەشی هەیە، بەمجۆرە: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لە زەویدایە بۆی دروست کردوون.

لەوەڕگاو ئاوو ئاگرو خوێ (الكلأ والماء والنار والملح) وەك فەرموویەتی: {المسلمون شركاء في ثلاثـة: في الكـلأ والمـاء والنـار} (رواه أبـو داود)، واتـە: مسوڵمانان لە سێ شتاندا هاوبەشن: لە لەوەڕگاو ئاوو ئاگردا.

(أبو داود) گێراویەتەوە، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، گوتویەتی: {یا نبـيَّ الله ما الشيء الـذي لايحـلُّ مَنْعُـهُ؟ فقـال: المـاء. قـال: يانبـيَّ الله ماالشيء الذي لايحلُّ مَنْعُهُ؟ قال: المِلْحُ}، واتە: ئەی پێغەمبـەری خوا ئەو شتە چییە، کە ڕەوا نیە قەدەغە بکرێ؟ فەرمووی: ئاوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شتە چییە، کە ڕەوا نیـە قەدەغـە بکـرێ؟ فـەرمووی: خوێیە.

هیچ گومانیشی تێدا نیە، کە هۆی دیاریکرانی ئەم چوار شـتـە لەلایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ هـەر ئـەوە بـووە، کـە لـەو ڕۆژگـارەداو لـەو ژینگـەو کۆمەڵگایەدا خەڵکی بەگشتیی، بۆ ئەو چوار شتە ئاتاج بوونەو، لە ڕۆژگاری ئێستاشدا هەر شتێك وەك ئەم چوارە بووبێتە پێداویستی گشتیی، بۆ وێنـە: کارەباو نەوتو غاز... ئەوە هەمان حوکمی ئەو چوار شتەی هەیەو، ڕەوا نیە بکرێنە موڵکی تایبەتو، پێویستە هەر بەحاڵەتی موڵکی گشتیی بمێننەوەو، هیـ کەس دەستیان بەسەردا نەکرێو، بـە زاراوەی ئـەمڕۆ نەکرێنـە کـەرتی تایبەت!

شایانی باسیشە،کەشەرعزانان (الفقهاء) وردەکارییەکانی ئەم بابەتـەیان بەڕوونیی باس کردوە بۆ نموونە: بڕوانە: (المغني)ی (ابن قدامة)[1].

## ٤- پاریزگاریی لیکردنی سەرچاوەکانی ئابووریی:

خوای کار بەجێ لەچەندان ئایەتدا ڕایگەیاندوە،کـە خراپـەکاریی کـردن (إفسـاد) لـە زەویـدا تاوانـەو زۆر بەتونـدی سەرزەنشـتی خراپـەکاران

---

(١) ج٨ ص١٥٥،١٥٦.

(مفسدین)ی کردوه، بۆ نموونه فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ١٥١ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ﴾ (الشعراء: ١٥١-١٥٢).

واتە: بەقسەی زێدە ڕۆیی کەران مەکەن، ئەوانەی هەر سەرگەرمی خراپەکاریین لە زەویداو چاکسازیی ناکەن. پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەندان فەرموودەیدا قەدەغەی کردوە، کە بێهوودە سامانو سەرچاوە سروشتییەکان بەکار بهێنرێنو بە فیڕۆ بدرێن، جا دیارە فەرموودەکان باسی هەندێك شت دەکەن، کە لەو ڕۆژگارەداو لەو کۆمەڵگایەدا بوو ون، بۆ نموونە:

أ- لە بارەی کەڵك لێوەرگرتنی زەوی بەکار نەهێنراو، کە (إحیاء الموات)ی پێی دەگوترێ، فەرموویەتی: {مَنْ أحيا أرضاً ميتةً فهي لـه...} (رواه أحمد وأبو داود والترمذي عن سعيد بن زيد).

واتە: هەرکەسێك زەوییەکی مردوو زیندوو بکاتەوە، هی خۆیەتی.

ب- لەبارەی بێهوودە نەبڕینی درەختی سەوز، فەرموویەتی: {مَنْ قطع سِدْرَةً صَوَّبَ الله رَأْسه في النار} (رواه ابوداود عن عبدالله بن حَبشي).

واتە: هەرکەسێك بڕکە سیدرێك ببڕێ، خوا سەرەو خوار دەیخاتە ئاگرەوە!

ج- لەبارەی پاراستنی ئاژەڵ لەدەردو نەخۆشی فەرموویەتی: {لايُوردَنَّ مُمْرِضٌ على مُصِحٍّ} (متفق عليه عن أبي هريرة)، واتە: با ئاژەڵی نەخۆش تێکەڵی هی ساغ نەکرێ لەکاتی ئاودانا.

د- لەبارەی خەسارنەکردنو بەفیڕۆ نەدانی خۆراکەوە، فەرموویەتی:

{اذا سقطت لقمة أحدكم فلْيأخذْها ولْيُمِطْ عنها الأذى وليأكُلْها ولايَدعْها للشيطان} (رواه مسلم عن أنس)، واتە: هەرکات یەکێکتان پاروویەکی لێکەوتە خوارێ، با هەڵی گرێتەوەو پاکی بکاتەوە بیخواتو بۆ شەیطان لێی نەگەڕێ. بەڵێ، ئیسلام قەدەغەی کردوە، تەنانەت پاروویەکی لە دەست،کەوتووە

خواریش، زایە ببێ، چ جای ئەو هەموو خۆراکەی، کە لەم ڕۆژگارەدا خەسار دەبێ‌و دەکرێتە (زبڵ)!

**٥- گرنگیپێدان بەکار و کاسبیی وسەرزەنشت کردنی سواڵ و چاو لەدەستی خەڵك بوون:**

بۆنموومە: خوای پەروەردگار بـۆ هانـدانی خـەڵك لەسـەر ئـیش‌و کـارو کەسابەت فەرموویـەتی: * ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ﴾ (الملك: ١٥)، واتە: خوا ئەو کەسەیە کـە زەوی بـۆ دەستەمۆ کردوون، دەجا بە شیوو قەدپاڵەکانیدا بڕۆن‌و، لە بژێوی خوا بخۆن‌و بۆلای ویش دەچنەوە.

* ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ...﴾ (الجمعـة:١٠)، واتە: جا هەرکات نوێژی -جومعە- تەواو بـوو، بەزەویـدا بلاّوبنەوەو لە بەخششی خوا داوا بکەن...

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی:

* {لأَنْ يأخذ أحدكم أحْبُلَهُ ثم يأتي الجبل فيـأتي بِحُزمَـةٍ مِـنْ حَطَـبٍ علـى ظَهْره فَيَبِيعَها فيكفّ الله بها وجهه، خيرٌ له مِنْ أن يسأل الناس أعطوه أو منَعُوهُ} (رواه البخاري عن الزبير)، واتە: ئەگەریەکێکتان پەتـەکانی خـۆی هەڵگرێ‌و بچێ لە چیا کۆڵە دارێك بێنـێ‌و بیفرۆشـێ‌و خـوا ڕووی پـێ بپارێزێ، چاکترە لەوەی، کە داوا لەخەڵك بکات دەیدەنێ، یان نایدەنێ.

* {لاتزال المسألة بأحدكم حتى يلْقى الله تعالى ولَيْسَ في وجهه مُزْعَةُ لَحْمٍ} (متفق عليه عن ابن عمر)، واتە: یەکێکتان لە سـەر سـواڵکردن بـەردەوام دەبێ، هەتا کاتێك، کە دەگاتە خوای بەرز، پارچە گۆشـتێك بەڕوویـەوە نەماوە.

* {ان الله تعالى يحبُّ المؤمن المحترف} (رواه الحكيم الترمذي والبيهقي والطبراني عن ابن عمر).

واتە: بێگومان خوای بەرز، بڕواداری خاوەن پیشەی خۆش دەوێ.

٦- کارامەیی و دەست ڕەنگینیی لە کارو پیشەدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی:

* {إن الله كتب الإحسان على كل شيء...} (رواه مسلم عن شداد بن أوس)، واتە: بێگومان خوا پێویستی کردوە، کە هەموو شتێك بەچاکیی‌و ڕێکیی ئەنجام بدرێ.

* {إن الله يحبُّ اذا عمل أحدكم عملاً أن يُتْقِنَهُ} (رواه البيهقي عن عائشة، وحسَّنه في ((صحيح الجامع الصغير))، واتە: خوا حەزدەکات، ئەگەریەکێکتان کارێکی کرد بە کارامەیی بیکات.

* {إن الله يحب من العامل اذا عَمِل أن يُحْسِنَ} (رواه البيهقي عن كليب، وحسَّنه في ((صحيح الجامع الصغير))، واتە: خوا پێی خۆشە هەرکامێکتان کارێکی کرد بەچاکیی بیکات.

٧- دەوڵەمەندیی و ماڵ و سامانی حەلاڵ نیعمەتەو، هەژاریی و نەداریی بەلایەو لە کوفرەوە نیزیکە:

خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا ماڵ‌و سامانی بە وشەی چاکە (خَيْر)و بەخشش (فَضْل) ناوبردوە، بۆ نموونە: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ... ﴾ (البقرة: ٢١٥)، واتە: لێت دەپرسن: چی ببەخشن؟ بڵێ: هەر چاکەیەکتان بەخشی، با بۆ باب‌و دایك‌و خزمان‌و هەتیوان‌و هەژاران‌و ڕێبوار بێ... خوا لەبارەی ماڵ‌و سامان‌و دەوڵەمەندییەوە، وەك نیعمەتێکی خۆی، کە بە پێغەمبەری بەخشیوە، فەرموویەتی:

* ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾ (الضحى: ٨)، واتە: خوا تۆی بە نەداریی بینی، بەلاّم دەوڵەمەندو بێ نیازی کردی.

پێغەمبەرى خواش يەكێك لە دوعايەكانى ئەوە بوو كە خوا بێ نيازى بكات:

* {اللهم إني أسألك الهُدى والتقى والعفاف والغِنـى} (رواه مسـلم والترمـذي وابن ماجه عن ابن مسعود)، واتە: ئەى خوايە! من ڕێنمايىو پارێزكاريىو پاكيىو بێ نيازييت لێدەكەم.

* هەروەها بە (سعد بن أبي وقاص)ى فەرمووە:

{إنكَ أنْ تذر ورثتك أغنياء خَيْرٌ مـن أن تذرهم عـالة يتكففـون النـاس} (متفق عليه عن سعد)، واتە: بێگومـان تۆ ،ئەگەرخزمەكانت بە دەوڵەمەنـديى بەجێ بهێڵى، باشترە لەوەى، كە بەنـەداريى جێيـان بهێڵـىو دەسـت لەبـەر خەڵكى پان بكەنەوە!

* هەروەها بە (عـمرو بن العـاص)ى فەرمووە: {يـاعمرو نعِـمّ المـال الصـالح للمرءِ الصالح} (رواه أحمد عن عمرو بن العاص وصحّحه ابن حِبّان والحاكم علـى شرط مسلم وصحّحه الذهبـي)، واتـە: ئەى عـەمر: باشترين شت مـاڵى چاكە بۆ مرۆڤـــى باش.

* پێغەمبەرى خوا ﷺ پەناى بـە خـوا گرتـوە لـە هـەژاريىو لـە گـەڵ كوفريشدا جووتى كردوە: {أللهم اني أعوذ بك مـن الفَقْـر والكفـر} (رواه الحاكم والبيهقي عن أنسٍ).

واتە: ئەى خوايە لە هەژاريىو كوفر پەنات پێ دێنم!

**٨- زێدە ڕۆيى نەكردن و خۆشگوزەرانيى نەكردنە پيشە:**

خـــواى كاربـــەجێ لـــەبارەى قەدەغـــەكردنى زێـــدەڕۆيى (إسـراف)ەوە فەرمووويەتى: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ (الأعـراف:٣١)، واتە: بخۆنو بخۆنەوە، بەلاّم زێدە ڕۆيى مەكەن، بێگومان خوا زێدەڕۆيى كەرانى خۆشناوێن.

لەوبارەوە، كە خوا حەز لە چارەى ئەوانـە ناكات،كـە خۆشـگوزەرانيى (إتراف) دەكەنە پيشە - كە مەگەر چۆن، دەنا خۆشگوزەرانيى لە ڕادەبەدەرو

بەردەوام لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت و بەشخوراوە- ئایەتی قورئان زۆرن و هەرکەسێك سەرنجی ئەو ئایەتانە بدات،کە لەو بارەوە هاتوون دەزانێ کە خۆشگوزەرانیی و هەمیشە لە نازو نیعمەت و ڕابواردندابوون، پیشەی طاغووتە ستەمکارە چەوسێنەرەوەکان و دەستەودایەرەو وابەستەو دابەستەکانی دەورو بەریانە، بۆ نموونە:

* ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ (سبأ: ٣٤).

واتە: لەهیچ ئاوەدانییەکدا ترسێنەرێکمان ڕەوانە نەکردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە بەرامبەر بەوەی پێی نێرراون بێ بڕواین.

* ﴿...وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴾ (هود: ١١٦)

واتە: ئەوانەی ستەمیان دەکرد، سەرگەرمی ئەوە بوون، کە تێیدا خۆشگوزەران کرابوون و تاوانباریش بوون.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: {شِرارُ أُمَّتي الذين غُذُّوا بالنَّعيم الذين يأكلون ألوان الطّعام وَيلْبسون ألوان الثياب ويتشدَّقون في الكلام} (رواه الطبراني والبيهقي وابن أبي الدنيا وحسَّنه الألباني في (صحيح الجامع الصغير وزيادته)).

واتە: خراپترینی ئوممەتم ئەوانەن، کە بە خۆشگوزەرانییەوە ڕاهاتوون، ئەوانەی خواردنی جۆراو جۆر دەخۆن و، پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگ دەپۆشن و، بە فیزو کەشخەوە دەدوێن.

**٩- ئیسلام هاوکات لە گەڵ ئەوەدا کە دان بە موڵکایەتی تاك دادێنی، بەهۆی دانانی چەند بەندو مەرج [قيد وشرط]ێکەوە نینۆکی دەکات و ناهێڵێ زیان بە بەرژەوەندیی گشتیی بگەیەنێ:**

ئەمیش هێڵێکی دیکەی گشتیی گرنگی سیستەمی ئابوورییە لە ئیسلامداو، لەم ڕووەوە ئیسلام حاڵەتێکی میانجی (وسط)ی لە نێوان

سیستەمی سـەرمایەداریی‌و هاوبەشـێتی (الراسمالیـة والأشـتركیة)دا هەیـە، چونکە لە لایەکەوە بە پێچەوانەی سۆسیالیزمەوە شت هەبوون (تملُّك)ی بـۆ تاکەکان بەڕەوا داناوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٢٧٩)، واتە: با سـەرمایەکانتان هی خۆتان بن، نە ستەم بکەن‌و نەستەمیشتان لێ بکرێ.

بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە، کۆمـەڵێك بەنـدو مـەرجی خسـتۆتە سـەر موڵکایەتی تاك (الملكیة الفردیة)و چەندان بەربەستی وای لە بەردەمدا داناون، کـە ڕێگریـی ئـەوەی لێدەکـەن -وەك لەسـایەی سیسـتەمی کاپیتـالیزم‌و لیبرالیزمدا دەبینرێ- خاوەن ماڵ‌و سامانەکان بۆ کۆمەڵگا ببنە دێوەزمـەو بەربنە خوێن مژینیی!

بەڵێ، ئیسلام بە قەدەغەکردنی ڕیباو ئیحتیکارو بازرگانیکردن بەشـتی حەڕام‌و نەهێشتنی کردنە موڵکی تایبەتی پێداویستییە گشـتییەکان‌و..هتد لەلایەکەوەو، دانانی: میرات بۆ پرژو بڵاوکردنەوەی سەرمایەکان‌و، پێویسـت کردنی زەکات‌و، هاوکاریی توێژە ئاتاجەکان‌و ...هتد.

لەلایەکی دیکـەوە، بەربەسـتێکی مەحکـەمی لەبـەردەم دەوڵەمەنـدو ساماندارەکاندا داناوە، کە نەهێڵێ ببنە ملۆزمی کۆمەڵگاو مایەی ڕۆژ بـۆ ڕۆژ نەدارتربوونی چینە کەمدەستەکان‌و، سەرەنجام ئەو ئامانجە لە کۆمەڵگای ئیسـلامییدا دێتـە دی، کـە ئـەم ڕسـتە قورئانییـە بـەڕوون‌و ڕاشـکاویی ڕایدەگەیەنێ، کە بریتیە لە: (پەزمەنـدە نـەبوونی مـاڵ‌و سـامان‌و کەڵەکـە نەبوونی لەدەستی دەوڵەمەندەکاندا) وەك خوا فەرموویـەتی: ﴿...كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ...﴾ (الحشر: ٧).

ئێستاش با ئاماژەیەك بە چەند دەقێکـی قورئـان‌و سـوننەت بکـەین لەسـەر قەدەغـە بوونی هەرکام لە: (ڕیبا)و (ئیحتیکار)و (بازرگانی کردن بە شتی حەڕام)و

پێشتریش باسی مەسەلەی: (نەهێشتنی کردنە مولکی تایبەتی پێداویستییە گشتییەکان)مان کرد:

أ- لەبارەی سوود خۆرییەوە خوا فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ... ﴾ (البقرة: ٢٧٨،٢٧٩).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەربڕوادارن واز لەو ڕیبایە بێنن کە (لەسەر قەرزدارەکان)ماوە،ئەگەر وانەکەن، ئەوە ئاگاداربن بە جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا..

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی (ئیحتیکار)ەوە فەرموویەتی:

{من احتكر فهو خاطيء} (رواه مسلم وأبو داود والترمذي وصحّحه وابن ماجه)، واتە: هەرکەسێك ئیحتیکار بکات گوناهبارە.

(إحتكار)یش بریتیە لە پاشکەوت کردنو هەڵگرتنی کەلو پەلو نەهێنانی بۆ بازاڕ، تاکو نرخی بەرزبێتەوەو بەگران بفرۆشرێ، ڕای ڕاستو بەڵگەدار ئەوەیە،کەئیحتیکار تەنیا بژێو (قوت) ناگرێتەوە، وەك هەندێك لە زانایان گوتوویانە، بەڵکو هەر شتێك، کە خەڵکی پەکیان لەسەری بکەوێو بۆی ئاتاج بن، دەیگرێتەوە.

ج- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی قەدەغە بوونی بازرگانیکردن بە شتی پیسو زیانبەخشەوە، فەرموویەتی:

{إن الله تعالى حرَّم بيع الخمر والميتة والخنزير والأصنام} (متفق عليه عن جابر).

واتە: بێگومان خوای بەرز فرۆشتنی شەڕابو مردارو بەرازو بتانی حەرام کردوە، بەمجۆرە سیستەمی ئابووریی ئیسلام لایەنە چاکەکانی هەرکام لە کاپیتالیزمو سۆسیالیزمی لەخۆدا کۆ کردۆتەوەو، لە کەمو کووڕیی و عەیبەکانیشیان سەلامەتو پارێزراوە.

### ١٠- مشوورخۆریی کۆمەڵایەتی (التكافل الإجتماعي):

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گرنگی سیستەمی ئابوورییە لە ئیسلامداو، مەبەستیش لە مشوورخۆریی کۆمەلآیەتیی، ئەوەیە،کە کۆمەڵگاو دەوڵـەتی ئیسلامیی لە هـەموو ئاستـەکاندا، لـە خـەمی چینو توێـژە کەمدەسـتو ئاتاجەکانی وەك:

هەژارو نەدارو هەتیوو قـەرزدارو میـوانو ڕێبـوارو سـواڵکەرو...هتددا دەبێو تێیانەوە ڕانامێنێو بەتەنیا جێیان ناهێڵێ! ئەمـەش چـەند دەقێکـی قورئانو سوننەت لەو بارەوە:

* ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ﴾ (الماعون).

واتە: ئایا ئەو کەسەت بینیوە، کە سزاو پاداشت بە درۆ دەزانـێ؟ ئـەوە کەسێکە، کە بەتوندی پاڵە ستۆی هەتیوان دەدات. لەسەر خواردن دان بەنەدار خەڵکی هان نادات. دەجا سزای سەخت بۆ نوێژ کەرانێك، کە لەنوێژەکـەیان بێئاگان. ئەوانەی ڕووپامایی دەکەن و، هاوکاریی لە خەڵکی دەگرنەوە.

* ﴿إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾ (الحاقة:٣٣،٣٤).

واتە: ئەو(کافر)ە بڕوای بەخوای مەزن نەبوو و هانی خەڵکی نـەدەدا بـۆ خواردن دان بەنەدار.

* ﴿...يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ﴾ (المدثر: ٤٠-٤٤).

واتە: لە تاوانباران دەپرسن: چی ئێوەی خستە سەقەرەوە؟ گوتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین، خواردنیشمان بە نەدار نەدەدا.

* ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ﴾ (الذاريات: ١٥-١٩).

واتە: بێگومان پارێزکاران لەنێو باغو سەرچاواندان. ئەوەی،کە پەروەردگاریان پێیداون وەریان گرتوە. چونکە لەمەو بەر چاکەکار بوون. شەوێ کەمێك نەبێ نەدەخەوتن. پێش بەرەبەیان داوای لێبوردنیان (لە خوا) دەکرد.لەماڵو سامانیاندا سواڵکەرو بێبەش، خاوەن پشك بوون.

کەواتە: بە تەنگ هەژارو نەدارو هەتیوو لێقەوماوانەوە نەبوونو مشوور لێنەخواردنیان، بەڵگەو نیشانەی بێ بڕواییو دوور لە خواییەو، بابای دڵڕەقو بێ بەزەییو بێ هەستو نەستو بێ هەڵوێست بەرامبەر بە توێژە کەمدەستو نائاجەکانی کۆمەڵگا، ،ئەگەر گریمان بەرواڵەت نوێژو خوا پەرستییەکیشی هەبێ، ئەوە هەر شتێکی ڕواڵەتییو بۆشەو زیاتر بەهاندەری ڕووپامایی ئەنجامی دەدات.

پارێزکارانی خواپەرست، وێڕای شەو نوێژو خوا پەرستیی، ماڵبەخشینو چاکەکارییو خەڵك دۆستییشیان هەیە، ئنجا با بەخێرایی چاوێکیش بە سەرچاوەکانی بە تەنگ یەکدییەوە بوونی کۆمەڵایەتیی (التضامن الإجتماعي)دا بخشێنین:

## أ- زەکات:

کە خوا ﷻ لە بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا...﴾ (التوبة: ١٠٣).

واتە: لە ماڵو سامانەکانیان (لە هی دەوڵەمەندان) زەکاتێك وەربگرەو بەهۆیەوە پاکیان بکەوەو تەزکیەیان بکە..

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {تؤخذ من أغنيائهم فتردّ على فقرائهم} (رواه البخاري).

واتە: لە دەوڵەمەندەكانیان وەردەگیرێو دەگێڕرێتەوە بۆ هەژارەكانیان.

لەم ئایەتو فەرموودەیەشەوە، بە ڕوونو ڕاشكاویی دیارە (زەكات) هەقێكی شەرعیی توێژە ئاتاجەكانی كۆمەڵگایەو، ئەركی سەرشانی دەستەلاَتی شەرعییە، كە لە خەڵكی خۆی وەری بگرێو بیشی گەیەنێ بەخاوەنەكانی، ڕێژەی وەرگیرانی زەكاتیش بەگشتیی بەم شێوەیە:

أ- ماڵی نەغدینەو بازرگانی: (٥٪).

ب- ئاژەڵ (وشترو ڕەشە ولاَخو مەڕو بزن) كە ڕێژەكەی لە ڕێژەی ماڵی بازرگانیو پارەی نەغدینەوە نێزیكە.

ج- بەروبوومی كشتو كاڵ: (٥٪) ،ئەگەربە ئامێر ئاودرابێو (١٠٪) ئەگەر بەبێ ئامێر ئاودرابێ.

د- خەزنەو كانزاییەكان پێنج یەك (٢٠٪).

## ب- خێركردنو بەخشینی خۆ بەخشانە (صدقة التطوع):

كە لە زۆر ئایەتی قورئاندا باسیكراوە، بۆ نموونە: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٦١).

واتە: وێنەی ئەوانەی سامانەكانیان لەڕێی خوادا دەبەخشن، وەك وێنەی دەنكێكە، كە حەوت گوڵاَن دەڕوێنێ، هەر گوڵە، سەد دەنكی تێدایە، خوا بۆ هەركەسێك بیەوێ، پاداشت چەند قات دەكاتەوە،خوا فراوانی زانایە.

### ج- وەقف کردن:

ئیسلام زۆر هانی مسوڵمانانیداوە، کە خێرو چاکەی وابکەن، پاش مەرگیشیان هەر بەردەوام بێت، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {اذا مات الإنسان انقطع عمله إلاّ من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له} (رواه مسلم عن أبي هريرة).

واتە: مرۆڤ ،کە مرد، مەگەر لە سێ ڕێیانەوە، ئەگەرنا، کردەوەی چاکی دەبڕێ: خێرێکی بەردەوام، یان زانیارییەکی بەهرە لێوەرگیراو، یان منداڵێکی چاك کە بۆی دەپاڕێتەوە. دیارە ئەمەش وای کردوە، کە مسوڵمانان لە بواری وەقف کردنی زەوی‌و زارو باغ‌و خانووو کتێبخانەو...هتددا، ژمارەی پێوانەیی لەنێو گەلاندا بشکێنن.

### د- هەرکات مسوڵمانان پێویستیان بوو و زەکاتیش بەشی نەکرد، پێویستە دەوڵەمەندان ماڵ‌و سامانەکانیان خەرج بکەن:

ئەمیش مەسەلەیەکە هەموو زانایانی ئیسلام لەسەری یەکدەنگن، وەك (قرطبي) گوتوویەتی: ((واتفق العلماء على أنه اذا نزلت بالمسلمين حاجة - بعد أداء الزكاة- يجب صرف المال اليها))[1].

### ١١- ڕۆڵی دەسەڵاتی سیاسیی لە بواری ئابووریيدا بریتیە لە چاودێریی کردنی کۆمەڵگاو پشتگیریی کردنی توێژە ئاتاجەکان و ڕێگرتن لە ستەم و سەرکێشی سامانداران:

بەڵێ، خوێنەری بەڕێز! هەرچەندە سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی لەبەر ڕەچاو کردنی فیطرەت‌و سروشتی مرۆڤ، خەڵکی ئازاد کردوە لەسنووری

(١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) ج٢ ص٢٣٣.

فراوانی شەریعەتدا، کە بەکەیفی خۆیانو سەربەستانە کـارو کاسـبی حـەڵاڵ بکـەنو، ئەوەنـدەی دەتـوانن پارەوسـامان پەیـدا بکـەن، بـەڵام لەلایـەکی دیکەشەوە ئیسلام لە بواری ئابووریی‌و ژیانی ماددیی کۆمـەڵگادا، دەسـتە پاچە نیەو دەسـتەو ئـەژنۆ دانانیشـێ‌و، وەك کۆمـەڵگا سـەرمایەدارییەکان لێبگەڕێ، بەپێی یاسای (داروێن) ((مانەوە بۆ بەهێزترە)) توێژە کەمدەست‌و ئاتاجەکان لەبەر پێی سامانداره‌کان بپلیشێنەوەو یاسای دەریا (ماسی گەورە هی گچکە قوت دەدات) حاکم بێت! بە سەرنجدانی ئەم چەند دەقـەش، ئـەو ڕاستییەی گوتمان وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە:

* ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ...﴾ (الحج: ٤١).

واتە: ئەوانەی کاتێك لە زەویدا دەستەڵاتمان دانێ ، نوێژ بەرپا دەکەن‌و، زەکات دەدەن‌و، فەرمان بەچاکە دەکەن‌و، ڕێگریی لە خراپە دەکەن.

کەواتە: دەستەڵاتی سیاسیی لە ئیسلامدا لەسەری پێویستە سەرپەرشتی نوێژ بەرپاکردن‌و زەکات دان بکات، هـەوڵی چەسـپاندنی هەرچـی چـاکەیەو ڕیشە کێشکردنی هەرچی خراپەیە بدات، کە بێگومـان پـاش ئیمـان‌و خـوا بەیەکگرتن، دادگەریی (عَدْل) گەورەترین چاکەیەو، پاش کـوفرو شـیرکیش، ستەم‌و قرپیی‌و پرپیی گەورەترین خراپەیە!

* ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ...﴾ (البقـرة: ٢٧٨،٢٧٩)،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لەخوا بکەن‌و ئـەو سـوودەی مـاوە دەستی لێهەڵگرن،ئەگەربڕوادارن ،ئەگەر وانەکەن، ئەوە ئاگاداربن بە جـەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا...

کەواتە: وەك چۆن دەوڵەتی ئیسـلامیی بە ئەرکی خۆی دەزانێ، کە زەکات لە سامانداره‌کان وەربگرێ‌و بەسـەر ئاتاجەکانیدادابەش بکـات، هەربۆیـەش

(أبوبكر الصديق) یەكەمین خەلیفەی پێغەمبەری خوا (خـوا لێـی ڕازی بـێ) ئیعلانی جەنگی لە دژی زەكات نەدەران (مانعي الزكاة) كردو گـوتی: {والله لو منعوني عِقالاً كانوا يؤدّونه لرسول الله ﷺ لقاتلتهم عليه} (رواه البخاري ومسلم)، واتە: بەخوا ،ئەگەرتەنانەت پەتێكم نەدەنێ، كە كاتی خۆی داویانە بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەوە لە گەڵیان دەجەنگم! بەهەمان شێوەش ڕێگرتن لە سوود خۆریی (ربا)ش، كە بێڕەزاترین جۆری سـتەمو خوێنمـژینی ساماندارانە بۆ هەژارو نەداران، هەر ئەركی سەرشانیەتی.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {أنا أولى بكلِّ مؤمنٍ من نَفْسـه، مَـنْ ترك مالاً فَلِوَرثته، ومَنْ تَرَك دَيْناً أو ضَياعاً فإليَّ وعليَّ} (متفق عليه عن أبي هريرة). واتە: من بۆ هەر بڕوادارێك لە خۆی لەپێشترم، هەركەسێك سامانێكی بەجێهێشت - پاش مەرگی- ئـەوە بـۆ میراتگرانیـەتی، بـەڵام هەركەسـێك قەرزێك، یان منداڵی وردی بەجێهێشتن، ئەوە بابێتە لای منو لەسەر منە.

* {عن أبي سعيد الخدري قال: بينما نحن في سفر اذْ جاءَ رجلٌ على راحلـةٍ لـه فجعل يَصْرِفُ بَصَرَهُ يميناً وشمالاً، فقال رسول ﷺ: من كان معه فَضْـلَ ظَهْـرٍ فَلْيَعُدْ به على من لا ظَهْرَ له، ومَنْ كان معه فَضْلَ زادٍ فَلْيَعُدْ به على مَنْ لا زاد له... فذكر من أصناف المال ماذكر حتى رأينا أنـه لاحقَّ لأحدٍ مِنّـا في فَضْلٍ} (رواه مسلم وأبو داود).

واتە: لە كاتێكدا لە سەفەرێك بووین، پیاوێك بە سواری حوشترێك هات، هەر چاوی بەلای ڕاستو چەپدا دەگێڕا، پێغەمبەری خواش ﷺ فـەرمووی: هەركەسێك وڵاخی زیادی پێیـە، بـا بیگێڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی وڵاخـی نیـە، هەركەسێك خۆراكی زیادی پێیە، با بیگێڕێتەوە بۆ كەسێك، كە خۆراكی پێ نیە... ئیدی بەجۆرە چەند شتێكی دیكەی باسكرد، هەتا پێمان وابـوو، كـە هیچ كەسمان بۆی نیە شتی زیادەی هەبێ!

وەك دەبینین سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی، لە زۆر ڕووەوە لە سیستەمی هاوبەشێتییەوە نزیکە، بەڵام ئاشکرایە، کە لەکەم‌و کووڕییەکانیشی دوورە، وەك چۆن هەندێك خاڵی پێکگەیشتنیشی لەگەڵ سیستەمی سەرمایەدارییدا هەن، وێڕای جیاوازی گەورەو زۆریش.

لێرەشدا کۆتایی بەم بابەتە دێنین‌و، بابەتی داهاتوومان بریتی دەبێ لە بەراوردی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی لە بواری کۆمەڵایەتیدا.

## ئاڵقەی شەشەم:

## لەبواری كۆمەڵایەتییدا

**خوێنەری سەنگین!**

**خوا یار بێ لەم ئاڵقەی شەشەمەدا بە كورتییو گوشراویی تیشك دەخەینە سەر بوارێكی دیكەی بەراوردكردنی تەوژمی ئیسلامییو عەلمانیی، كە بواری كۆمەڵایەتییە،مەبەستیشمان لە بواری كۆمەڵایەتیی (المجال الإجتماعي) حاڵەتی كۆبوونەوەی مرۆڤەكانە، چ لەچوارچێوەی: خێزاندا، چ ئیلو گەل، چ ڕێكخراوی پیشەییو مەدەنیی، چ كۆمەڵو حیزبی سیاسیی، چ كۆمەڵگایەكی دیاریكراو،چ بازنەی فراوانی مرۆڤایەتیی.**



# تێڕوانینی ئیسلام و سیکۆلاریزم لەبارەی مرۆڤــەوە

جا ئێمە سەرەتا ئاماژە دەکەین بە هەڵوێستی سیکۆلاریزم لەمەڕ هەرکام لەو شەش بازنەیەی تێدا گردبوونەوەی مرۆڤــەکانو، پاشـانیش هەڵوێـستی ئیسـلام دەخەینە ڕوو و، خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیش دەستنیشان دەکەین، بەڵام سەرەتا بەپێویستی دەزانم تێڕوانینی هــەرکام لەئیسـلامو سـیکۆلاریزم لــەبارەی خــودی مرۆڤــەوە بخەینە ڕوو، چونکە بێگومـان جـۆری تێڕوانینـە بـۆ هەرشـتێك، کـە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا دیاری دەکات، با لە پێشـەوەش سـەرنجی دیـدی سیکۆلاریزم بدەین لەبارەی مرۆڤـــەوە:

وەك لەباسەکانی ڕابردوودا خستمانە ڕوو، سیکۆلاریزم لەبواری (بوونناسی)[1]دا خاوەنی تێڕوانینێکی سەربەخۆو دیاریکراو نیە، چونکە وەك پێشتریش گوتوومانە (secularism) زیـاتر هەڵوێسـتێکی کاردانـەوەیی (موقـف رد فعلـيّ)یـە، نـەك فەلسەفەیەکی فکریی هەڵقوڵاو لە تێفکرینو ڕامانو لێکۆڵینەوە!

هەر بۆیەش سیکۆلاریزم لــەڕووی بووناسـیی‌و دنیابینییــەوە، چـەندان جـۆرە تێڕوانینی جیاوازو، بگرە پێکەوە دژی تەبەنی کردوەو، لەو پەڕی مادديگەرییەوە، هەتا ئەو پەڕی ئایدیاگەریی هاتوەو چووە!

بەڵام لەبواری تێڕوانینیدا بۆ مرۆڤـــ، عەلمانیەت بـەکردەوە بـەلای تـەوژمی مادديگەریی‌و بەجەستەی ڕووت دانانی مرۆڤـــدا شکاوەتەوەو، هیچ حیسابی بـۆ لایەنی مـەعنــەویی نــەکردوە، وەك چـۆن لــەبواری چـۆنیـەتی بـەڕێوەبردنو ژیـان گوزەراندنیدا، کەمو زۆر حیسابی بۆ خواو وەحی‌و ئایینی خوا نەکردوەو، لە نێوان

---

(١) (بوونناسـیی)یم لـە بەرامبـەر ئـەنتـولـۆژیی (Antology)دا بـەکارهێناوەو پـێم لـە (جیهانبینی) و (دنیابینی) ڕاستترە، کە هەندێك نووسەر بـەکاریان هێنـاون و پێشـتریش ئـەم مەسەلەیەم شیکردۆتەوە.

دنیاو دوارۆژیشدا بەس ژیانی دنیای بەچاو ئەنگاوتوەو، ژیانی ڕۆژی دوایی بەنەبوو (عدم) داناوەو، هیچ حیسابێکی بۆ نەکردوەو پشت گوێی خستوە!

بەڵێ، مرۆڤـــ لـە ڕوانگـەی سـیکۆلاریزم (secularism)ەوە زینـدەوەرێکی ماددیی‌و یەکلایەنییە، کە لەجەستەو غەریزەکانیدا بەرجەستە بـووەو ڕێچـکەی: مرۆڤــگەریی (Humanism)یش، کە سەرەتا لە ئیتاڵیا سەریهەڵداو پاشان تێکڕای ئەوروپاو ڕۆژئاواشی گرتەوەو، بـوو بەیـەکێك لـە بنـەما هـەرە گـەورەو گرنگـە فیکرییەکانی سیکۆلاریزم، لە کاردانەوەی کڵێسـاو جەختکردنیـدا لەسـەرلایەنی ڕووحیی‌و مەعنەویی پەیدابوو[(١)].

جا هەرچەندە ڕێچکەی (هیومانیزم) ڕێزو ئیعتیباری زۆری بۆ مرۆڤـــ دادەنـا، بەلاّم یەکەم: تەنیا وەك زیندەوەرێکی مـاددیی ڕووت تەمـەشـای دەکـرد، دووەم: جەخت کردنەوەشی لەسەر ڕێزو حورمەتی مرۆڤـــ، زیاتر لەرق‌و کاردانەوەی بیری خواناسیی‌و خواپەرستیی کڵێسا دابوو، نەك لەبەر خودی مرۆڤـــ خۆی!

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە،کەمرۆڤـــ لـە تێڕوانینـی سـکۆلاریزمدا بریتیـە لـە زیندەوەرێکی ماددیی ڕووتی لەجەستەو غەریزەکانیدا بەرجەستەبوو، زۆرن، بەلاّم ئێمە بەس ئاماژە بۆ دوانیان دەکەین:

أ- عـەلمانییەت هەرلەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە، بە خۆشحاڵییەوە سـەرجەم ئـەو بیردۆزەو بیرو بۆچوونانەی تەبەننی کردوون، کە مرۆڤـــ لە جەستەو غـەریزەو ئارەزووەکانیدا کـورت هـەڵێنن، وەك: ئـەبیقۆریزم‌و داریـونیزم‌و مارکسـیزم‌و فرۆیدیزم.

ب- تەوژمی عەلمانیی بەرجەستە لە ڕێکخراوو ڕژێمەکاندا، چ لـەبواری تیـۆریی (نظري)و، چ لەبواری پراکتیك (تطبیق)دا، هەر لەجوغزی لایەنی مادیی ژیان‌و جەستەو غەریزەکانی ئینساندا دەخولێتەوەو، هەمیشـە سـەری بـەرەو زەمـین

(١) بڕوانە: (موسوعة السياسة)، ج٤ ص١٨٠،١٧٩، عبدالوهاب الكيالي، وە: (الموسوعة العربية) ج٣ ص ٨٨١-٨٨٣.

شۆڕکردۆتەوەو، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا بەرەو ئاسمان سەرهەڵنەهێنیێ!

لـەبارەی هەڵوێسـت و تێڕوانینیـی ئیسلامیشـەوە بـۆ مرۆڤـ، لەسـۆنگەی ئەوەوە،کەپێشتریش لەو بارەوە دواوین، هەر بەکورتی دەڵێین: مرۆڤـ لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە جێنشـینی خوایـە: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً...﴾ (البقرة: ٣٠)، لەلایەن خواوە ڕێزوحورمـەتی لێگیراوە: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ...﴾ (الإسراء: ٧٠)، لەچاکترین شێوەی ماددیی‌و مەعنەوییـدا خـولقێنراوە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ (التين: ٤)، سەرتاپای بوونەوەرو کائیناتی بۆ ڕام‌و مەیسـەر کـراوە: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ...﴾ (الجاثيـة: ١٣)،مرۆڤـ تەنیا بەمەبەستی تاقیکرانەوە لـەم ژیانـە کـەم‌و کورتـەی دنیـادا دانـراوە: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا...﴾ (الملك: ٢)، ئەگـەرنا، مرۆڤـ بۆ ژیانێکی هەمیشەیی‌و نەبڕاوە هێنراوەتەدی، چ لـە ئـاگری دۆزەخـی بلێسـەدارو بەتینـدا، ئەگـەر بەندایـەتی خـۆی بـۆ خـوا ئیسـپات نـەکات‌و، لەتاقیکردنەوەی ژیانی دنیادا بکەوێ، چ لەبەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەدا،ئەگەرلـە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا سەرکەوتوو و سەربەرزبێ:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ۝٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ۝٧ جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّـٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ...﴾ (البينة: ٦،٧،٨).

واتە: بێگومـان ئەوانەی بێ بڕوان لە خاوەن کتێبـەکان‌و هاوبەشـدانەرەکان لـە ئاگری دۆزەخدان بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ئەوانە خراپترین دروست کراون. بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداوە، ئەوانە چاکترین دروستکراون. پاداشـتیان لـە لای پـەروەردگاریان چـەند بـاغێکی هەمیشـەیین، ڕووباریان بەبندا دەڕۆن، بۆ هەتا هەتایە تێیاندا بە هەمیشەیی دەمێننەوە. خـوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لەوی ڕازین...

خاڵی هاوبەشی نێوان ئیسلام‌و سیکۆلاریزمیش لە بواری پێناسەی مرۆڤدا ئەوەیە،کەمرۆڤ شایستەی رێزو حورمەتە، خاڵی جیاوازیشیان ئەوەیە،کەسیکۆلاریزم مرۆڤ بە سەروەری بوونەوەر (سيّد الكون) دادەنێ، بەلاّم ئیسلام مرۆڤ بە جێنشین‌و وەکیلی خوا ﷻ دادەنێ لەسەر زەوی‌و لە بوونەوەریشدا، هەر بۆیەش سیکۆلاریزم، یان هەر خوا ناناسێ، یان ،ئەگەربیناسێ، هەقی دەست تێوەردان (تدخل)ی ژیانی مرۆڤی پێنادات! بەلاّم ئیسلام دەڵێ: مرۆڤ ،ئەگەربیەوێ بەختەوەرو سەرفرازی ئێرەو ئەولای بێت، پێویستە پابەندی ئایین‌و بەرنامەی خوای مەولای بێ!

ئنجا لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو ڕاستییەش بکەین، کە ڕێزگرتنی ئیسلام لە مرۆڤ، زۆر قووڵترو ڕیشەدارترە لە هی سیکۆلاریزم، چونکە ئیسلام ئەو ڕێزو حورمەت گرتنە، پەیوەست دەکات بە ئیمان‌و عەقیدەوەو بەخودی مرۆڤەوە، بەلاّم سیکۆلاریزم دەیگێڕێتەوە بۆ هەندێك ئیعتیباری دیکە، وەك: دژایەتی کلێساو چینی ئەکلیرۆس، یان بەرژەوەندیی کۆمەلاّیەتیی‌و سیاسیی! بۆ نموونە: لە پێشەکی‌و دیباجەی (جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ)دا شەڕو کوشتارو ناسەقامگیریی ئاشتیی‌و تەبایی لە نێو گەلانی جیهاندا، کراوەتە بەڵگەو پاساوی هێنانەدی‌و ئیمزاکردنی ئەو جاڕنامەیە! بەلاّم ئیسلام ڕێزو مافەکانی مرۆڤ دەبەستێتەوە بەخودی مرۆڤ خۆیەوە، بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ ئیعتیبارێکی دیکە[1].

---

(١) بڕوانە: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) ئاڵقەی سێیەم: (مافەکانی مرۆڤ لە نێوان ئیسلام‌و ڕۆژئاوادا) لاپەڕە (١٣٣-١٩٠)، چاپی پێنجەم: نووسینگەی تەفسیر، ٢٠٠٥.

## تێڕوانینی سیکۆلاریزم لەمەڕ:
## خێزان و تیرەو گەل و ڕێکخراوی مەدەنیی و حیزبی سیاسیی و کۆمەڵگاو مرۆڤـایەتی بەگشتیی

### ١- خێزان:

ئەوەندەی سەرنجی بەرهەمی سیکۆلاریستەکانم داوە، هەستم نەکردوە، نە بیرو بۆچوونێکی تایبەتو سەربەخۆیان بەرانبەر بە خێزان (أسرة) هەبێتو، نەگرنگیی‌و بایەخێکی ئەوتۆشیان پێدابێ، ئەمە وەك (تیۆر)، وەك (پراکتیـك)یش ئـەوە وەك مانگی چواردە دیارە، کە خێزان لە کۆمـەڵگاو دەوڵەتـە سکۆلاریسـتەکاندا، تـا ڕاددەیەکی زۆر بەرەو پووکانەوەو هەڵوەشـان چـووەو، ڕێـژەی منـداڵانی زۆڵ لـە هەندێك لەولاتی عەلمانیی ڕۆژئاوادا لە هی حەڵاڵو باب ناسراو زیاترە، لەزۆربەی ولاَتانی ڕۆژئاوادا باسکردنی خێزانی یەك ڕەگەزیی (الأُسرة الأحاديـة)، واتـە: دوو پیاو، یان دوو ژن، بۆتە شتێکی ئاسایی!

### ٢- تیرەو گەل:

لەوبارەشەوە نەمزانیوە سیکۆلاریزم بۆچوونێکی تایبەتی‌و سەربەخۆی هـەبێ، بەلاَم وەك ئـەمری واقیـع، هەمیشـە عەلمانییـەت لـە هـەوڵی ئـەوەدابووە، کـە مامەڵەیەکی براگماتییانـەو سـوود وەرگرانـە لەگـەڵ دیـاردەی هـەبوونی تـیرەو گەلەکاندا بکاتو، سەردەمێك دەوڵەتە سکۆلاریستەکانی ڕۆژئـاوا، دەمـارگیریی تیرەگەریی‌و نەتەوایەتییان کردبوو بـە داینـەمۆی تـالاَنو بـڕۆو جـەنگو هـەراو پـاوانخوازیی‌و کۆلۆنیـالیزم (Colonialism) بەسەرپەرشـتی ولاَخـی ناسـیۆنالیزم (Nationalism)ەوە، هەر غارغارێنو ڕمبازێنیی بوو!

## ٣و٤- ڕێكخراوی پیشەیی‌و مەدەنیی‌و حیزب‌و ڕێكخراوی سیاسیی:

هەرچەندە هەبوونی ڕێكخراوە پیشەیی‌و سیاسییەكان، دیاردەیەكی كۆنی شارستانی كۆمەڵگاو دەوڵەتەكانە بەدرێژایی مێژووی بەشەر، بەڵام بەڕاستی لەسایەی ئەو كۆمەڵگاو دەوڵەتانەی ڕۆژئاوادا، كە سیكۆلاریزمیان تەبەننی كردوە، ئەو دیاردەیە زۆر گەشەی كردوەو بەرەو پێش چووەو، بۆتە پایەیەكی گەورەو گرنگی ژیان‌و گوزەرانی خەڵكی ڕۆژئاوا، لەهەموو بوارەكانی سیاسیی‌و گەشەكردنی ئابووریی‌و كۆمەڵایەتییداو، كاریگەرییەكی گەورەی هەبووە بۆ هێنـدی سەقامگیریی سیاسیی‌و گەشەكردنی ئابووریی‌و ژیان‌و گوزەران‌و توندوتۆڵیی كۆمەڵایەتی.

## ٥- كۆمەڵگا:

تەوژمی سیكۆلاریزم لەوڵاتانی ڕۆژئاوادا، ڕۆڵێكی گرنگی گێڕاوەو دەگێڕێ لەبواری چەسپاندنی بیرۆكەی هاووڵاتیێتی (فكرة المواطنة)و كۆكردنەوەی سەرجەم تاكەكانی كۆمەڵگایەك لەسەر بناغەی بەرژەوەندییە هاوبەشەكان (المصالح المشتركة)و خۆپاراستن لە دەمارگیریی ئایینی‌و ئیدۆلۆژیی‌و نەتەوەیی‌و طایەفیی‌و...هتد

## ٦- مرۆڤایەتی:

هەرچەندە سیكۆلاریستەكان لەبواری دڵسۆزیی‌و پەرۆش بۆ مرۆڤایەتی بەقسەو ڕاگەیاندن قەرسیلیان، هەتا چۆكان هێناوەو، دنیایان پڕكردوە لەقسەو قاڵ! بەڵام بەڕاستی لەسەر ئەرزی واقیع‌و بەكردەوە شتێكی دیكەیەو، كۆمەڵگاو ڕژێمە سیكۆلاریستەكان، هەتا بنانگوێیان بەخۆپەرستیی (أنانية)دا چوونەتە خواری‌و، هەتا وا وەسەر ماددە پەرستیی گەراون، كە ،ئەگەرهەرچی بژێوی گەلانی ژێر دەست‌و چەوساوەیە، بیكەنە پارووێك و قووتی بدەن‌و تۆزێكی دیكە بەزو غەزی

خۆیانی پێ زێدە بکەن، ئێستا پێیان وانیە شتێکیان کردبێ مایەی ڕەخنەو گلەیی بێت‌و ویژدانی سکۆلاریستەیان نقورچکەیان لێناگرێ!

سالآنەو بگرە مانگانەش مردنی ملیۆنان خەڵکی بێچارەو ڕەش‌و ڕووت، لە ئەنجامی برسیەتی‌و ئەو دەردو نەخۆشیانەدا، کە لەنەداریی‌و هەژاریی پەیدا دەبن، لەبەر چاوو گوێی زلهێزانی دنیادا، کە بەلێگرتنەوەی چەند ملیارێك لە خەرجیی‌و مەسرەفی چەك‌و جبەخانەی بەشەر قڕکەرو، ژیان‌و گوزەرانی زێدەڕۆیی‌و خۆشگوزەرانەیان، گرفت‌و کێشەکانیان، چارەسەر دەبن‌و لەمەرگ دەربازیان دەبێ، باشترین بەڵگەی فەشەل‌و شکستی تەوژمی عەلمانییە لەڕووی مەعنەویی‌و ئینسانییەوە! بۆ نموونە: ئەمریکا، کە زلهێزێکی سیکۆلاریستەو دنیای پڕکردوە لە دروشمی بریقەداری وەك: مافی مرۆڤ، ئازادیی، دیموکراسیی...هتد.

(نعوم تشومسكي) نووسەری ناوداری ئەمریکا لە کتێبی (الدول الفاشلة: إساءة استعمال القوة والتعدّي على الديموقراطية)[1] کە لەساڵی (٢٠٠٦) وەرگێڕراوەو چاپ کراوە، لە لاپەڕە (١٣)دا دەڵێ: ((خەرجیی ئەمریکا لەبواری سەربازیی‌و بەرهەمهێنانی چەکدا، بەتەنیا نێزیکە لە خەرجیی هەموو دەوڵەتانی دنیا وێکڕا! پاشان لە لاپەڕە (٢٧)دا دەڵێ: ئەمریکا لەنێو هەموو دەوڵەتانی دنیادا ئامادەنیە پابەند بێت بە ڕێکەوتننامەی (کیۆتۆ)وە، کە دەیەوێ ڕێگە بگرێ لە زیاتر پیسبوونی ژینگەو، کونبوونی چینی ئۆزۆن، بەهۆی دووکەڵ‌و گازی گەرمی کارخانەکانەوە!))

---

(١) واتە: (دەوڵەتە شکستخواردووەکان: خراپ بەکارهێنانی هێز و دەستدرێژیی کردنە سەر دیموکراسی)

# تێڕوانین و هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی:
# خێزان و تیرەو گەل و ڕێکخراوی مەدەنیی و حیزبی سیاسیی و کۆمەڵگاو مرۆڤـایەتی

## ١- خێزان:

خێزان (أسرة) لەئیسلامدا گرنگیی‌و بایەخێکی یەکجار زۆری دراوەتێ، چونکە خێزان یەکەمین خشتی بنیاتنانی کۆمەڵگایە، ئەو گرنگیی‌و بایەخ پێدانەش لەزۆر شتدا خۆی دەنوێنێ، بۆ نموونە:

أ- خوای پەروەردگار دیاردەی ژن‌و مێردایەتی‌و هۆگری یەکدی بوونی ژن‌و مێردو، یەکدی خۆشویستن‌و بەزەیی بەیەکدا هاتنەوەیانی، بەیەکێك لەنیشانەو بەڵگە گەورەکانی ئیسپاتی پەروەردگاریتی خۆیداناوە: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (الروم: ٢١).

ب- مەسەلەی هاوسەرگیریی‌و هەبوونی ژن‌و منداڵ، بەیەکێك لەسوننەت‌و خەسڵەتەکانی پێغەمبەران - عليهم الصلاة والسلام- دانراوە: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ ... ﴾ (الرعد: ٣٨).

ج- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەبەنیی قەدەغە کردوە: وەك فەرموویەتی: {...أما والله إنِّي لأخشاكم لله وأتقاكم لَـهُ، لكنِّـي أصومُ وأُفْطِرُ. وأصلِّي وأرْقُـدُ، وأتزوَّج النساءَ، فمن رغِبَ عن سُنَّتي فلَـيْس منِّـي} (رواه البخاري)، واتە: ئاگاداربن! بەخوا من لە هەمووتان لەخواترسترو پارێزکارترم، بەلاّم بەڕۆژوو دەبم‌و (ڕۆژووی سوننەت) جاری واش هەیە نایگرم، شەونوێژ دەکەم‌و دەشخەوم،ژنانیش دێنم، جا هەرکەسێك لەڕێبازی من لابدات لەمن نیە.

د- ئیسلام پەیوەندی نێوان ژنو مێردی، بە گرێبەستێکی گەورەو موبارەك داناوەو ژنی لای مێرد بە ئەمانەت لە قەڵەم داوە، کە دەبێ بیپارێزێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {فاتقوا الله في النساء فإنكم أخذتموهُنَّ بأمان الله واستحلَلْتُم فروجَهُنَّ بكلمة الله} (رواه مسلم عن جابر)، واتە: جا لەبارەی ژنەکانتانەوە پارێز لەخوا بکەن، چونکە وەك سپاردەی خوا وەرتان گرتوونو بەوشەی خوا بۆتان حەلاڵ بوون.

هـ- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە، کە ئافرەت چ بێوەژن بێ چ کچ، دروست نیە بەبێ ڕەزامەندیی خۆی بەشوو بدرێ: {لاتنكح الأيِّمُ حتى تُسْتأمر ولا تنكح البكر حتى تُسْتَأذن} (رواه البخاري عن أبي هريرة)، بێوەژن بەشوو نادرێ هەتا ڕاوێژی پێنەکرێو، کچیش بەشوو نادرێ، هەتا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ.

و- ژنو مێرد لە ئیسلامدا بۆ یەکدی، وەك بەرگو پۆشاك وانو هاوتاو هاوکوفی یەکن لە هەموو ڕوویێکەوەو ئەركو مافەکانیان بارتەقای یەکن، جگە لە ئەرکی مشوورخۆریی‌و بەڕێوەبردنی ماڵو خێزان، کە لەئەستۆی پیاو دایە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ...﴾ (البقرة: ١٨٧)، وە فەرموویەتی: ﴿...وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ...﴾ (البقرة: ٢٢٨)، دیارە مەبەستیش لەو پلەیە ئەرکی سەرپەرشتی کردنو بەڕێوە بردنی ماڵو خێزانە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ...﴾ (النساء: ٣٤)، دیارە بە پیاو سپێررانی ئەرکی بەڕێوەبردنی خێزانیش، چەندان حیکمەتی گەورەی تێدان، کە یەکیان بارسووککردنی ژنو هاوکاری کردنیەتی، لەو بارەوە دەتوانی سەرنجی کتێبی (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت دا) بدەی[1]، لە کۆتایی ئەم باسەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورت بە مەسەلەیەك بکەم، کە بەداخەوە

---

(١) بڕوانە: چاپی دووەم/ ٢٠٠٥، نووسینگەی: تەفسیر.

هەندێك نووسەر بەنەشارەزایيی‌و لەسەر بناغـەی لاسـا كردنـەوەی كوێرانـە قسەیان لەسەركردوە، ئەویش ئەوەیە،كە گوایە ئیسلام ئافرەت بەسەرچاوەی گوناهو خراپە دادەنـێ، بەبەڵگـەی ئەوە،كـە دەڵـێ: (حـەوا) كـاتی خـۆی (ئادەم)ی فریودا، كە لەدرەختە قەدەغەكراوەكـەی بەهەشـت بخـۆن! بـەلاَم بێگومان ئەم بیرۆكەیە، جگە لە ئەفسانە شـتێكی دیكـەی نیـەو، ئیسـلام ئافرەت‌و پیاو بەخاوەنی یەك جۆرە نەفس‌و سروشتی وەك یەك دادەنێ، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿..خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا ...﴾ (الروم: ٢١)، وە ئافرەتان بە لەتك (شِقّ)ی پیاوان پێناسە دەكات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إنما النساءُ شقائق الرِّجال} (رواه أبو داود).

قورئان بە پێچەوانەی تەورات‌و ئینجیلی گۆڕراوەوە، ڕایگەیاندوە، كە ئـادەم‌و حەووا (سەلامی خوایان لێ بێ) پێكەوەو وێكڕا لە درەختە قەدەغـە كراوەكـەیان خـواردوە: ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا ...﴾ (طـه: ١٢١)، دیـارە مـاك‌و سەرچاوەی ئەو جۆرە خلیسكان‌و ساتمە بردنەی ئەو چەشنە نووسـەرانەش، وێـڕای بێئاگایی لە ئیسلام‌و قورئان، لاساكردنەوەی كوێرانەی ڕۆژئاواییيەكانە.

### ٢- تیرەو نەتەوە:

لەڕوانگەی ئیسلامەوە، هەبوونی تیرەو گەلەكان شتێكی ئاسایی‌و خواڕسـكی هەڵقوڵاوی ئیرادەی كاربەجێیانەی خوای پەروەردگارەو، حیكمەتەكەیشـی جـۆراو جۆر (متنوِّع) بوونی مرۆڤـایەتیی‌و هاوكاریكردنی یەكـدی‌و دەسـتبار پێكـەوە گرتنیـەتی، وەك خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ...﴾ (الحجـرات: ١٣)، كەواتـە: دابەشـبوونی مرۆڤـایەتیی بـۆ سـەر چـەند گـەل‌و تیرەیـەكی جیـا جیـا، شـتێكی ئاسـایی‌و سروشتییەو، وێڕای ئەوەش جیاوازی ڕەنـگ‌و زمانـە جـۆراو جۆرەكـان، بەڵگـەو نیشانەی پەروەردگاریتی خوایە، وەك فەرموویـەتی: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ

﴿ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴾ (الـروم: ٢٢)، واتە: لەبەڵگەو نیشانەکانی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو جیاوازی زمانو ڕەنگەکانتانە، بێگومان لەوەدا بەڵگەو نیشانە هەن بۆ زانایان -لەسەر پەروەردگاریتیو کاربەجێیی خوا-.

دیارە خۆشویستنی گەلو نیشتیمانو بەتەنگەوە بوونیشیان، کە شتێکی خوارسكو سروشتییە، لەگەڵ دەمارگیریی (تعصُّب)و ڕەگەزو ڕەچەڵەك پەرستییدا زۆر لەیەك جیاوازن. وەك لە کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم لە ڕوانگەی ئیسلامەوە)دا ڕوونمان کردۆتەوە[1]. هەر بۆیەش لە ئیسلامدا چەندە خۆشویستنی گەلو نیشتیمانو بەرگری لێکردنیان ڕەواو پەسندە، بگرە پێویستە، بە پێچەوانەوە تیرەگەرییو نەتەوەپەرستییو ڕەگەز پەرستییو خۆیەسەر خەڵکیدا هەڵکێشانو چاو لەستەمکارییو مافی خەڵك پێشێل کردن بوون، هێندە ناپەسندو ناڕەواو قەدەغەیە، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {وَمَنْ قُتِل تحت رايةٍ عُمِّيَّةٍ يغضب للعصبة ويُقاتِلُ على العَصَبةِ، فليس من أمَّتي} (رواه مسلم برقم: ١٨٤٨)، واتە: هەرکەسێك لەژێر ئالایەکی نەفامییدا بکوژرێ، کە لەسەر دەمارگیریی توورەبێو لەپێناوی دەمارگیرییدا بجەنگێ، ئەوە لە ئوممەتی من نیە.

کاتێکیش پرسیار لە پێغەمبەری خوا کراوە لەبارەی (عَصَبيَّة)وەو گوتراوە: (یارسول الله ماالعصبية؟ ئەی پێغەمبەری خوا دەمارگیریی چی یە؟! فەرموویەتی: {نصرك قومك على الظلم} (رواه أبو داود)، واتە: پشتگیریی کردنی گەلەکەتە لەسەر ستەمو خراپە.

### ٣و٤- ڕێکخراوی پیشەییو مەدەنییو ڕێکخراوو حیزبی سیاسیی:

وەك پێشتریش باسمان کرد، هەبوونی ڕێکخراوی پیشەییو مەدەنییو حیزبی سیاسیی، هەر لەدێر زەمانەوە لەنێو کۆمەڵگاکانی بەشەردا بەجۆرێك لەجۆرەکان

---

(١) بڕوانە: چاپی سێ یەم، نوسینگەی تەفسیر (٢٠٠٥).

هەبووەو، ئەم مەسەلەیە شتێك نیە تازە سەری هەڵدابێ،بەتایبەت لە مێژووی سێزدە سەدەی دەوڵەتو کۆمەڵگای ئیسلامییدا، ئەو دیاردەیە زۆر گەشەی کردوەو زەق بۆتەوە، بەڵام بێگومان بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەکردنو بەرەو پێشچوونی کۆمەڵگادا.

دیارە خۆڕێکخستنو خۆ جەمو جۆرکردنی چینو توێژەکانی کۆمەڵگاش لەچەند ڕێکخراوێکی پیشەییو مەدەنییدا، بۆ بەرەو پێش بردنی کاروبارەکانیانو، داکۆکیی کردن لەسەر دەستەبەرکردنی مافەکانیان، یان خۆ ڕێکخستنو لە دەوری یەکدی کۆبوونەوەی کۆمەڵە خەڵکێك بۆ پاکسازییو چاکسازیی کۆمەڵگا لە هەموو بوارەکانی فیکرییو سیاسییو کۆمەلآیەتییو ئابوورییو فەرهەنگییو...هتددا، شتێکە، نەك هەر عەقڵو نەقڵ ڕێیان لێنەگرتوە، بەڵکو فەرمانیشی پێدەکەن، چونکە هەم عەقڵو هەم وەحییش، فەرمان بە مرۆڤ دەکەن، کە قازانجەکان (المنافع) دابین بکاتو زیانەکان (المضار)یش وەدوور بخات، بگرە پسپۆڕو شارەزایانی شەریعەت لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە خوای کار بەجێ ئایینو بەرنامەی خۆی، جگە لە دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی خەڵك (تحقیق مصالح الناس) لە دنیاو دواڕۆژدا، بۆ شتێکی دیکە نەناردوە، هەر بۆیەش وەك بنچینەیەکی شەرعیی (قاعدة شرعیة) گوتوویانە: (أینما وجدت المصلحة فَثَمَّ شرع الله) بەرژەوەندیی لە کوێ بێ، شەرعی خواش لەوێیە!

ئنجا دیارە ئینسانیش بەتەنیا تواناو بڕستی ئەوەی نیە، کە قازانجەکان دابینو زیانەکان وەدوور بخات، بۆیە هەرکاتێك بویسترێ بەرژەوەندییە گشتییەکان (المصلحة العامة)ی چینو توێژێك، یان کۆمەڵو کۆمەڵگایەك دابین بکرێن، پێویستە پەنا ببرێتە بەرکاری هەرەوەزییو ڕێکخراویی. دیارە لەو بارەشەوە چەندان دەقی قورئانو سوننەت هەن، کە دەگونجێ هەم بۆ ڕەواو، بگرە پێویست بوونی کاری ڕێکخراوە پیشەییو مەدەنییەکانو، هەم بۆ حیزبو ڕێکخراوە سیاسییەکانیش بەبەڵگە بهێنرێنەوە، بۆ نموونە:

* ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٤)، واتە: با کۆمەڵێکتان لەنێودا هەبن،بانگەواز بۆلای چاکە بکەن‌و، هەرچی پەسندە فەرمانی پێبکەن‌و، هەرچی ناپەسندە قەدەغەی بکەن، وەهەر ئەوانەشن سەرفرازان.
* ﴿ ...وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ... ﴾ (المائدة: ٢)، واتە: هاوکاری یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی‌و پارێزکاریی...
* {عليكم بالجماعة وإيّاكم والفرقة} (رواه أحمد والترمذي وابن ماجه)، واتـە: لەگەڵ کۆمـەڵ دابن‌و خۆتان لە پەرتـەوازەیی دوور بگرن.
* {الجماعة رحمة والفرقة عذاب} (رواه أحمد)، واتە: کۆمـەڵ بوون مایەی بەزەیی خوایەو، پەرتـەوازەیی مایەی سزایە.
* {المؤمن للمؤمن كالبنيان يشدُّ بعضُهُ بعْضاً} (متفق عليه)، واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار، وەك دیوار وایە، هەندێکی هەندێکی مەحکەم دەکات. هەرچەندە - وەك جاری دیکەش گوتوومانە- هەر شتێك عەقڵ‌و واقیع پێویستی بکەن‌و هێنانەدی بەرژەوەندییەك، یان زیاتر پەکی لەسەری بکەوێ، پێویسـتی بـە بەڵگەی وەحی‌و نەقڵ ناکات‌و، کەمتریش وایە خوای کاربەجێ ئـەو شـتانە لەشەریعەتدا بخاتــە ڕوو، کــە عــەقڵ خـۆی پـەییان پـێ دەبـات‌و توانـای بەسەریاندا دەشکێ.

### ٥- کۆمەڵگا:

ئیسلام گرنگییەکی زۆری بە کۆمەڵگا داوە، هەم لـەڕووی بنیاتنانییـەوە لەسـەر بناغـەیەکی پتەوو قایم‌و، هـەم لـە ڕووی پاراسـتنییەوە لـەو هۆکارانـەی بـەرەو بێهێزیی‌و داڕووخانی دەبەن‌و، هەم لەڕووی گەشە پێدان‌و بەرەو پێشبردنییەوە لـە هەموو بوارەکانداو، هەم لەڕووی زیاتر پێکەوە جۆشدانی ڕیزەکانییـەوە، بـەهۆی چەند شتێکەوە، کە لەژێر ناوو نیشانی: بەتەنگ یەکدییەوە بـوونی کۆمەڵایـەتی

(التضامن الإجتماعي)دا کۆ دەبنەوە، وەك: زەکاتو وەقفو میراتو وەصییەتو خەرجی کێشانی بابو دایكو خزمان:

١- جارێ لە ڕووی بناغەی کۆمەڵگای ئیسلامییەوە، ئەوە خوای کاربەجێ ڕایگەیاندوە، کە دۆستایەتی (الموالاة)و پشتی یەکدی گرتن، دەستبار پێکەوە یەکدی گرتن، پێکەوە گرێدەری ئیماندارانە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ...﴾ (التوبة: ٧١)، وشەی (أولیاء)یش کۆی (ولي)یەو ئەمیش بەمانای: دۆستو نێزیكو یارمەتیدەرو سەرپەرشتیار... دیّ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەیەکی زۆر جوانو سەرنج ڕاکێش وێنای کۆمەڵو کۆمەڵگای مسوڵمان دەکات، کە دەفەرمووێ: {مثل المؤمنين في توادِّهم وتراحمهم وتعاطفهم كجسدٍ واحدٍ إذا اشتكى منه عُضْوٌ تداعى له سائر الجسد بالسَّهَرِ والحُمّى} (رواه البخاري ومسلم)، واتە: وێنەی بڕواداران لە یەکدی خۆشویستنو، بەزەیی پێکدا هاتنەوەو، بۆ یەکدی بەپەرۆشبوونیان، وەك جەستەیەك وایە، کە ،ئەگەر ئەندامێکی نەخۆش بوو، تێکڕای جەستە بەشەونخوونییو تا، بەشداریی دەکات. ئنجا، ئەگەر هاتو لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا پێکهاتەی دیکەی غەیری مسوڵمانانی تێدابوو، ئەوە پێویستە چاکەکارییو هاوکاریی بنچینەی هەڵسو کەوت کردن بێت لەگەڵیاندا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ...﴾ (الممتحنة:٨)، زانایانی ئیسلامیش وەك بنچینەیەکی شەرعیی لەو بارەوە گوتوویانە: (لهم ما لنا وعليهم ما علينا)، واتە: ئێمە چ مافێکمان هەیە ئەوانیش هەیانەو، هەمان ئەرکیشیان لەسەرە کە لەسەر ئێمەشە.

٢- بۆ پاراستنو ساغو سەلامەت ڕاگرتنی کۆمەڵگاش، ئیسلام دەستدرێژیی کردنە سەر هەرکام لە: دینو ژینو وەچەو ئابڕووو عەقڵو سامانو ئاسایشی خەڵکی، بەتاوانێکی گەورە داناوەو سزاو جەزرەبەو لێپرسینەوەی دنیاییو

دوا ڕۆژیی بۆ بڕیارداوە، وەك لەهەرکام لەکتێبی: (ئیسلامو مسوڵمانەتییو کـاری ئیسـلامیی)[١]، وە نامیلکـەی (سیاسـەتی ئیسـلامییو چـەند ڕوونکردنەوەیەك)[٢]دا لەو بارەیەوە دواوین.

٣- لـەڕووی گەشـەپێدانو بـەرەو پێشـبردنی کۆمـەڵگاوە، ئیسـلام لەسـەر مسوڵمانانی پێویست کردوە، کە هەمیشە بە عـەقڵو چـاوو گـوێی کـراوە لەگەڵ دەورو بەریاندا ڕەفتار بکەنو، سستی نەکەن لە وەرگرتنو قۆستنەوەی هەر زانیارییو بیرۆکەیەکی بەسووددا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...فَبَشِّرْ عِبَادِ ۝١٧ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ (الزمر: ١٧،١٨)،پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {الحكمة ضالّة المؤمن فحيثما وجدها فهو أحق بهـا} (رواه الترمـذي)، واتـە: حیکمەت بزربووی بڕوادارەو، لەهەر کوێیەك چنگی بکەوێ، لە هەمووکەس پێی شایستەترە.

٤- لەڕووی زیاتر پێکەوە جۆشدانی ڕیزەکانی کۆمەڵگاوە لەمیانەی: بەتـەنگ یەکدییەوە بوونی کۆمەڵایەتی (التضامن الإجتمـاعي)دا، ئیسـلام بـەهۆی دانانی: زەکاتو وەقفو میراتو وەصییەتو پێویسـت کردنـی مەسـرە و خەرجی کێشانی بابو دایكو خزمانی نەدار، لەسەر بابای هەبوو، کارێکی وای کردوە، کە هیچ کەس لە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانو پابەند بەشەریعەتدا پەکی نەکەوێ و بێ سەلا نەبێ!

ئێستاش باتیشکێکی خێرا بخەینە سەر هەرکام لەو پێنچ شتە، کە ئیسلام بەهۆیانەوە چینو توێـژەکانی کۆمـەڵگا پێکـەوە جۆشـدەداتو پێشـگیریی لەفەوتانو پووکانەوەی خەڵکە کەمدەستو بێچارەکەی دەکات:

---

[١] چاپی یەکەم (٢٠٠٦).

[٢] چاپی یەکەم (٢٠٠٧).

أ- زەكات: كە لەئاڵقەی پێشوودا بەكورتی باسمان كردو، لەبەرگی سێیەمی كتێبی (خوا پەرستی ئیسلامی)دا بەدرێژی باسمان كردوە، ڕۆڵێكی گەورە لەدەستبار بۆگرتنی خەڵكی گرفتارو ئاتاج دا دەگێڕێ.

ب- وەقف: ئەمیش، كە بریتیە لەهێشتنەوەو حەپس كردنی زەوییەك، یان خانوویێك، یان كتێبخانەیەك یان..یان...هتد، بەجۆرێك، كە سوود لێوەرگرتنییان، بەرهەمەكەی بۆ خەڵكی بەگشتیی، یان توێژو كۆمەڵێكی دیاریكراو تەرخان بكرێ، هۆكارێكی دیكەی گرنگی توندو تۆڵیی‌و تۆكمەیی كۆمەڵگایە، بەڵگەش لەسەر ڕەوا بوونی وەقف وێڕای عەقڵ، فەرموودەی خوایە، كە دەفەرموێ: ﴿...وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ (الحج: ٧٧)، واتە: وەچاكە بكەن بەڵكو سەرفرازبن.

هەروەها ئەوەیە،كە (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە، كە (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ، دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو زەوییەوە، كەلەدەستكەوتی (خيبر) پێی بڕاوەو چاكترین سامانی بووە، ڕاوێژی پێدەكات چی لێبكات؟ ئەمیش دەفەرموێ: {إنْ شئت حَبِسْتَ أصْلَها وتصدَّقْتَ بِها}، واتە: حەز دەكەی وەقفی بكەو بەرهەمەكەی بكە بەخێرو چاكە.

ج- میرات: ئەمیش كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەڕاستكردنەوەی باری لاری زۆرێك لەو میراتگرە نەدارانە، كە میراتی بابایەكی هەبوو دەگرن، وێڕای ئەوەی،كە سامانە زۆرو لەسەریەك كەڵەكەبووەكانی دەوڵەمەندەكانیش پرژو بڵاو دەكات‌و ڕێ لەزۆر دەوڵەمەند بوون، دەگرێ!

د- وەصییەت: ئەمیش هۆكارێكی دیكەی گرنگی لە فریاهاتنی خەڵكی كەمدەست‌و ئاتاجە، چونكە بابای نێزیك مەرگ، بۆی هەیە لەسێیەكی ماڵەكەیدا وەصییەت بكات‌و، هاوكاری بابای ئاتاجی خزم، یان بێگانەی

پێ بکات، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ ... ﴾ (البقرة: ١٨٠).

هـ- خەرجیی کێشانی بابو دایكو خزمی نـەدار: لەسـەر بابـای هـەبوو - ئافرەت یان پیاو- پێویستە، کە هاوکاری بابو دایکیو خزمانی بکاتو مەسرەفیان بکێشێ، مادام ئاتاجو نەدار بن، دیارە ئەمـەش کـەلێنێکی گەورە لە بواری (بەتەنگ یەکدییەوە بوونی کۆمەڵایەتی)دا پڕدەکاتـەوە، بەڵگەی قورئانو سوننەتیش لـەوبارەوە زۆرن، وێـڕای دەلالـەتی عـەقڵو ویژدانو فیطرەت، بـۆ نموونـە: خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ۖ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَىٰ ...﴾ (النساء: ٣٦)، واتە: خوا بپەرستنو هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی و،چاکە لەگەڵ بابو دایـكو خزماندا بکەن...، دیارە چاکەکردنیش لەگەڵ بابو دایكو خزمی نەدار، بـەر لەهـەر شـتێك مەسـرەف کێشـانیانە! پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرموویەتی: {يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيا وابدأ بمن تَعُولُ: أمّك وأباك وأختك وأخاك ثم أدْناك فأدْناك} (رواه النسائي عن طارق بن المحاربي)، واتە: دەستی بەخشەر بەرزە، لەو کەسانەوە دەست پێ بکە کە بژێو بۆ دابین کردنیانـت لەسـەر پێویستە: دایکتو باوکتو خوشکتو برات، ئنجا کێ لێت نێزیکترە پـێ بەپێ...

## ٦- مرۆڤـایەتی:

ئیسـلام وا تەماشـای مرۆڤـــایەتیی دەکات،کـە زادەو بەرهــەمی خێزانێکــەو هەموویان خاوەنی یەك ڕیشەو بنەچەکەن‌و، هیچ کەسو کۆمەڵو تیرەو گەلێك پلەو ئیمتیازی بەسەر یەکێکی دیکەدا نییە،وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (النسـاء: ١)،

واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن، کە لەیەك نەفس دروستی کردوون، هەر لەخۆیشی هاوسەرەکەی هێناوەتەدی، پیاوانو ئافرەتانی زۆری لێ خستوونەوەو بلاوی کردوونەوە، پارێز لەو خوایە بکەن، کە شتی پێ لەیەك داوا دەکەن،پارێز بکەن لە خزمایەتی -کە بیپچڕێنن- بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {یاأیها الناس إنَّ ربَّکم واحدُ وإنَّ أباکم واحد، کلّکم لآدم وآدم من تراب، لا فَضْلَ لعربي على أعجميّ ولا لأبيض على أسود إلاّ بالتقوى "ان أکرمکم عندالله أتقاکم"} (رواه أحمد والبزّار وقال الهيثمي: رجالُهُ رجال الصحيح). واتە: ئەی خەڵکینە! بێگومان پەروەردگارتان یەکە،بابتان یەکە، هەمووتان لە ئادەمنو ئادەمیش لە گڵە "بێگومان ئەوەتان لەلای خوا بەرێزترە، کە پارێزکارترە".

بەڵام پێویستە بزانرێ، کە ئەو جۆرە تێڕوانینەی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی لەسەر حیسابی تایبەتمەندییەکانی تیرەو گەلان نیە، چونکە ئیسلام هاوکات لەگەڵ ئەوەی،کە مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە بۆ یەك بنەڕەتو ڕەچەڵەك، ڕاشی دەگەیەنێ، کە مرۆڤایەتیی لەڕیشەو ڕەچەڵەکدا یەکە، دابەش بووە بۆ چەندان تیرەو گەلی جۆراو جۆر، تاکو پێك ئاشنابنو لەگەڵ یەکدا هاوکارو تەبابن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ (الحجرات: ١٣)، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك وەدی هێناوەو، گێڕاومانن بە چەندان گەلو تیرە، تاکو پێك ئاشنابن، بێگومان بەرێزترتان لەلای خوا پارێزکارترتانە، بەڕاستی خوا زانای شارەزایە. هەروەها پێویستە ئەوەش بزانرێ، کە هەرچەندە ئیسلام ئایینو بەرنامەی تێکڕای مرۆڤایەتییەو لە جوغزو بازنەی تەسکی هیچ تیرەو گەلێکدا کورت هەڵنەهاتوە، وەك خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی (محمد)ی فەرمووە: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ... ﴾ (الأعراف: ١٥٨)، واتە: بلێ ئەی خەڵکینە! بێگومان من ڕەوانە کراوی خوام بۆلاتان بە

تێکرا...»، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام ڕێـی بەشـوێنکەوتوانی نـەداوە، کـە بـۆ گەیاندنی بەهەموو بەشەر، هێزو زەبرو زەنگ‌و فشـار بـەکار بێـنن، بـەڵکو وەك ڕاستییەکی مشت‌و مڕ هەڵنەگر ڕایگەیاندوە، کە نابێ تۆبزیکردن‌و سـەپاندن لـە ینداریيدا بەکار بێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ...﴾ (البقرة: ٢٥٦)، ئنجا هەر لێرەشدایە، کە جیهانگیریی ڕژێمە طاغووتەکان‌و، جیهانێتی ئیسلام لە یـەك جیـا دەبنـەوە، چونکە هەرچی جیهانێتی ئیسلام (عالمية الإسـلام)ە، لـە میانـەی بـڕوا هێنـانی ئازادانەی مرۆڤـەکان‌و گەل‌و تیرەکاندا بە جیهاندا بڵاودەبێتەوەو دنیا دەتەنێتەوە، بەڵام جیهانگیریی طـاغووتـەکان (عولمـة الطواغيـت) لـە ئـەنجامی داگیرکـاریی (إحتلال)و سەپاندن‌و زەبرو زەنگدا باڵی ڕەشی بەسەر دنیـادا دەکێشـێ، وەك لـە ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا لەسـەر دەسـتی ئـەمریکاو هاوپەیمانـەکانی ڕوودەدات! دەشتوانی بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر لەو بارەوە سەرنجی: (چەند مـەسەلەیەکی بـاوی سەردەم)بدەی، ئاڵقەی چوارەم: (جیهانگیریی ڕۆژئاواو جیهانێتی ئیسـلام‌و چـەند سەرنجێك)[1].

ئێستاش زۆر بەسێنایی دەتوانین بەراوردی نێوان ئیسلام‌و سیکۆلاریزم بکەین لە بواری کۆمـەڵایەتیدا، بەهەرشەش جوغزو بازنەکەیەوە:

١- جارێ لە بواری خێزاندا لە حاڵێکدا، کە ئیسلام (خێزان) بەخشتی یەکـەمی بنیاتنانی کۆمـەڵگا دادەنێ‌و، تەنیا یەك جۆرە خێزانیش بەڕەوا دەزانـێ، کـە بریتیە لە پێکەوە کۆبوونەوەی (ژن‌و مێرد)ێك - یان زیـاتر لـە ژنێـك هـەتا چوار- لەسەر بناغەی گرێبەست (عقد)ێکی ئاشکرای شایەتیی لەسـەر دراو، عەلمانییەت بە پێچەوانەوە، نەخێزان هێندە بەشـتێکی گـرنگ دەزانـێ، کـە بەپێویستی بزانێ پارێزگاریی لێ بکات، بەڵکو زۆر جار کار لەسەر تێکـدان‌و نەهێشتنی دەکات! نەهەبوونی خێزانیش بە (ژن‌و مێرد)و گرێ بەست‌و چی‌و

---

(١) لاپەڕە: ١٩١ تا ٢٣٩، چاپی پێنجەم/ ٢٠٠٥.

چییەوە دەبەستێتەوە، بەڵکو هەردوو کەسێك، چ ڕەگەزیان یەك بێت وەك دوو پیاو یان دوو ژن، چ جیا بێت، بەهەر شێوەیەك کۆببنەوە بەخێزان دەزانێ!

٢- لەبارەی تیرەو گەلەکانەوە، وەك باسمان کرد، ئیسلام هەرچەندە وەك دیاردەیەکی خوارسكو سروشتی کۆمەڵایەتی دانیان پێدادێنێ، بەڵام نەك هەر هەوڵ نادات، بەڵکو هەر ڕێگاش نادات،کە بکرێنە زەمینەی دەمارگیریی (تعصُّب)و داینەمۆو بزوێنەری شەڕو ئاژاوە، وەك سیکۆلاریزم لە مێژووی ڕۆژئاوادا کردوویەتی،و، ئێستاش لە زۆر شوێنی دنیادا دەیکات!

٣و٤- لەبواری ڕێکخراوە پیشەییو مەدەنیی یەکانو حیزبو کۆمەڵە سیاسییەکاندا، کە وەك گوتمان لەسایەی کۆمەڵگاو دەوڵەتە سیکۆلاریستەکاندا زەمینەی گەشەکردنو بەرەو پێشچوونی باشیان بۆ ڕەخساو، ئەمە یەکێکە لەو خاڵە ئیجابییانەی، کە بۆ عەلمانییەت حیساب دەکرێن، بەڵێ، ئیسلام لەم بوارەدا دەیەوێ ڕێکخراووحیزبەکان ئامرازی پاکسازیی و چاکسازییو گەشەپێدانی کۆمەڵگابن، بەهۆی فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە تێدا ئەنجامدانیدا، جا هەرچەندە سیکۆلاریزمیش بەشێوەیەکی تیۆریی هەمان ئامانجی هەیە، بەڵام هیچ گومانی تێدا نیە، کە ئیسلامیی پشت بەستوو بە ئیمان بەخواو ڕۆژی دواییو، پشت ئەستوور بەلایەنی خواپەرستیی و ڕەوشت، لەم مەیدانەدا چەندان قۆناغ، سیکۆلاریزم بەجێ دێڵێ.

٥- لەبواری کۆمەڵگادا لەسۆنگەی ئەوەوە، کە ئیسلام لەلایەکەوە بناغەیەکی پتەوی عەقیدەییو مەعنەویی بۆ کۆمەڵگا دادەڕێژێ، لەلایەکی دیکەشەوە وەك ئەرکێکی ئایینی دنیاییو دوارۆژیی لەسەرهەر تاکێکی کۆمەڵگای فەرز دەکات،کە دڵسۆزی کۆمەڵگایەکەی بێتو بەتەنگییەوە بێتو بۆی بەپەرۆش بێت، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

* {الدين النَّصيحة، قلنا لمن يارسول الله؟ قال: للِه ولكتابهِ ولرسولِهِ ولأئمة المسلمين وعامتهم} (رواه مسلم).

* {كُلُّكم راعٍ وكلكم مسؤل عن رعيَّته...} (متفق عليه).

بەڵێ، لە سۆنگەی ئەوەوە، کـە ڕابـردو لـە سـۆنگەی گـەلێك هۆکـاری دیکەشەوە، هیچ کاتێك ئیسلامو سیکۆلاریزم لـە هێنانـەدی کۆمـەڵگایـەکی سـاغو سـەلیمو تۆکمـەو پتـەوو بەختـەوەردا، نـاگونجێ بخرێنـە دوو تـای تەرازوویێکەوە.

٦- لەبازنەی فراوانی مرۆڤـایەتیدا، لـە سـۆنگەی ئەوەوە،کەئیسـلام دەزانـێ مرۆڤـەکان خوا بۆ تاقیکردنەوە دروستی کردوونو، لە هەڵبـژاردنی ئیمـانو کـوفردا ئـازادو سەرپشـك (مختـار)ی کردوون،دەزانـێ، کـە دابەشـبوونی مرۆڤـایەتی بەچەند گـەلو تـیرەی جـۆراو جـۆر، خواسـتو ویسـتی خـوای کاربەجێی لەسەر بووە، هەرچەندە سەرجەم مرۆڤـایەتی لە ڕووی بنەچـەکەو ڕەچەڵەکەوە بەزادەو بەرهەمی خێزانێکو هـەڵقولاوی سەرچـاوەیەك دادەنـێ، بەلاّم هەرگیز ڕێگا نادات بـەهیچ بیـانوو و پاسـاوێکەوە، هـیچ سیاسـەتو فەلسـەفەو ئاینێکیـان بەسـەردا بسـەپێنرێو، ئیرادەیـان پێشـێل بکـرێو، تایبەتمەندییەکانیان لێ زەوت بکرێنو، وەك صابوون لەیەك قاڵب بدرێن، یا ئەو قاڵبـە قـاڵبی سـوپەرمان (Superman)، یـان مرۆڤـی کۆتـایی (خـاتم البشـر)ەکەی (فرەنسیس فۆکۆیاما)ش بێت،کە لە کتێبـی (کۆتـایی مێـژووو مرۆڤـی کۆتایی)دا باسی دەکات!!

بەلاّم سکۆلاریزم بەجۆریکی دیکە تەماشای دنیـاو مرۆڤـایەتی دەکـاتو، لەسەر بنەمای بیردۆزەکانی نیتشەی ئەڵمانییو داریۆنی بـەریتانی، کـە دەڵـێن: مانـەوە بـۆ بـەهێزترە! (البقـاء للأقـوى)، سـیکۆلاریزم، گلۆبالیزەیشـن (Globalization)، کە لەعەرەبییـدا بـە (عولمة)و لـە کوردییـدا (جیهـانگیریی) تەرجەمە کراوەو، ئەمریکاو زلهێزەکان دەیانەوێ لەژێر ناوو نیشانەکەیدا، دەست بەسەر هەموو دنیادا بگرنو، هەرچی دینو ژینو خێرو بێری گەلان هەیە، بیخەنە

ژێر ڕکێفو کۆنتڕۆڵی خۆیانەوە، بەشتێکی ڕەوا دەزانن‌و قەناعەتیشی وایە، کە هیچ کەس بۆی نیە هەر نێوچەوانیشی لە بەرانبەردا گرژ بکات، چ جای بەرهەڵستیی بکاتو دژایەتی بکات!

لێرەشدا کۆتایی بەم بابەتە دێنینو، خوا یارین بابەتی داهاتوومان بریتی دەبێ لە بەراوردی نێوان ئەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی لەبواری: تەبایی‌و پێکەوەژیان (التسامح والتعايش)داو شایانی باسیشە، بابەتی داهاتوومان ئاڵقەی حەوتەم‌و کۆتایی ئەم زنجیرە باسەمانە.



## ئاڵقەی حەوتەم:

## لە بواری تەبایی و پێکەوەژیاندا

**خوێنەری بەڕێز!**

**ئەم باسەمان - هەروەها باسی داهـاتووو هـی دوایشـی- ئاڵقـەی حەوتـەمو کۆتاییە لەبابەتی پێکەوە بەراوردکردنی تـەوژمی ئیسـلامیی‌و عـەلمانیی، خـوا یاربێ هەوڵدەدەین بەشێوەیەکی پوختو گوشراو، بۆچوونو هەڵوێستی هەرکام لە ئیسلامو عەلمانییەتی تێدا بخەینە ڕوو، لەبارەی تەبایی‌و پێکەوە ژیـان (التسـامح والتعایش)ەوە.**

**سەرەتا بەپێویستی دەزانم تیشك بخەینە سەر چەمك‌و واتاو گرنگی‌و پێویستی تەبایی‌و پێکەوە ژیان:**

# چەمك و واتاو گرنگیی تەبایی و پێکەوەژیان

مەبەستمان لە (تەبایی) ئەوەیە،کەتاکەکانو پێکهاتەکانی کۆمەڵو کۆمەڵگایەك پێکەوە گونجاوو ڕێكو پێك بنو هاوکارو دەستبارگری یەکدی بنو، لەسەر بناغەی دۆستایەتییەکی هەڵقوڵاو لەڕێز لەیەکدی گرتنو بەزەیی پێکدا هاتنەوەو بۆ یەك بەپەرۆش بوون، پێکەوە مامەڵە بکەن.

مەبەستیشمان لە (پێکەوە ژیان) ئەوەیە،کەپێکهاتەکانی کۆمەڵگایەك بەشێوەیەکی ئاشتییانەو بەتەبایی پێکەوە بژینو، لەسەر بناغەی یەکدی تەحەمولکردنو جیاوازییەکانی یەکدی سەلماندنو مافی (بوونو ژین)ی یەکسانو وەك یەك بە یەکدی ڕەوا بینین، ڕیزەکانیان پێکەوە جۆش بدەنو کۆمەڵگایەکی تۆکمەو شادو بەختەوەر بنیات بنێن.

گرنگیی و پێویستیی تەبایی و پێکەوە ژیانیش بۆ هەر کۆمەڵو کۆمەڵگایەك گەورە بێ یان بچووك، لەوەدایە، کە جێگرەوە (بدیل)ی تەبایی و پێکەوە ژیان، جگە لەناکۆکیی و دووبەرەکیی و شەڕو ئاژاوە شتێکی دیکە نیە، دیارە هیچ کاتێکیش کۆمەڵگایەکی پێکەوە ناکۆكو نا تەبا، ناتوانێ تۆکمەو توندو تۆڵ بێتو ئاشتیی و بەختەوەریی تێدا سەقامگیر بێت، ئاشکراشە،کەئاشتیی و هێمنیی و ئاسایش، مەرجێکی گەورەو سەرەکی گەشەکردنو بەرەو پێشچوونی هەر کۆمەڵگایەکەو، بەپێچەوانەوە ئاشووبو ئاژاوە، کۆسپو لەمپەرێکی گەورەو بێڕەزایە لەبەردەم هەموو خێرو خۆشییەکدا، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ لەکاتی ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییەدا، کە: سپڵەیی و بێ نمەکیی بەرانبەر بە چاکەو نیعمەتەکانی خوا شتێکی زۆر خراپە، وڵاتو ئاوەدانییەکمان بۆ بەنموونە دێنێتەوە کە خەڵکەکەی پێشتر لە هێمنیی و ئاسایشو ئاشتیی بەرخوردار بووەو لەڕووی ژیانو گوزەرانی ماددییشەوە تێرو پڕ بووە، بەڵام بەهۆی سپڵەیی و بێ وەفاییانەوە بەرانبەر بەخوا ﷻ و چاکەو نیعمەتەکانی، خۆیان گیرۆدەی سزاو تۆڵەی دادگەرانەی

خوا کردوە، کەلە برسیەتی‌و قات‌و قڕیی‌و ترس‌و بیم‌و نا ئارامییـدا، بەرجەسـتە بــووە، وەك فەرموویــەتی: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا قَرۡيَةٗ كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا مِّن كُلِّ مَكَانٖ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾ (النحـل: ١١٢)، واتە: خوا وێنەی بە وڵاتێك هێنایەوە - بۆ خستنە ڕووی یەکێك لەیاساکانی خـۆی- کـە پـڕ هێمنیـی‌و ئاسـایش بـوو، لـە هەموولایەکەوە بە فراوانـی بـژێوی بـۆ دەهـات، کەچـی سـپڵەیی بەرانبـەر بـە نیعمەتەکانی خوا کرد، خواش برسیەتی‌و ترس‌و بیمی پێ چێژتن‌و وەك پۆشـاکێك پێیانەوە نووسا، لە سۆنگەی ئەوەوە،کەدەیانکرد! دیـارە لـەم ئایەتـە قوڕئانییـە بەپێزەش دەفامرێتەوە، کە گەورەترین بەڵاو کۆست،کە بەسەر گەڵو کۆمەڵگایەك بێ ئەوەیە،کەدووچاری گرانیی‌و قات‌و قڕیی‌و ترس‌و بیم‌و دڵـەڕاوکێ‌و نـاهێمنیی بین.

بەڵێ، هیچ کۆمەڵگایەك بەبێ ئاشتی‌و ئاسایش هیچی بۆ هیـ ناکرێ‌و، بەهیـ کام‌و مورادێك ناگات‌و، هەمیشەش ئاشتی‌و ئاسایش زادەو بەرهـەمی تـەبایی‌و پێکەوە ژیانەو، بـە پێچەوانەشـەوە ئاشـووب‌و ئـاژاوەو دوو بـەرەکی، زادەی نـا تەبایی‌و یەکدی نەخوێندنەوەو خۆ بەسەریەکدیدا فەرز کـردن‌و مـل لەبـەر ملـی یەکدی نانە!

# دیدو هەڵوێستی سیكۆلاریزم لەبارەی تەبایی و پێكەوەژیانەوە

جا ئێستا با سەرەتا سەرنجێكی سیكۆلاریزم بدەین، داخۆ چۆن چۆنی دەڕوانێتە مەسەلەی (تەبایی‌و پێكەوە ژیان)و هەڵوێستی لەبەرانبەریدا چۆنەو، دواتریش دیدو بۆچونو هەڵوێستی ئیسلام لەو بارەوە دەخەینە ڕوو:

وەك چەند جارێكی دیكەش - لەم زنجیرە باسەدا- ئاماژەمان بۆ كردوە، پەنا بردنی خەڵكی ئەورووپا بە سیكۆلاریزم، زیاتر بەرهەمی كاردانەوە بوو، نەك بیركردنەوەو ڕامان، جا ئەم مەسەلەیە لەبواری سەرهەڵدانی حاڵەتی تەبایی‌و پێكەوە ژیان (التسامح والتعایش) لە ڕۆژئاوادا زۆر جوان دیارو درەوشاوەیە، بابزانین چۆن؟ یەكێك لە لێكۆڵەرەوان لەژێر ناوونیشانی: (جەنگە ئایینی یەكانو چارەسەری عەلمانیی)دا نووسیەتی: ((ئەورووپا بەدرێژایی سەدو سی (١٣٠) ساڵی نەپساوە (١٥٥٩-١٦٨٩) واتە هەرلەكاتی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی پرۆتستانتییەوە لەباكووری ئەورووپاداو پەلهاوێشتنی بەرەو نێوەڕاست، كۆمەڵێك گێچەڵو ئاشووبی سیاسیی‌و جەنگی ئایینی ترسناكی تێدا هاتنە دی، بۆ وێنە: فەڕەنسا جەنگە ئایینی یەكانی دەوری سی‌و شەش (٣٦) ساڵ درێژەیان كێشا (١٥٦٢-١٥٩٨)، بەرلەوەی لەسەدەی حەڤدەشدا جارێكی دی دووبارە هەڵگیرسێتەوە، كە ژمارەیەكی زۆر كوشتنو وێرانكاریی‌و تۆڵەی بەرانبەر لەسەر یەك كەڵەكەبووی لەنێوان (كاثۆلیك)و پێڕی (پرۆتستانتی كالڤینی)دا بەجێ هێشت! هەروەها جەنگی ئایینی لە ئەڵمانیاش لەساڵی (١٦١٨) تا (١٦٤٨)، كە ئەو كاتە بەجەنگی سی ساڵە ناسرابوو درێژەی كێشا، هەروەها لەهەركام لە بەریتانیاو ئەسپانیاو نەمساو زۆربەی وڵاتانی دیكەی ڕۆژئاواش، ئەو جۆرە جەنگو كوشتارانە هەبوونو، بەمجۆرە جووڵانەوەی پرۆتستانتی كالڤینی، لەماوەی كەمتر لە

سی (٣٠) ساڵدا، توانی هەرکام لە سکۆتلەنداو باکووری وڵاتـانی ئەسـکندنافیی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، بەشێوەیەکی کاتییش لە بەریتانیا جڵەوی حـوکمڕانیی بەدەستەوە بگرێ، هەروەها لەهەرکام لە فەڕەنساو ئەڵمانیاو پۆڵۆنیاو هەنگاریاشدا چەند هەوڵێکی لەو بوارەدا دا، دیارە لەبەرانبەریشدا کڵێسای کـاثـۆلیکـی هـەر لەنێوە ڕاستی سەدەی شازدەوە، هەتا نێوەڕاستی سەدەی حەڤدە، زۆر هەوڵی بـێ وچانیدا، بۆ گێڕانەوەی یەکیەتی مەسیحی بۆ ژێر ڕکێفی پاپـاو، لـەو پێناوەشـدا درێغی نەکرد لە هۆکارو شێوازی وا لـە کوشـتنو تۆڵـەو ئەشـکەنجەدان، کـە لـە حەژمەتانی منداڵی شیرە خۆرە سەری سپی دەبێ!

ئیدی سەرەنجام ئەوە ڕوویدا، کە دواتر بەکوشتارو ئەشـکەنجەدانی دادگاکـانی پشکنین (محاكم التفتيش) ناسراوە... بەڵام سەرەنجام ئەو هەمـوو کوشـتارو زەبـرو زەنگەی کاثۆلیەکان، نەك هەر نەیتوانی ئەو لێکترازانەی کڵێسا چارەسەر بکاتو بەری پێ بگـرێ، بـەڵکو بەپێچـەوانەوە لێـك تـرازانو دووبەرەکێیەکـەی نێـوان پرۆتستانتو کاثـۆلیك قووڵترو فراوانتر بـوو، هـەتا سـەرجەم ئاسـتەکانی ژیـانی سیاسییو کۆمەڵایەتیی خەڵکی ئەورووپای گرتەوەو، شۆڕبۆوە بـۆ نێـو سـەرجەم شارو لادێو تیرەو بنەماڵەکان! ئنجا لەگەرمەو گێژاوی ئەم کێشمە کێشو شەڕو کوشتارە ئایینییەدا، بیرۆکەی پێکەوە ژیانو لەیەك بـوردنو پێکـەوە تـەبابوون، لەدایك بوو، ئەویش بەلەیەك جیا کردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەتو دوور خستنەوەی ئایین لەژین!

## پوختەی قسان:

سیکۆلاریزمی سیاسیی کە بریتی بوو لە: (لەیەك جیا کردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت) زیاتر هەنگاوو هەوڵێکی ناچارییو چارەسەرییانە بوو، نەك هەڵبژاردنێکی ئیدۆلۆژییانە، وەبۆیە پەنای پێ برا تاکو ببێتە هەتوانو چارەسەری ئەو هەموو برینو زامانەی کە شەڕو کوشتاری ئاینییانەی نێوان پێڕو تاقمە نەصرانییەکان لەجەستەی خەڵکی وڵاتانی ئەورووپادا پەیدێی کردبوون)[1]!...

لەمەوە کەرابرد بۆمان دەردەکەوێ کە یەکێك لەهاندەرە گەورەو کاریگەرەکانی پەنا بردنی خەڵکی ئەورووپا بە سیکۆلاریزم، بریتی بووە لە خۆ دەربازکردنیان لەوشەڕو هەراو جەنگو کوشتارانەی کە ئاگرەکەی لە ڕیشی ئایینی شێوێنراوی نەصرانییو دامو دەزگا دوا کەوتووەکانی کڵێساوە هەڵساوە! بۆیە ،ئەگەربڵێین: (عەلمانییەت دەرمانو چارەسەرێکی ناچاریی یانەی ڕۆژئاوایی یەکانە بۆ چەند دەردو نەخۆشی یەکی ڕۆژئاوایی یانە) شتێکی زۆر ڕاستو پڕ بەپێستی واقیعمان گوتوە.

ئەوە لەبارەی چۆنیەتی پەنا پێ برانی سیکۆلاریزمەوە لەلایەن خەڵکی ئەورووپاوە بۆ دەرباز بوون لە دێوەزمەی شەڕو کوشتاری نێوخۆو پەیدا کردنی ڕێچارەیەك بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتیو ئارامییو ئاسایشو، سەرەنجام هێنانەدی کەشو هەوایەکی وا کەتەباییو پێکەوە ژیان بەرقەرار بکات، بەڵام:

یەکەم: ئەو تەباییو پێکەوە ژیانە تەنیا زادەو بەرهەمو بەری درەختی سیکۆلاریزم نیە، بەڵکو کۆمەڵێك هۆکاری دیکەش ڕۆڵیان لە هێنانەدیدا گێراوە، کە گرنکترینیان پەندو عیبرەت وەرگرتنی ڕۆژئاواییەکانە لەوهەموو زەرەرو زیانانەی کە بەهۆی جەنگو شەڕو کوشتارەوە لێیان کەوتوە، ئەگەرنا ،ئەگەرهاتباو

---

(١) بڕوانە: (الدين والسياسة في الغرب الحديث) د. رفيق عبدالسلام، له (المجلة العلمية للمجلس الأوروبي للأفتاء والبحوث)دا، العدد: ١٠،١١، الجزء الاول ص ٤٤٤-٤٤٦.

بەرقەرار بوونی ئاشتیی و تەبایی و پێکەوە ژیان، زادەو بەرهەمی سیکۆلاریزم بوایە، دەبوو هەر لەسەرەتاوە، لەوڕۆژەوە کە وڵاتانی ڕۆژئـاوا ئـەو ئایینـەیان تەبـەننی دەکرد، ئەو بەرهەم و شوێنەوارەی لێ پەیدا ببوایە.

دووەم: هەرچەندە خەڵکی ڕۆژئاوا، پاش هەڵبژاردنی ئـایینی سـیکۆلاریزم بـە بەرنامەو ڕێبازی ژیانیان، درەنگ یان زوو لەنێو خۆیاندا تا ڕاددەیەك دەستبەرداری دەمارگیریی ئایینی (التّعصب الـديني) بـوون، بـەڵام ئـەو ئایینـە بەشـەرییەیان نـەیتوانی ڕێیـان لێ بگـرێ لـە چـەندان جـۆرە دەمـارگیریی دیکـە، بەتایبـەت دەمارگیریی نەتەوەیی (التّعصب القومـي)، کە هۆکـاری هەڵگیرسـانی هـەردووك جەنگییەکەم و دووەمی جیهانی بوو، کە سووتەمەنییەکەیان دەیان ملیۆن کەسـی ڕۆژئاوایی و خەڵکی دیکەش بوو! ئنجا ئەوە هەمووی بۆ سـیکۆلاریزم لـە زێـدی خۆیدا، بـەڵام کاتێـك لـەو بازنەیـە دێینـەدەرێ و سـەرنجی پـەرێزو شـوێنەواری سکۆلاریزم و سیکۆلاریستەکانی وڵاتانی ئیسلامیی دەدەین، ئەوە بەدەگمەن نەبێ لەسەر ئەرزی واقیع هیچ کام لە دروشمە بەتێوریی بەرزکراوەکانی، وەك:

مافەکانی مرۆڤـــ (human rights).

ئازادیی بیرورا (freedom of expression).

دەنگ و ڕەنگی جیا جیا (التعدّدية)(pluralism).

مافەکانی هاوڵاتێتی (citizen rights).

لەهەڵس و کەوت و ڕەفتاری حیزب و ڕژێمە سیکۆلاریسـتەکاندا بـە بەرجەسـتە کراویی نابینین و، بە پێچەوانەوە لـە جیـاتی ئـەوە: پێشـێل کردنـی کەرامـەت و مافەکانی مرۆڤـــو، زەوتکردنی ئازادییەکان و، دیکتاتۆریی و، یەکدەنگ و ڕەنگ کردنی خەڵك بەزەبری ترس و تەماع و، پۆلێن کردنی نەیارەکانی حیزبی حوکمڕان - بەتایبەت ،ئەگەرئیسلامیی بن- بۆ هاووڵاتی پلە دووو سێ، زۆر بەزەقی دەبینین! ئێستاش بەرلەوەی کۆتایی بەخستنە ڕووی دیـدو هەڵوێسـتی سـیکۆلاریزم بێـنین لەمەڕ مەسـەلەی (تـەبایی و پێکـەوە ژیـان) یـان (سـینگ فراوانیـی و پێکـەوە

مەدارکردن)دا، بەپێویستی دەزانم سەرنجی خوێنەری بەڕێز بۆ دوو ڕاستییان رابکێشم:

یەك: هەڵوێستی سیکۆلاریزم لە زێدی سەرهەڵدانیدا لەبەرانبەر نەصرانییەت دا دوو جۆر بوو:

١- هەڵوێستێکی پەڕگیرانەی توندڕەوانە: کە لەسیاسەت‌و ڕەفتاری هەرکام لە دەوڵەتی فەڕەنساو، ڕژێمە کۆمۆنیستەکاندا بەگشتیی خۆی دەنواند، دەوڵەت هەر بەوەندە لێنەدەگەرا کە ئایینی نەصرانیی بێهێزبکات‌و لە کونجی کڵێساکانی بئاخنێ! بەڵکو زۆر شێلگیرانەش کاری لەسەر ئەوە دەکرد کە بەرنامەکانی خوێندن‌و ڕۆشنبیریی‌و کلتوور، لەهەموو جۆرە کاریگەریی یەکی ئایین پاك بکاتەوو گیانی بێ بڕوایی‌و ئیلحاد بەبەر هەموو شتێك دا بکات‌و، بەهەموو شێوەیەك دنیا بینیی ماددیگەریی یانەو، بەهاو ڕەفتارو ئاکارە لێهەڵقوڵیوەکانی، وەك کاڵایەك بەبەر باڵێی سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگادا بکات.

٢- هەڵوێستێکی نەرم‌و خۆگونجێنەرو هاوسەنگانە: وەك ئێستاکە لە بەریتانیاو ئیطاڵیاو ئیرلەنداو یۆنان‌و تا ڕاددەیەك ئەمریکاشدا باوە، کە دەوڵەت جۆرە پەیوەندییەکی بە کڵێساوە هەیەو، دەرفەتی پێدەدات،کە لە کەش‌و هەوێی فیکریی‌و کۆمەڵایەتی‌و ژیانی سیاسییدا ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، بە تایبەت لەبواری جەم‌و جۆڵ‌و چالاکی ڕێکخراوە مەدەنییەکان‌و خێرخوازەکاندا، هەڵبەتە لەدەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هاتوە کە کڵێساو دەوڵەت لە یەك جیان! بەڵام بەکردەوە ئایین لە ژیانی فیکریی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتی ئەمریکایی یەکاندا ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێ[1]!

---

(١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٤٥٢،٤٥٣،٤٥٤.

دوو: هەرچەندە سیکۆلاریزم لەبارەی تەبایی‌و پێکەوە ژیانەوە هەڵوێستێکی ڕوون‌و بێ چەندو چوون‌و چوارچێوە بۆ داڕێژراوو دیاریکراوی نیە، بـەڵام پێشـم وایـە ستەم لە سیکۆلاریزم دەکەین ،ئەگـەربێت‌و هـەموو ئـەو سـتەم‌و بێـدادیی‌و دەمارگیریی‌و گەندەڵیی‌و پۆخەڵییەی لە حیـزب‌و ڕژێمـە سیکۆلاریسـتەکاندا دەبینرێ، بیخەینە ئەستۆی ئەو ئایینە یانەوە کە لافی شوێنکەوتنی لێدەدەن! بەڵکو ڕاست‌و هەق ئەوەیە،کەزۆرێك لـەو ڕەفتـارو هـەڵس‌و کەوتـە قـەڵب‌و ناشیرین‌و بێ سەرەوبەرانەیان زادەو هەڵقوڵاوی میزاج‌و سروشتی پیس‌و بـەدو نیازو مەبەستی گڵاوی خۆیانە، بـەڵام گرفـت ئەوەیە،کەسـیکۆلاریزم توانـای دەستگرتنییان‌و ،تەنانەت توانای ئیدانەو مەحکووم کردنیشیانی نیە، لەسـەر بناغەیەکی پتەوو بەگوێرەی پێوەرو تەرازوویەکی وردو ڕوون!

خوا یاربێ لە باسیداهاتووشدا دیـدو هەڵوێسـتی ئیسـلام لـەبارەی تـەبایی‌و پێکەوە ژیانەوە دەخەینە ڕوو.

# دیدو هەڵوێستی ئیسلام
# لەبارەی تەبایی و پێکەوە ژیانەوە(١)

خوێنەری بەڕێز!

دوای ئەوەی لەباسی پێشوودا دیدو هەڵوێستی سیکۆلاریزمان لەبارەی مەسەلەی تەبایی‌و پێکەوە ژیانەوە خستە ڕوو، لەم باسەمان‌و باسی دواتریشدا کە دوایین باسی سەرجەم باسەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەمانە، دیدو هەڵوێستی ئیسلام لەو بارەوە دەخەینەڕوو، ئەویش لە دوو خاڵاندا، کە یەکەمیان تەرخان دەکەین بۆ ڕوونکردنەوەی بنەماکانی تەبایی‌و پێکەوە ژیان لە ئیسلام دا، وە لە دووەمیشیاندا وەڵامی چەند ئیشکالێك دەدەینەوەو چەند گرێکوێرەیەك دەکەینەوە کە بوونەتە مایەی دوو دڵی هەندێك کەس لەو بوارەدا.

<u>خاڵی یەکەم</u>: بنەماکانی تەبایی وپێکەوە ژیان لە ئیسلام دا

سەرەتا دەڵێین: ئیسلام وەك دوایین ئایین‌و بەرنامەی خوا ﷻ بۆ ڕێ پیشاندانی ئینسان‌و ڕێکخستنی ژیان‌و گوزەرانی، هەتا ئەو پەڕی سنوور بڕواو قەناعەتی بەوە هەیە، کە پێویستە مرۆڤەکان چ لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی بەگشتیی‌و لەسەر ئاستی هەرکام لە کۆمەڵگایەکان، پێکەوە تەباو گونجاوبن‌و، ژیانێکی هێمنانەو ئاشتییانە پێکەوە بەسەربەرن، تاکو هەموویان بواری تاقیکرانەوەو جێنشینایەتی کردنی خوایان بە باشترین شێوە بۆ بڕەخسێ.

---

(١) ستایش بۆ خوا بەشی یەکەمی کتێبی: (چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا) بە ناوونیشانی: (تەبایی و پێکەوەژیان) بۆ توێژینەوەی ئەم بابەتە تەرخان کراوە، بڕوانە چاپی یەکەم/ ٢٠١٠، کە سەرجەم شازدە بنەمای گرنگمان لە قورئان هەڵێنجاون، بۆ تەبایی و پێکەوەژیانی مرۆڤەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

ئنجا با سەرنج بدەینداخۆ ئیسلام چ بناغەیەکی بـۆ هەڵچـنینی دیـواری ئـەم ئامانجە گەورەو گرنگە داناوەو، ئەو بنەمایانە چین کە ڕەچاوی کردوون بۆ بنیاتنانو پارێزگاریی لێکردنی تـەبایی‌و پێکـەوە ژیـانی مرۆڤــەکان، چ لەسـەر ئاسـتی مرۆڤـایەتی بەگشتیی‌و چ لەچوارچێوەی کۆمەڵگایەکی دیاریکراویشدا:

١- خوا ﷻ تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوەو، مرۆڤــەکان تێکرا دروستکراوو پەروەردەکراوو بەندەی وین، بەبێ ئیمتیازو جیاوازیی:

دیارە لەوبارەوە کەبێجگە لە خوا ﷻ هیچ کەسی دیکە بەدیهێنـەرو خـاوەنو پەروەردگارو پەرستراوی شایستەو بەهـەقی مرۆڤــەکان نیـەو، مرۆڤـــەکانیش هەموویان لەو بارەوە وەك یەكو یەکسانن، دەقی قورئانو سوننەت زۆر زۆرن، بۆ نموونــە: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ (غافر: ٦١،٦٢).

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە شەوگاری بۆ گێراون بەمایەی ئیسراحەت تێدا کردنو ڕۆژگاریشی ڕووناك کردوە -تاکو کارو کاسبی تێدا بکەن- بێگومان خـوا خـاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بـەڵام زۆربـەی خـەڵکی ناسپاسـن. ئائـەو خوایـەتان پەروەردگارتانە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە جگە لەوی هیچ پەرستراو نین، بەرەو کوێ لادەدرێن؟!

ئنجا دیارە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنو پەرسـتراو بـوونی خـوا -تبـارك وتعالى- بۆ هەموو مرۆڤــەکان بەبێ جیاوازیو، یەکسان بوونو وەك یەك بوونیان لە دروستکراوێتیو بەندایەتیدا، بەردی بناغەی تەبایی‌و ئاشتیو پێکەوە ژیانێکی هێمنانەو دۆستانەیە، چونکە بێگومان سەرجەم شەڕو هەراو تێکگیرانو ملبەملەی مرۆڤــەکان لە هەموو ئاستەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ دەمـارگیریی‌و خۆپەسـندیی‌و خۆبەزلگریی‌و ئیمتیاز بۆ خۆدانانی هەندێکیان بەسەر ئەوانی دیکەیاندا.

٢- مرۆڤــەكان جێنشینی خوان لەسەر زەوی‌و خوا ڕێزی لەهەموویان گرتوە بێ جیاوازیی:

وەك فەرمووییــــــــەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً...﴾ (البقرة:٣٠)، واتە: وەیاد بكەوە كاتێك پەروەردگارت بەفریشتەكانی فەرموو، مــن جێنشینێك لەسەر زەویدادەنێم...

هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ...﴾ (الإســراء: ٧٠)، واتــە: وە بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە...

لە كاتێكیشدا جەنازەیەكیان بەلای پێغەمبــەری خــوا ﷺ دا هێنــا لەبــەری هەڵسا، جا كاتێك پیێ ی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە تەرمی جوولەكەیەكە! فەرمووی: {أَلَيْسَتْ نَفْساً؟!} (رواه مسلم)، واتە: ئەدی هەر نەفس نیە؟!

٣- مرۆڤــایەتی لەیەك خێزان (أسرة)ەوە هاتوەو بە مەبەستی ئاشنایی‌و هاوكاریی پێكەوەكردن بۆ چەند گەل‌و تیرەیەك دابەش كراوە:

وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ...﴾ (الحجرات: ١٣)، واتە: ئەی خەڵكینە! ئێمە ئێوەمــان لــە نێرو مییەك وەدی هێناوەو گێراومانن بە چەند گەل‌و تیرەیەك تــاكو پێــك ئاشــن بن..

كەواتە: هیچ كەس‌و هیچ گەل‌و تیرەو بنەماڵەیەك بــۆی نیــە بــەهیچ بیــانوو پاساوێكەوە، خۆی بەسەر كەس‌و بنەماڵەو تیرەو گەلێكی دیكەدا هەڵكێشێ‌و خۆی پێ چاكترو بەرزتر بێت. هەر بۆیەش كاتێك پێغەمبــەری خــوا ﷺ بیســتی كــە (أبوذر الغفاري) بە (بلال الحبشي) خوا لێیان ڕازی بێ، گوتوە: (یا ابن السَّوداء!) واتە: ئەی كوڕی ئافرەتێكی ڕەش! تووڕە بووو بەسەرزەنشتكردنەوە بە (أبــوذر)ی فەرموو: {إنك امرؤ فيك جاهليــة!} (رواه البخــاري ومسـلم)، واتــە: بێگومــان تــۆ بابایەكی نەفامیێتییت تێدایە! هەروەها پێغەمبەری خــوا ﷺ لــەبارەی یەكســان بوونی مرۆڤــەكانەوە لە یەكێك لە وتارەكانی حەجی ماڵئاوایی (حجة الـوداع)دا

فەرموویەتی: {ياأيها الناس ألا إنّ ربكم واحد وأن أباكم واحد، لافَضْل لعربيّ على عَجَميّ ٍ ولا لعجميّ ٍ على عربيّ ولا لأحْمرَ على أسود ولا لأسود على أحْمَر الاّ بالتّقْوى} (رواه أحمد). واتە: هۆ خەڵکینە! ئاگادار بن یەك پەروەردگارتان هەیەو یەك بابتان هەیە! نە عەرەب لە غەیرە عەرەبو نە غەیرە عەرەب لە عەرەب، وەنەسپی پێست لە ڕەش پێستو، نە ڕەش پێست لەسپی پێست چاکتر نیە، مەگەر بە پارێزکاریی.

٤- ژیانی دنیا شوێنی تێدا تاقیکرانەوەی مرۆڤەکانە:

وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾ (الملك: ٢)، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە مردنو ژیانی هێناوەتەدی تاکو تاقییتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەی باشترە، وە ئەو زاڵی لێبوردەیە.

شایانی باسیشە،کەئەنجامی تاقیکرانەوەی مرۆڤەکان لە ژیانی دنیادا، لە ڕۆژی دواییدا وەردەگیرێتەوە، وەك خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ ...﴾ (آل عمران: ١٨٥)، واتە: هەموو کەس مردن دەچێژێ وەتەنیا لە قیامەتیش پاداشتەکانتان دەدرێتەوە...

کەواتە: هیچ کەس بە هیچ پاساوێکەوە بۆی نیە کە:

أ- ڕێی تاقیکرانەوەیەکی ئازادانە لە هیچ کەس بگرێو جۆرە وەڵامدانەوەیەکی دیاری کراوی لەسەر فەرزبکات، بەڵکو هەموو مرۆڤێك ئازادو سەربەستە لە چۆنیەتی ئیمتیحانداندا جۆری وەڵامدانەوەی پرسیارەکاندا، وەك دواتریش دەیخەینەڕوو.

ب- تەسفیەی حیساب لەگەڵ هیچ کەس دا بکات لەسەر جۆرو چۆنیەتی ئەو ئایینو ڕێبازەی هەڵیدەبژێرێ، چونکە ئەوە تەنیاو تەنیا هەقی خوای پەروەردگارە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾

(الغاشية:٢٥،٢٦)، واتە: بێگومان گەڕانەوەیان تەنیا بۆلێی ئێمەیەو، لێپرسینەوەشیان بەس عایدی ئێمەیە.

٥- مادام ئیسلام تاقە ئایینو بەرنامەی پەسندکراوی خوابێ بۆ هەموو بەشەر، کەواتە دەبێ هەموویان بتوانن لەژێر سایەیدا ژیانێکی ئازادانەی بەڕێز بگوزەرێنن:

خوا ﷻ لەو بارەوە کە تەنیا (ئیسلام)ی بە بەرنامەو ئایینی ژیانو گوزەرانی مرۆڤەکان لەلا پەسندو قبووڵە، فەرموویەتی: ﴿..وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ...﴾ (المائدة: ٣)، واتە: وە ئیسلام بە بەرنامە بۆ پەسند کردوون...، هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ...﴾ (آل عمران: ١٩)، واتە: بێگومان بەرنامە لەلێی خوا بەس ئیسلامە...، ئاشکراشە،کەمەبەست لە (بەرنامە) لێرەدا بەرنامەی ڕاستو پەسندو شایستەی لێی خوایە، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (آل عمران: ٨٥)، واتە: وە هەرکەس جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، لێی وەرناگیرێ وە لەدوا ڕۆژیشدا لە زیانبارانە. بەڵێ، مادام ئایینو بەرنامەی ڕاستو شایستە لەلێی خوا بەس ئیسلام بێ، وەخواش تێکڕای مرۆڤەکانی بۆ ئەوە دروست کردبن کە تاقییان بکاتەوە لە ژیانی سەر زەویدا، کەواتە: دەبێ تێکڕای مرۆڤەکان بتوانن لەژێر سایەی قەوارەو دەوڵەتێکدا،کە لەسەر بناغەو بۆ پیادە کردنی ئەو ئایینو بەرنامەیە پێك دێ، ژیانێکی ئازادانەو پڕ حورمەتو ڕێزانەی وا بگوزەرێنن، کە شیاوی مرۆڤانێك بێ کە خوا بە جێنشینی خۆیداناونو حورمەتو ڕێزی لێناون.

٦- پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ﷺ خوا نازناوی (رحمة للعالمين)ی پێداوە، بۆیە دەبێ تێکڕای خەڵکی جیهان لە فەڕو بەرەکەتی خۆیو بەرنامەکەی بەهرەمەندبن:

بەڵێ، (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵێی کوڕی عەبدولمطەلیب) ﷺ کە خوا کردوویەتی بە کۆتا ڕەوانە کراوی خۆیو هەڵگری دوایین پەیامو بەرنامەی خۆی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ...﴾ (الأحزاب: ٤٠)، واتە: موحەممەد بابی هیچکام

لە پیاوانتان نیە بەڵكو ڕەوانە كراوی خواو كۆتـایی پێغەمبەرانـە، خـوا ﷻ بـە (بەزەیی خوا بۆ تێكڕای جیهانیـان) پێناسـەی كـردوە، وەك فەرمووییـەتی: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ (الأنبياء: ١٠٧)، واتە: وە تۆمان تەنیا بۆ ئەوە ڕەوانە كردوە كە بەزەیی بی بۆ تێكڕای جیهانییان، ئنجا هیچ گومانیشی تێدا نیـە كـە (ڕەحمەت بوون)ی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو بەشـەر كاتێـك دێتـەدی، كـە تێكڕای مرۆڤـەكان بتوانن ژیانێكی مرۆڤـانە لەژێر سایەی ئایینو بەرنامەكەیدا ببەنەسەر، وە پێغەمبەری خوا خاوەنی ئەو پەڕی سـۆزو بـەزەییو پـەرۆش بـووە بەرانبەر نەك تەنیا مسوڵمانانو مرۆڤـەكان، بەڵكو سەرجەم دروستكراوانی خوا، لەو بارەشەوە فەرمایشت زۆرن بۆ نموونە، فەرمووییەتی:

* {مَنْ لاَيَرحَمْ لاَيُرْحَمْ} (متفق عليه)، واتە: هەركەس بەزەیی نـەنوێنێ، بـەزەیی بەرانبەر نانوێنرێ.
* {الراحمون يرحمهم الرحمن، إرحموا من في الأرض يرحمكم مَـنْ في السّماء} (رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح)، واتە: بەڕەحمان خوای بە بەزەیی ڕەحمیان پـێ دەكات، بەزەییتان بە خەڵكی سەر زەویدا بێتەوە، ئەوەی لـە ئاسمانـە بـەزەیی پێتان دێ.
* پێغەمبەری خوا ﷺ رایگەیاندوە كە ئافرەتێك بەهۆی حەپس كردنو برسـیو تینوو كردنی پشـیلەیەكەوە هـەتا مـردن، چـۆتە دۆزەخـەوەو،[1] ئـافرەتێكی خراپەكاریش لە سۆنگەی بەزەیی هاتنەوەی بە سەگێكی تینوو و ئاوپێدانیـدا، چۆتە بەهەشتەوە! وەك (بخاري و مسلم) گێراویاننەوە.[2]

٧- فشارو تۆبزیی كردن لە دینداریدا، ناڕەواو قەدەغەیە:

وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

---

(١) بخاری بە ژمارە: ٣٤٨٢ ومسلم بەژمارە: ٢٢٤٢، لە (ابن عمر)ەوە گێڕاویانەتەوە.

(٢) بخاری بە ژمارە: ٦٠٠٩ ومسلم بەژمارە: ٢٢٤٤، لە (ابوذر)ەوە گێڕاویانەتەوە.

* ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ...﴾ (البقرة: ٢٥٦)، واتە: تۆبزی کردن لە ئاییندانیە...

* ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ؟!﴾ (یونس: ٩٩)، واتە: وە،ئەگەرپەروەردگارت ویستبێی -زۆر لە خەڵك بکات- تێکڕای خەڵکی سەر زەوی هەموویان بڕوایان دێنا، دەجا ئایا تۆ خەڵکی ناچار دەکەی کە ببنە بڕوادار؟!

* ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ...﴾ (الكهف: ٢٩)، واتە: وەبڵێ هەق بەس لەلێی پەروەردگارتانە، جا کێ حەزدەکات بابڕوا بێنێ‌و کێش حەزدەکات بابێ بڕوابێ.

وەك لەم ئایەتە بە پێزانەوە دەردەکەوێ، خوای کاربەجێ نەیویستوە کە مرۆڤەکان ناچار بکات ئیمان بێنن، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات‌و سەرپشك بن لە نێوان هەڵبژاردنی ئیمان‌و کوفردا، تاکو دواییش لەدوارۆژدا لە بەرانبەر ئیمان‌و کوفرێك دا کە بەخواست‌و حەزی ئازادانەی خۆیان وەدەستیان هێناوە، شایستەی پاداشت‌و سزابن. شایانی باسیشە،کەئیمان چاکترین طاعەت‌و چاکەو، کوفریش خراپترین سەرپێچی‌و خراپەیە، جا ،ئەگەرخوا ﷻ خەڵك لەسەر ئیمان هێنان‌و کوفر نەکردن ناچار نەکات‌و سەرپشکیان بکات‌و ئازادیان بکات، دیارە لەسەر شتەکانی دیکەی، کە لەخوار وانەوەن، چاکتر ڕێ بە بەکارهێنانی فشارو ناچارکردن نادات.

٨- کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەم، کە لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ دامەزرا، وێڕای مسوڵمانان، هەرکام لە جوولەکەو هاوبەشدانەرو مونافیقەکانیش تێیدا بەشداربوون‌و، لە ئەرك‌و مافە سەرەکییەکانی هاووڵاتێتیدا (المواطنة)دا وەك یەك بوون:

بەڵێ، یەکەمین ئەزموونی حوکمڕانیی لە ئیسلام، کە لەکۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرجەستە بوو، بەشێوەیەکی پلۆرالیزمیی (تعدّدي) دەستی پێکرد، کە وێڕای مسوڵمانانی کۆچکەرو پشتیوان -

کە ئەوانیش بۆ چەندان تیرە دابەش دەبوون- سێ تیرەی سەرەکی جوولەکەکان (بنو النضیر، بنو قینقاع، بنو قریظة)و، ژمارەیەك لـە هاوبەشـدانەرەکان (مشـرکین)و کۆمـەڵێك لە مونافیقەکانیش تێدا بەشدار بوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ڕێکخسـتنو ئیـدارەکردنی ئـەو کۆمـەڵگاو دەوڵەتـە (صحیفة)ەیەکی نووسی، کە بە (وثیقة)ش ناوبراوەو، وەك دەستوورێك ناوونیشانو ئەركو مافەکانی هـەرکام لـە پێکهاتـەکانیو چۆنیەتی هەڵسوکـەوت پێکـەوە کردنیانو، چارەسـەرکردنی گرفـتو کێشـەکانیانی تێـدا ڕوون کـردەوە، شـایانی باسیشە،کەئەو (صحیفة)یە سەرجەم لە (٤٦) بڕگە پێکهاتوەو، هەموو ئەو بنەماو هێڵە گشتیی نەی، کە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو دەوڵـەتی ئیسـلامیی یەکـەم، کـە پایتەختەکەی شاری مەدینە بوو، پەکی لەسەریان کەوتبوو، ڕوون کرابوونەوە[1].

٩- دادگەریی‌و چاکەکاریی بناغـەی هەڵسوکەوتی مسوڵمانانە لە گەڵ غـەیری خۆیاندا، مادام دژی دینو ژینیان نەبن:

بۆ نموونە: خوا ﷻ فەرموویەتی:

* ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (المائدة: ٨)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەبەر خوا بەرنامە پیادە بکەنو دادگەرانە شایەدیی بدەن، با ڕق هەڵسانتتان لە کەسانێك واتان لێنەکات دادگەریی نەکەن، دادگەربن، ئەوە لە پاریزکارییەوە نزیکترەو پارێز لەخوا بکەن، بێگومـان خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن.

* ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ (الممتحنة: ٨)، واتە: کەسانێك، کە لەسەر

---

(١) بڕوانـە: (مجموعـة الوثـائق السياسـية) محمـد حميـدالله، ص٤١-٤٧، وە (السـيرة النبويـة الصحيحة) د. أكرم ضياء العمري، ص ٢٨٢-٢٨٥.

ئایین لەگەڵتان ناجەنگن‌و لەحاڵ‌و ماڵتان دەرتان ناکەن - لە ئەهلی کوفر- خوا لێی قەدەغە نەکردوون، کە لەگەڵیان چاکەکاربن‌و هاوکاریی مادییان بکەن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆش دەوێن.

دیارە من لێرەدا ڕستەی (وتُقْسِطوا اليهم)م بەوە تەفسیر کردوە، کە مەبەست پێی بەخشین‌و هاوکاریی مادییە، چونکە (أقْسَطَ) واتە: دادگەریی کرد، بەلاّم (أقْسَطَ اليه) واتە: (أعطاه قِسْطاً من مالِهِ) ئەندازەیەك لە سامانی خۆی پێدا.

کەواتە: مسولّمانان چ لەچوارچێوەی کۆمەڵگایەکی دیاریکراوداو، لەچوارچێوەی سەرجەم مرۆڤایەتیدا، پێویستە بناغەی مامەڵەو هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵ غەیری خۆیاندا -مادام دژی دین‌و ژینیان نەبن-، چاکەکاریی (بِرّ)و بەخشین‌و هاوکاریی (إقساط)بێت، بەواتایەکی دیکە چ لەڕووی مەعنەوییەوە ،چ لەڕووی مادییەوە، لەگەڵیان تەباو چاکەکارو هاوکارو دەستبارگربن.

١٠- سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستە شەش شتە پێویستەکانیان کە: (دین‌و ژین‌و وەچەو سامان‌و ئاسایش‌و ئابڕوو)ن، بۆ دابین بکرێن: بەڵێ، سەرجەم هاوولاّتیان (المواطنين) نێو کۆمەڵگای ئیسلامیی‌و ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی، هەقی خۆیانەو لەسەر دەوڵەت‌و دام‌و دەزگاکانی پێویستە، کە زۆر بەجیددیی بەتەنگ (دین‌و ژین‌و وەچەو سامان‌و ئاسایش‌و ئابڕوو)ی یەك یەکی هاوولاّتیانەوە بێ‌و، ڕێ بەهیچ کەس‌و لایەنێك نەدات،کە دەستدرێژیی بکاتە سەر هیچ کام لەو مافە سەرەکی‌و بنەڕەتییانەی، کە بەبێ پارێزگاریی لێکردنیان هیچ مانایەك بۆ ژیانی مرۆڤانەو ژیانی ئازادانەو پڕ ڕێزو حورمەت نامێنێتەوە، دیارە ئیسلام کۆمەڵە هۆکارو میکانیزمێکی جۆراویشی ڕەچاوکردوون بۆ پاراستنی شەش شتە پێویستەکان (الضروريات الستة)ی یەك یەکی هاوولاّتیان بەبێ جیاوازیی، کە گرنگترینیان دانانی سزا (عقوبة)ی دنیایی یە بۆ هەرکەسێك ئەو قەدەغانە بشکێنێ، سزایەکانیش بەم جۆرەن:

١- بۆ پاراستنی ئایین: هەرچەندە ئیسلام بەگشتیی سزایەکی دیـاریکراوی بـۆ ئەوانە دانەناوە، کە دەسـتدرێژیی دەکەنـە سـەر ئـایینی خـەڵکی، چـونکە دەستدرێژیی کردنە سەر ئایین‌و عەقیدەی خەڵکی، زیاتر لە (زماندرێـژیی)دا خۆی دەنوێنێ! بەڵام ئیسلام مسوڵمانانی قەدەغەکردوە لە قسـە گـوتن بـە پەرستراوو پیرۆزییەکان (مقدّسات)ی خەڵکی دیکە، تاکو ئەوانیش ئەو قسـە پێگوتنە نەکەنە بیانووو پاساوی قسە گوتن بە خوا سبحانه وتعالی: ﴿وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ...﴾ (الأنعام (١٠٨)، دیارە دەشگونجێ دەوڵەتی ئیسلامیی سزای پڕ بەپێست‌و گونجاو بـۆ هـەموو ئەوانە دابنێ، کە بەدەر لەشێوازی عیلمییانـەو بابەتییانـە، قسـەی ساردو سووک بەئایین‌و عەقیدەو پیرۆزییەکانی خەڵکی دەڵێن.

کەواتە: شەریعەت سزایەکی تایبەتی داناوە بۆ پارێزگاریی لێکردنی (ئایین)ی هاووڵاتیان، بەڵام بێگومان دەسـتەڵاتی شـەرعیی دەسـتی واڵایـە لـەبواری سیاسەتی شەرعییدا، بۆ هەر ئیجرائاتێك، کە ژیان‌و گوزەران‌و بەرژەوەنـدی خەڵك‌و کۆمەڵگا بیخوازێ.(١)

٢- بۆ پاراستنی ژین: سزای تۆڵە (قصاص) بۆ هەرکەسێك بەناهـەق کەسـێك بکوژێ، دانراوە: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ...﴾ (البقرة: ١٧٩).

٣- بۆپاراستنی وەچەو کەرامەت: سزای سەد قەمچـی بـۆ هەرکەسـێك زینـا بکات، دانراوە:﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ...﴾ (النور:٢).

---

(١) لە ئاڵقەکانی (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی)دا، تویژینەوەیەکی خەست و خۆڵمـان لەبارەی ئازادیی بیروڕا دەربڕین و دینداریی یەوە کردوەو مەسەلەی هەڵگەڕانەوە (ارتداد)یشمان باش شیکردۆتەوەو ئەو ڕایەمان پەسند کردوە،کە ئیسلام سزایەکی دیاری کراوی بـۆ لـە ئـایین هەڵگەڕانەوە، دانەناوە، مەگەر وێڕای هەڵگەڕانەوە، سەنگەرگرتن و دژایەتیشی لەگەڵ بێ.

٤- بۆ پاراستنی سامان: سزای دەستبڕین بۆ بابای دز، دانراوە: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا ...﴾ (المائدة: ٣٨).

٥- بۆ پاراستنی ئاسایش: چوار جۆرە سزای: کوشتن‌و، هەڵواسین‌و، دەستی ڕاست‌و پێی چەپ بڕین‌و، نەفی کردن، بۆ هەرکەسێك هێمنیی‌و ئاسایشی خەڵکی بشێوێنێ، دانراوە: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ...﴾ (المائدة: ٣٣).

٦- بۆ پاراستنی ئابڕوو: سزای هەشتا قەمچی بۆ بابای بوختانچی، دانراوە: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُواْ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً ...﴾ (النور: ٤).

بەڵێ، ئیسلام لەسەر ئەم بناغەیەو بەپێی ئەم دە بنەمایە، باشترین تەبایی‌و چاکترین جۆری پێکەوە ژیان لە کۆمەڵگادا دێنێتەدی.

لە باسی داهاتووشدا خاڵی دووەمی ئەم بابەتە دەتوێژینەوەو کۆمەڵێك ئیشکاڵ‌و گرێکوێرە ،کە سەرو دڵی هەندێك کەسیان گرتوە، وێڕای وەڵامەکانی ن دەخەینەڕوو.

## خاڵی دووەم: چەند ئیشکاڵ و گرێ کوێرەیەك:

### ١- وشەی (أهل الذمّة)، بۆنی بەکەم سەیرکردنی لێ دێ:

شتێکی ئاشکرایە، کە لەفیقهی ئیسلامیی‌و مێژووی ئیسلامییدا، وشەی (أهل الذمّة) بۆ هەموو ئەو کەسانە بەکار هێنراوە لە نا مسوڵمانان، کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیاون، جا هەندێك کەس، کە باش لە چەمك‌و واتای وشەی (أهل الذمّة) حاڵی نەبوون، پێیان وایە، کە ئەم وشەیە بۆنی ژێر دەستەیی‌و زەبوونی لێدێ! ئێمەش لەو بارەوە دەڵێین:

أ- وشەی (أهل الذمّة) یانی: خاوەن بەڵێن‌و پەیمان، چونکە وشەی (الذمّة) لەزمانی عەرەبیدا بەمانای (الضّمان والعهد) بەکاردێ، مەبەست لەم

وشەیەش ئەوەیە،کەنامسوڵمانانێك، کە لەکۆمەڵگای ئیسلامییو لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، بەڵێنو پەیمانیان پێدراوە، کە پارێزگاریی لە ئایینو ژیانو سامانو ئابڕووو ئاسایشیان بکرێو، بەپێی بنچینەی باوی ئیسلامیی: (لهم مالنا وعليهم ما علينا) واتە: ئێمەی مسوڵمان چ مافێکمان هەیە ئەوانیش هەیانەو، چ ئەرکێکیشیان لەسەر شانە، ئەوانیش بە هەمان شێوە، مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ.

ب- وشەی ناوبراو خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەریان فەرز نەکردووین، کە بەکاری بێنین، بەڵکو ئەم وشەیە وەك گەلێك وشەو زاراوەی دیکە، شەرعزانان (فقهاء) بەکاریان هێناوەو دەتوانین بیگۆڕین بە وشەیەکی دیکەی وەك: هاوولاتیان (المواطنون)، چونکە زانایان وشەی (دار الإسلام)یان بۆ سەرزەمینی ئیسلامیی بەکار هێناوەو، دیارە غەیرە مسوڵمانەکانیش پەیمانو بەڵێنی هەمیشەییان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا هەیە، کە لەنیشتمانو سەرزەمینی ئیسلامییدا بژین، کەواتە: ئەوانیش خەڵکی نیشتمانی ئیسلامیی (أهل دار الأسلام)ن!

**٢- مەسەلەی سەرانە (الجزیە):**

دەربارەی مەسەلەی سەرانە (جزیة)ش دەڵێین:

أ- بەسەرنج دانی سیاقی ئەو ئایەتەی، کە تەنیا لەودا وشەی (جزیة) هاتوە، بۆمان دەردەکەوێ، کە دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەم، سەرانەی بەس لەو خاوەن کتێبانە وەرگرتوە، کە لەدژی دەوڵەتی ئیسلامیی جەنگاونو پاشان شکستیان خواردوەو، ئامادەش بوون، کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بمێننەوە، ئەمەش دەقی ئایەتەکەیە: ﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴾ (التوبة: ٢٩)، واتە: لەدژی ئەوانە بجەنگن، کە بڕوایان بە خواو بەرۆژی دوایی نیەو، ئەوەی خواو

پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردوە بە حەرامی نازانن‌و، ملکەچیی ئایینی هەق نین لەوانەی کتێبیان دراوەتێ، تاکو بە ملکەچیی سەرانە دەدەن.

کەواتە: ئەوانەی، کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا بەشەڕ نەهاتوون، نابێ سەرانەیان لێوەربگیرێ، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ سەرانەی لەو تیرە جوولەکانەی نێو شاری مەدینە وەرنەگرتوەو، لەو (صحیفة)یەشدا، کە وەك دەستوورێك کاروباری سەرجەم پێکهاتەکانی نێو کۆمەڵگای ئیسلامیی‌و ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی ڕێکخستوە، کەم‌و زۆر باسی سەرانە نەکراوە!

ب- ئنجا زانایانی ئیسلام، کە باسی هۆو حیکمەتی وەرگیرانی سەرانەیان لە هاوولاتیانی نامسوڵمان کردوە، هەندێکیان پێیان وایە، کە سەرانە (جزیة) قەرەبوو (تعویض)ی جیهاد نەکردنە، بەزاراوی ئێستا (سەربازیی نەکردن)، هەربۆیەش دەڵێن: هەرکات ئەو جۆرە کەسانە ئامادەی سەربازیی بوون، سەرانەکەیان لەسەر لادەچێ. هەندێکیش لەزانایان ڕایان وایە، کە ئەو سەرانەیە لەجیاتی (زەکات)ی مسوڵمانانە، دیارە دەوڵەتی ئیسلامییش هەقی لەسەر هاوولاتیی نی هەیە، کە لەبەرانبەر ئەو هەموو خزمەتگوزارییانەی پێشکەشیان دەکات، ئەوانیش لەڕووی داراییەوە هاوکاریی بکەن، چونکە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەرکام لە (أهل الذمّة) لەبەر پیریی، یان نەخۆشیی، یان هەرهۆیەکی دیکە نەیتوانی پێداوستییەکانی ژیان‌و گوزەرانی دابین بکات، لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستە بۆیان دابین بکات، وەك (أبو یوسف) لە کتێبی (الخراج)دا بەسەرهاتێکی (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ، لەو بارەوە هێناوە، کە جوولەکەیەکی هەژاری بینیوە سواڵی کردوە، ئەویش زۆر نارەحەت بووەو، پاشان فەرمانی بەبەرپرسی خەزێنەی دەوڵەت کردوە، کە سەرانە لەسەر ئەو جۆرە کەسانە هەڵگرن‌و مووچەیەکیشیان بۆ ببڕنەوە، کە بەباشی پێی بژین.

هەندێکیش لە زانایان پێیان وابووە، کەسەرانە سزایەکە بەهۆی لەسەر کوفر مانەوەوە بەسەر نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی سەپێنراوە! بەلاّم هیچ گومانی تێدا نیە، کە ئەم قسەیەی سێیەم هەڵەیەو هیچ ڕێی تێناچێ، چونکە خوای کاربەجێ ژیانی دنیای کردۆتە تاقیگاو شوێنی سزاو پاداشت نیە، پاشان شتێکی نەگونجاوە، کە خوا ڕێی خەڵکی بدات،کەلە دنیادا کافربن، کەچی هەر لەدنیاداسزایان بدات لەسەری!!

واش پێدەچێ ئەو ڕایە ڕاستو بەجێ بێت،کە دەڵێ: (سەرانە)قەرەبووی بەشداریی نەکردنە لەجەنگو جیهادو بەرگریی کردندا لە ولاّتی ئیسلامیی، چونکە (سەرانە) بەس لەپیاوانی باڵغو ساغو خاوەن توانای مادديی وەردەگیرێ، دیارە جیهادیش هەر لەسەر وان فەرزە.

ج- بەکارهێنانی وشەی سەرانە (جزیة)ش، وەك بەکارهێنانی وشەی (أهل الذمّة) ،ئەگەربببێتە مایەی نارەحەتییو هەست بریندارکردنی هاوولاّتیانی نامسوڵمان، دەگونجێ بەوشەیەکی دیکە بگۆڕرێ، وەك چۆن (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ، کاتێك تیرەی (بني تغلب)، -کە نەصرانیی بوون- داوایان لێکرد، کە هەرچەندی لێیان وەردەگرێ بەناوی زەکاتو صەدەقەوە، باوەری بگرێ، بەلاّم بەناوی سەرانەوە نا، ئەویش لێی قبووڵ کردنو گوتی: ئەمانە خەڵکێکی نەفامن، نێوەرۆکیان قبووڵەو ناویان قبووڵ نیە: (هؤلاء قوم حُمقى رضَوْا المعنى وأبَوْا اللّفظ)[1].

د- هەرچەندە زۆربەی زانایانی ڕابردوو ڕایان وابووە، کە سەرانە بەس لەوانە وەردەگیرێ، کە بەخاوەن کتێب (أهل الكتاب) ناسراون، وەك جوولەکەو دیانەکان، بەلاّم ڕای ڕاستو دروستو بەڵگەدار -بەڕای بەندە- ئەوەیە،کەسەرانە وەرگیران تایبەت نیە بەخاوەن کتێبە ئاسمانییەکانەوەو

---

(١) بڕوانە: (فتوح البلدان) للبلاذري، ج١ ص ٢١٧، وە: (كتاب الأموال) لأبي عُبَيد، ج١ ص ٣٢.

تێکڕای ئەوانەی، کە ئامادەن لەکۆمەڵگای ئیسلامییو لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین، خاوەن هەر بیرو ڕاو بەرنامەیەك بن لەو مەسەلەیەدا یەکسانن، بەڵگەشمان لەوبارەوە زۆرن، بەڵام لێرەدا هەر بەکورتی ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین:

یەك: خوا ﷻ لەچەندان ئایەتدا مرۆڤەکانی سەرپشك (مختار) کردوە لەنێوان ئیمانو کوفردا، کە پێشتر ئاماژەمان بەهەندێکیان کرد.

دوو: ئەگەرقبووڵ نەکرێ خەڵکی لەسەر کوفر بمێننەوەو ناچار بکرێن، کە لەنێوان مسوڵمان بوونو کوژراندا یەکیان هەڵبژێرن، ئەوە لەو حاڵەتەدا:

أ- زۆر لێکران (إکراه) بەکار هاتوە، کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ...﴾ (البقرة: ٢٥٦).

ب- بابای زۆر لێکراو، ناچار کراوە ببێتە مونافیق، چونکە مونافیق کەسێکە لەدڵەوە بڕوای بەئیسلام نەبێو، بەڕواڵەتیش خۆی بەمسوڵمان پیشان بدات، ئنجا دیارە، کە ئیسلام ڕقی لە نیفاق زیاترە وەك لەکوفر، هەربۆیەش مونافیقەکان لەپلەی ژێرەوەی دۆزەخ دان: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ...﴾ (النساء: ١٤٥).

سێ: کاتێك مرۆڤ لەنێوان مسوڵمان بوونی ڕواڵەتییو کوژراندا سەرپشك دەکرێ ، مانای وایە ئەو حیکمەتەی، کە خوا مرۆڤەکانی بۆ خوڵقاندوە کە تاقیکردنەوە (ابتلاء)یە فەوتاوە، چونکە بەزۆر مسوڵمان کران، پێچەوانەی ئەو ئازادییەیە، کە دەبێ بابای تاقیکراوە (مُمْتَحَنْ) هەیبێ!

چوار: لەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە سەرانە لە هاوبەشدانەران (مشرکین)و ئاگر پەرستانو (مجوس)یش وەردەگیرێ، بۆ نموونە: ئەو فەرموودەیەی کە (مسلم) لە (بُریدة)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە تێیدا هاتوە:

{وإذا لقيت عدوّك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال أو خلال فأيَّتَهُنَّ ما أجابوك فاقْبَلْ منهم وكُفَّ عنهم، ثم ادعهم إلى الإسلام فإن أجابوك فاقبل منهم وكفَّ عنهم، ثم ادعهم إلى التَحوُّل من دارهم إلى دار المهاجرين... فإن هم أبوا فَسَلْهُم الجزْية، فإن هم أجابوك فاقبل منهم وكفَّ عنهم، فإن هم أبوا فاسْتَعِنْ بالله وقاتِلْهُم..} (صحيح مسلم، رقم:١٧٣١).

واتە: .. هەركات بەرەنگاری دوژمنەكەت بووی لە هاوبەشدانەران، داوای یەكێك لە سێ شتیان لێ بكەو، هەركامێكیان قبووڵ كرد، لێیـ ن وەربگرەو وازیان لێ بێنە:

بانگیان بكە بۆ ئیسلام، جا ،ئەگەر ڕازی بوون، لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، ئنجا بانگیان بكە بۆ گواستنەوە لە شوێنەكانیانەوە بۆ شوێنی كۆچكەران...جا ،ئەگەرملیان نەدا -بۆ ئیسلام- داوای سەرانەیان لێ بكە،جا،ئەگەردایان، لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، بەڵام،ئەگەرسەرانەیان نەدا پشت بە خوا ببەستەو لەگەڵیان بجەنگە..

ئەو فەرموودەیە كە (بخاري) لە (مغيرة بن شعبة)وە گێڕاویەتەوە، كە ئەمە دەقەكەیەتی: {قال مغيرة بن شعبة لِعامِلِ كسرى بين يدي معركة (نهاوند): أمَرَنا نَبيُّنا رسولُ ربِّنا ﷺ أن نقاتلكم حتى تعبدوا الله وحده أو تؤدّوا الجزية..}، واتە: موغەیرەی كوڕی شوعبە بە كاربەدەستی كیسرای گوت لەپێش جەنگی نەهاوەندا: پێغەمبەرمان ڕەوانەكراوی پەروەردگارمان فەرمانی پێكردووین، كە لەگەڵتان بجەنگین، هەتا یان تەنیا خوا دەپەرستن، یان سەرانە دەدەن.

ئەوەی،كە (بخاري) لە (عبدالرحمن بن عوف)ەوە گێڕاویەتەوە، كە ئەمە دەقەكەیەتی: {عن عبدالرحمن بن عوف رضي الله عنه أن رسول الله أخذها -أي الجزية- من مجوس هجر}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرانەی لە مەجووسییەكانی هەجەر وەرگرتوە.

پێنج: ژمارەیەك لە زانایانی ڕابردوو، وەك: (مالك وأوزاعي وصنعاني و شوكاني وابن القيم) و زۆرێك لە زانایانی هاوچەرخ، هەمان ڕایان هەیە[1].

**٣- مەسەلەی بەئەستۆوەگرتنی ئەرکەکانی دەوڵەت (تولّي وظائف الدولة):**

لەو بارەشەوە پێویستە چەند شتێك ڕوون بکەینەوە:

أ- ئەرك‌و کارەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی بەگشتیی دوو جۆرن:

جۆرێکیان مۆرکێکی ئایینیان پێوەیەو بۆ مسوڵمانان نەبێ ناشێن، وەك چۆن ئەرکە ئایینییەکانی جوایەتی (اليهودية)و دیانەتی (النصرانية)یش بۆ غەیری خۆیان ناشێن،جۆرێکی دیکەیان مۆرکێکی مەدەنییان هەیەو تایبەت نین بە مسوڵمانانەوە، جا دیارە ئەرکە ئایینییەکانی وەك: پێشەوایەتی (إمامة)و وتاردان (خطابة)و بانگ دان (أذان)، تایبەتن بە مسوڵمانانەوە، بەڵام ئەرکە مەدەنییەکان، جگە لە ئەرکی سەرۆکایەتی دەوڵەت (رئاسة الدولة)، کە دروست نیە بەغەیری مسوڵمانان بسپێررێ، چونکە یەکێك لە ئەرکەکانی گەورەو سەرۆکی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی پارێزگاریی لێکردنی ئیسلامە بەعەقیدەو شەریعەتەکەیەوەو، ئەرکێکی دیکەی پێشنوێژیی کردنەو، ئەرکێکی دیکەی بەرپرسیارێتیی، هێزی سەربازیی‌و جەنگ‌و جیهادەو...هتد، کە بێگومان ئەم ئەرکانە بەسەرۆکێکی مسوڵمانان نەبێ ئەنجام نادرێن، بەڵێ، ئەرکە مەدەنییەکان جگە لەسەرۆکایەتی دەوڵەت، هیچ کامیان بەڵگەیەکی شەرعی ڕوون نیە ڕێگریی بکات،کە بەغەیری مسوڵمانان بسپێررێن، مادام دڵسۆزو شایستەبن.

---

(١) بڕوانە: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) چاپی پێنجەم، لاپەڕە: ١٦٧تا ١٧٧، کە باسێکی تێروتەسەلمان لەو بارەوە کردوە.

لە مێژووی ئیسلامیشدا ڕوویداوە، کە وەزارەتی جێ بـەجێ کـردن (وزارة التنفيذ) بە نامسوڵمانان سپێرراوە، وەك هەرکام لە (الماوردي)و (أبـو يَعْلـى الفَراء) لە کتێبی (الأحكام السلطانية)ی خۆیاندا باسیان کردوە.

ب- لە مێژووی ئیسلامیی‌و لە فیقهـی ئیسـلامییدا، هەنـدێك شـت لـەبواری مامەڵە کردن لەگـەڵ هاووڵاتیـانی نامسـوڵماندا لەجوولەکـەو نەصـڕانیی‌و غەیری وانیش ڕوویداوەو نووسراوە، کە هیچ بناغـەیەکی لە قورئان‌و سوننەتدا نیەو، پێویستە حیسابی کەلەپوورو جۆری تێگەیشتنی ئەوان بۆ ئیسلامی بۆ بکرێ، نەك حیسابی شەریعەت‌و ئایین، بۆ نموونە: پۆشینی بەرگێکی تایبەت، هەڵنەگرتنی چـەك، ڕێگـرتن لەبەرزکردنـەوەی خـانوو وبـەرەیان بەسـەرهی مسوڵماناندا، سڵاو لێنەکردنیان، پێشگیرییکردن لەدروست کردنـی شـوێنی خواپەرستیی، ئەمـانەو هاووێنەکانیان، زیاتر زادەو بەرهەمی بیرو بۆچـوونی زانایـان‌و ڕەنگدانـەوەی واقیعـی سیاسـیی‌و کۆمـەڵایـەتی خۆیانـەو، هـیـ بەڵگەیەکی وایان لەسەر نیە[1]!

ج- بە بەڵگە هێنانەوەی ئایەتی: ﴿...وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ (النساء: ١٤١)، لەسەر ئەوە، کە نابێ هاووڵاتیانی نا مسوڵمان لە کۆمـەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، هیچ ئەرك‌و کارێکی وایان پێ بسپێررێ، کـە ئـەمرو نەهی بەسەر هەندێك لە مسوڵماناندا بکەن، شتێکی ڕاست نیە، چونکە:

١. مسوڵمان بوونی سەرۆك‌و گەورەی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی‌و
٢. ناسرانی ئەو قەوارەو دەوڵەتە بەناوی ئیسلامەوەو
٣. قبـوولکردنی هاووڵاتیـانی نامسـوڵمان، کـە لـەژێر سـایەی ئیسـلام‌و مسوڵماناندا بـژین... هـەموو ئەمانـە بەڵگـەو نیشـانەی حـوکمڕانێتی

(١) بڕوانە: (تقسيم المعمورة في الفقه الأسلامي) عبدالله بن يوسف الجديع، ص ٧٦.

مسوڵمانانو باڵا دەستییانە بەگشتیی، ئەمەش بەسە بۆ هاتنە دیو چەسپانی چەمكو واتای ئەو ڕستە قورئانییەو هاوێنەکانی.

**٤- جێبەجێ کردنی یاساکانی شەریعەتی ئیسلامیی بەسەر هاوولاتیانی نامسوڵماندا:**

ئەمیش لەلای هەندێك کەس گرفتو گرێکوێرەیەکی بێڕەزایەو دەڵێن:
کۆمەڵگاو دەوڵەتێکی ئیسلامیی، کە شەریعەتی ئیسلامییو دەستوورو یاسا گشتگیرو جۆراو جۆرەکانی تێداپیادە دەکرێن، چۆن چۆنی مافو ئازادییەکانی نا مسوڵمانانی تێدا ڕەچاوو دابین دەکرێن؟!!
ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین:

أ- جارێ لەڕووی ئازادیی بیروڕاو ڕادەربڕینەوە، مادام خوای کاربەجێ بەڕوونو ڕاشکاویی فەرموویەتی: ﴿..فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴾ (الکهف:٢٩)، واتە: جاکێ حەز دەکات باباوەڕبێنێو کێش حەزدەکات بابێ بڕوابێ، کەواتە: نامسوڵمانانی نێو کۆمەڵگای ئیسلامیی بە هەموو جۆرەکانیانەوە ئازادیی تەواویان هەیە لە خستنەڕوو و ڕاگەیاندنی بیرو بڕواو بیروڕاو بۆچوونەکانیاندا، (أبو الأعلى المودودي) خوا لێی خۆش بێ، لەوبارەوە گوتوویەتی: ((فالذي يظهر من هذا بوجهٍ قاطع، أن كل طائفةٍ من طوائف البلاد اذا كانت لاتوافق آراؤها آراءَ الأمة الأسلامية، لاتحولُ الدولة الأسلامية دون إظهار آرائها، وأمّا اذا حاولت نَشْرَ أفكارها وحمل الجمهور عليها بالطُرُق الإرهابية والعمل على قلب نظام البلاد بالقوة، فهناك تؤاخذها الدولة وتجازيها على أعمالها))[1].

کە ماناکەی بەکورتی ئاوایە: دەوڵەتی ئیسلامیی بەهیچ جۆرێك ڕێ لەوانە ناگرێ، کە بیرو ڕاکانیان لەگەڵ هی مسوڵماناندا ناگونجێ، بیرو ڕای خۆیان

---

(١) بڕوانە: (نظرية الأسلام وهَدْيُهُ) ص٣٠٧.

بخەنەڕوو، بەڵام ،ئەگەربیانەوێ لەڕێی بەکارهێنانی هێزەوە بەزۆر شتی خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنن‌و هەوڵی گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانیی بـدەن، دەستیان دەگرێ.

ب- لەڕووی عەقیدەو عیبادەت‌و کاروباری خێـزان (الأحـوال الشخصـية)ەوە، ئەوە دەوڵەتی ئیسلامیی یاساکانی شەریعەت بـەس بەسـەر مسـوڵمانانـدا جێبەجێ دەکات‌و، غـەیرە مسوڵمانەکان بە گوێرەی ئایین‌و بەرنامەی خۆیان بەڕێوە دەچن‌و، دەوڵەتی ئیسلامیی بەهیچ جۆرێك دەست وەرناداتـە کـارو باریانەوەو، ،تەنانەت ،ئەگەرگرفت‌و کێشەیەکیشیان هەبوو لەنێو خۆیانـدا، مـەگەر خۆیان حەز بکەن، ئەگەرنا، هەر بەپێی ئـایین‌و تـەعلیماتی خۆیـان چارەسەریی دەکەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ .... وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ﴾ (المائـدة:٤٣،٤٢). واتە: هەرکات هاتنەلات -بـۆ چارەسـەری کێشـەکانیان- دادوەرییان لەنێواندا بکە، یان لێیان گەڕێ... جا چۆن تۆ دەکەنە دادوەر لە حاڵێکدا، کە تەوراتیان لەلایەو حوکمی خوای تێدایە..؟!

ج- بەڵام بێگومان لەبواری یاسا مەدەنییەکاندا، کە هەموو لایەك تێیاندا وەك یەکن‌و جیاوازی ئایین‌و عـەقیدە، کاریگەریی لەسەریان نییە، ئەوە پێویستە سەرجەم هاوولاتیان بە مسوڵمان‌ونامسوڵمانەوە، ملکەچی دەوڵەت‌و پابەندی یاساکانی بن بەبێ جیاوازیی، وەك چۆن مسوڵمانانێکیش، کە لەژێر سایەی دەوڵەتێکی نا ئیسلامییدان، لەسەریان پێویستە، کە ملکەچی یاساکانی بن.

شایانی باسیشـە،کەلەبواری یاسـا مەدەنییەکانیشـدا، دیسـان شـەریعەت ڕەچاوی تایبەتمەندییەکانی نامسوڵمانانی کردوە، بۆ نموونە: مەی (خمر)، کە بەهـەموو جۆرێـك لـە مسـوڵمانان حەرامـەو لەسـەرمامەڵە پێـوەکردن‌و بەکارهێنانی سزا دەدرێن، نامسـوڵمانان هـەڵاوێرراون‌و حوکمیـان جیایـە، هەروەها بەکارهێنانی گۆشتی بەرازو ئەو جۆرە شتانە،کە لەلای هەنـدێك،

یان زۆربەی نامسوڵمانان بەکار هێنانیان ڕەوایە، دەوڵەتی ئیسلامیی هەقی بەسەریانەوە نیە.

لێرەشدا کۆتایی بەم باسە دێنین، بەمەش کۆتایی بە دوایین ئاڵقەو بواری بەراوردی نێوان تەوژمیی ئیسلامییو عەلمانیی دێنین.

* * * * *



# قسـەی کـۆتـایـی

خوێنەری بەڕێز!

ئێستا پاش بەراوردکردنی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی لەهەر حەوت بـواری گەورەو گرنگی: بوونناسیی‌و، بیرو بڕواو، فیکرو زانسـت‌و، حـوکم‌و سیاسـەت‌و، ئـابووری‌و ژیـان‌و گـوزەران‌و، کۆمـەڵایـەتیی‌و، تـەبایی‌و پێکـەوە ژیانـدا، ئـەم ڕاستییانەمان بۆ ڕوون بوونەوە:

<u>یەکەم:</u> ئیسلام‌و سیکۆلاریزم هەرچەندە دوو ئایین‌و بەرنامەن لە ڕووی سەرچاوەی لێوە هەڵقوڵینیانەوە، زۆر لەیەك جیاوازن‌و نێوانیان ئاسمان‌و زەوییـە، چـونکە یەکـەمیان: لـەزانیاریی‌و حیکمـەتی بـێ سـنووری خـوا -عـز وجـل-و، دووەمیشیان: لەبیرو هۆشی پڕ هەڵـەو پەڵـەی مرۆڤـەوە هاتوە،هەرچـەندە کۆمەڵێك جیاوازیی سەرەکیشیان لە نێواندا هەن، بەڵام لەچـەند شتێکیشـدا کەم‌و زۆر، یەکدەگرنەوەو پێك دەگەنەوە، دیارە ئیسلام لەگەڵ سەرجەم ئایین‌و بەرنامەکانی دیکەشدا کەم‌و زۆر، خاڵی لێکچوون‌و پێکگەیشتنی هەن‌و، هەر هەق‌و ڕاستییەکی بچووکیان لابێ، ئیسلام بەشێوەیەکی چاکتر لەلایەتی.

<u>دووەم:</u> بێگومان خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئیسلام‌و سیکۆلاریزم، ئەو شتانەن، کە عـەلمانییەت هەقی تێدا پێکاون‌و، خاڵە جیاوازەکانیشـیان ئـەو شـتانەن، کـە تێیاندا گیرۆدەی هەڵەو ناهەقیی بووە، هەربۆیەش هەق‌و ڕاستیی ڕەها (مطلق) لەهەموو ڕوویێکەوە بەس لە ئیسلام دایە، کە دوایین نوسخەی هیدایەتی خواو

تاکە سرووش (وحي)ێکی خوایی پارێزراوو دەستکاریی نەکراوی بەردەستی مرۆڤـایەتییە لەم ڕۆژگارەماندا، بەڵام ئایینو بەرنامەکانی دیکە، کە زادەی ئەو هیدایەتو ڕووناکییە نیسبییەن، کە خوا ﷻ لە عەقڵو فیترەتی مرۆڤـەکاندا دایناوە، هەقو ناهەقیان تێدا تێکەڵو ئاوێتە بووە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ؟!﴾ (آل عمران:٧١)، واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان! بۆچی ناهەق تێکەڵی هەق دەکەنو ڕاستیی دەشارنەوە لە حاڵێکدا، کە دەشزانن؟!

سێیەم: هەلومەرجی تێدا سەر هەڵدانی سیکۆلاریزم واقیعی پڕ کێشمەکێشو شەڕو کوشتاری وڵاتانی ڕۆژئاوا بووە، لە سۆنگەی شێوێنرانو گۆڕرانی ئایینی (مەسیح)ەوە ﷺ و کرانی بە ئامرازێك بۆ تێرکردنی حەزو ئارەزووەکانی سێکوچکەی (پاپا، پادشا، دەرەبەگ) لەسەر حیسابی خەڵكو جەماوەر، هاتۆتە کایەوە، هەربۆیەش شتێکی ئاساییو چاوەڕوانکراوە، کە عەلمانییەت خاوەنی (بووننامیی)و (بیرو باوەڕ)یەکی ڕوونو دیاریکراو نەبێو، لەزۆر مەسەلەی گەورەو چارەنووسسازدا خاوەنی دیدو هەڵوێستێکی سەربەخۆو ڕوون نەبێ، چونکە ڕێچکەیەکی بە پاڵنەری کاردانەوە (ردّ فعل) پەیدابووی هەڵقوڵاو لە هەلو مەرجو واقیعێکی بێ سەرو بەرەو نائاسایی، ناگونجێ لەوە زیاتری لەهەگبەدا هەبێ.

هەر بۆیەش هەموو ئەو سیکۆلاریستانەی، کە بەشێوەیەکی عاتیفییانە لە سیکۆلاریزمەوە ڕادەمێننو، پێیان وایە کانگاو سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشیو بەرژەوەندییەکە، حەوجێی چاو بەخۆدا گێڕانەوەیەکی جیددیین، چونکە وەك لەدوو تۆیی ئەم زنجیرە باسەدا ڕوونمان کردەوە، هیچ کەس ناتوانێ بیسەلمێنێ، کە بۆ نموونە: عەلمانییەت وەك خودی خۆی، سیستەمی دیموکراسیی دەخوازێو لەگەڵ دیکتاتۆرییو حوکمی تاکییدا ناکۆکە، چونکە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە، حیزبو ڕژێمە سیکۆلاریستەکان چەندان

دەوڵەتو قـەوارەی دیكتاتۆرییانـەیان بنیاتنـاون، بێئـەوەی خۆیـان هەسـت بەسەغڵەتیی (حرج) بكەن، یان هیچ كەس بتوانێ گلەیی ئەوەیان لێ بكات،كە پێچەوانەی سیكۆلاریزم ڕەفتاریان كردوە!

كەواتە: جۆرێك لە چەواشەكارییە، كە سیكۆلاریزم وا ڕابنوێنرێ، كەخاوەنو كانگاو هۆكاری هەمـوو ئەوتەكنۆلۆژیاو بەرەو پێشچوونە ماددییو گەشەكردنە ڕواڵەتییەیە،كە مرۆڤـــایەتیی لـەم ڕۆژگـارەدا بەخۆیـەوە بینیـوە، چـونكە تـەكنۆلۆژیاو بەرەوپێشچـوونی شارسـتانییو گەشـەكردنی مرۆڤـــایەتیی، بەرهەمو زادەی كۆمـەڵێك هۆكارو فاكتەریی خودییو بابەتییە، ئەگەرنا، بۆچی سیكۆلاریستەكانی ئێمـە پـاش چـەندان سـاڵ تەبـەننیكردنی سـیكۆلاریزمو بانگەشـــە بـــۆكردنی، هـــەر لەشـــوێنی خۆیـــانن‌و، لـــەوبوارەدا وڵاتو كۆمـەڵگاكەیانیان قولانجێك بەرەو پێش نەبردوەو، بگرە لە زۆر ڕووەوە بـەرەو دواشیان گێڕاوەتەوە؟!

چوارەم: سیكۆلاریزمیش حەتمەن وەك هەر ئایینو بیرۆكەیەكی دیكەی زادەی بیرو هۆشی مرۆڤـــ، سـەرەنجام پیردەبـێو دەفـەوتێو شـوێنی خـۆی بـۆ ڕێبـازو بیرۆكەیەك، یان چەند ڕێبازو بیرۆكەیەكی دیكە چۆڵ دەكات.

ئنجا دیارە هەمان یاسا (سـنّة)ی خـوا بەسـەر ئیسـلامو مسوڵمانانیشـدا دەچەسپێ، بەڵام لەو ڕووەی دینداریانەوە، كە زادەی بیرو هۆشی خۆیانن‌و، لە ئـەنجامی ئـەزموونو ئیجتیهادەكانیانـەوە پەیـدا دەبـێ، بـەڵام ئـەو ڕووەی دینداریی‌و مسوڵمانەتییان، كە لە شەریعەتی خوای ﷻ و وەحی بێ هەڵەو پەڵەو پارێزراوو دەستكاریی نەكراوییدا بەرجەستەیە، ئەوە بێگومان جێگیرو نەگۆڕە، چونكە هەقی ڕەهایەو لەدەرەوەی جوغزی كاتو شـوێن (زمـان ومكـان)ەوە هاتوە، بۆیە بەسەرچوونی كاتو گـۆڕانی شـوێن كـاری تێناكـات، وەك خـوا فەرموویەتی: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ...﴾ (النحل: ٩٦)، واتە: ئەوەی لای ئێوەیە دەبڕێ، بەڵام ئەوەی لای خوایە دەمێنێ...

پێنجەم: هەرکەسێك بەویژدانەوە سەرنجی مێژووی ئیسلام‌و مسوڵمانان بدات، دڵنیاو مسۆگەر دەبێ، کە هەمیشە غەیری ئیسلام‌و مسوڵمانان لەکۆمەڵگای ئیسلامیی‌و، لەسایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا جێیان بۆتەوەو بەرێزو حورمەتەوە حەوێنراونەوە، هەر لە جوایەتی‌و جوولەکەکان‌و دیانایەتیی‌و دیانەکانەوە بگرە، هەتا سەرجەم دین‌و بەرنامەکان‌و شوێنکەوتووەکانیان، وەك ئاگر پەرست (مجوس)و بتپەرست (وثني)و مانگا پەرست‌و بودایی‌و ...هتد.

کەواتە: باهیچ کەس ترس‌و بیمی ئەوەی نەبێ، کە لەپەنای مسوڵمانان‌و لەژێر سایەی ئیسلامدا ناژی‌و ناحەوێتەوە، مەگەر مسوڵمانان، ناحاڵیی‌و لە ئیسلام بەجێماوو، ئیسلامیش گۆڕراوو شێوێنراو بێ، بەڵام ئەوەی جێگای بیم‌و مەترسیی‌و دڵە ڕاوکێیە ئەوەیە،کەئیسلام‌و ئەهلی ئیسلام لەپەناو سێبەری غەیری خۆیاندا جێیان نەبێتەوەو نەحەوێنەوە، وەك لەم ڕۆژگارەدا دەبینین، کە ئیسلام‌و مسوڵمانان لەسایەی حیزب‌و ڕژێمە عەلمانییەکاندا، دووچاری گرفت‌و کێشەو سەغڵەتییەکی یەکجار گەورەو بێڕەزا بوونە.

ئیدی بەهیوای ئەوە،کەهەموو لایەك عەقڵ‌و دڵی خۆمان گەورەترو فراوانتربکەین‌و، خۆمان واڵێ بکەین، کە بتوانین لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بژین‌و بحەوێینەوە، کە لەگەڵمان جیاوازییان هەیە، چونکە وەك گوتراوە: (ومَنْ ضاق به العَدْلُ فالجور عليه أضْيَقُ)، واتە: هەرکەسێك بەدادگەریی سەغڵەت‌و تەنگەتاو ببێ، ئەوە بەستەم‌و بێدادیی سەغڵەتترو تەنگەتاوتر دەبێ.

بەهیوای ئەوە،کەلەگەڵ ئەوانەدا، کە ئایین‌و بەرنامەمان لێك جیایە، خاڵ‌و ئامانجە هاوبەشەکانمان بکەینە بناغەی هاوکاریی‌و تەبایی‌و پێکەوە ژیان، هەرکامێکیشمان جیاوازیی‌و تایبەتمەندییەکانی ئەوی دیکە بسەلمێنێ‌و تەحەممول بکات‌و، لەگەڵ یەکدیدا پشوو درێژو خۆ ڕاگربین، وەك (شُعَيبْ) عليه السلام بەگەلەکەی خۆی گوتوە: ﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾ (الأعراف: ٨٧)، واتە:

ئەگەرکۆمەڵێکتان بڕوایان بەوە هێنا، کە پێی ڕەوانە کراوەو کۆمەڵێکیش بڕوایان نەهێنا، ئەوە لەگەڵ یەك پشوو درێژو خۆراگربن، هەتا خوا حوکم دەکات‌و ئەویش باشترین حوکمڕانە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألاّ إله إلا أنت

استغفرك وأتوب إليك

٢٨ ذي الحجة ١٤٢٨

٢٠٠٨/١/٧

هەولێر

## بەرهەمەکانی دانەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك راچوونی ئیسلامو ڕێچکان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤـدا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خـوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەوچۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩

تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

٨- ڕێگێی صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون. چاپی ٥ /٢٠١٢

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبیو لەژێر چاپە .

٩- کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوکمی گەرانەوە ژێر نیـری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سۆزی نەتەوایەتیو بیـری ناسیۆنالیزم لەتەرازووی ئیسـلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥

١٢- مسـوڵمانی کامڵ/بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١٩٩٧/١

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسـەری کێشـەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەماندا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەماندا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئایندەیەکی گەشو ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٦- پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیسـلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلام‌و کێشـە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- بـا وریـا بیـن! داڕووخـانی ڕەوشـت کۆمەڵگاکـەمان بـەرەو هەڵـدێر دەبـات. چـاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتیی، پاك‌وخاوێنی .

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشین‌و زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەج‌و عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەرانەوە بۆ لێی خـوا ﷻ . چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسـلام کێن‌و چۆنن ؟! چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچـینە گرنگـەکانی هەڵس‌وکـەوتی شـەرعییانەو ژیرانـە لەگـەڵ وردە بابەتـە خیلافییـەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسـلامیی)یە، بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردندا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی‌یەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٩- بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج‌و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاسـاوو بەلگـە شـەرعییەکانی بنیاتنـانی کۆمـەڵی ئیسـلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣٣- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێنموونییەك بۆ خوشك‌و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز).
چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چی‌یەو بۆچی دەکراو چۆن دەکرا؟ چاپی١/ ٢٠٠٢.

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٣- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)
چاپی ٢/ ٢٠٠٦ .

٤٤- ئیسلامو مسوڵمانەتی‌وکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا.
چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی چی‌یەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگاریێتیدا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٧- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراوێتیدا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٨- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّ جل)، کتێبەکانی خوا (عزّ و جل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

- سروشتو پایەكانی خێزانو مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شـەرعو عەقڵدا.

تێبینی: ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقـە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە.

٦٨- پوختەی ژیاننامەی پێغ- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگـی/ ٥، ئیمـان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قـەدەر ٤١ تا ٤٥ .

چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥٠- ئیمـانو عەقیـدەی ئیسـلامیی. بـەرگی/٦، تایبەتمەنـدییو دیـدو بۆچـوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠. چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥١- تـەوژمی ئیسـلامییو عەلـمانییو خاڵـە هاوبـەشو جیاوازەكانیـان.

چاپی ١/ ٢٠٠٧، چاپی ٢/ ٢٠١١

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتی)و ئەوەی دیكـەش بـە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە.

٥٢- گەنجەكانـمان لە نێوان ڕەسەنایەتییو لاسایی كردنەوەدا.

٥٣- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟

٥٤- سیاسەتی ئیسلامییو چەند ڕوونكردنەوەیەك.

٥٥- چۆنیەتی بوونە پێشـەنگو بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی.

٥٦- چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی.

٥٧- قوتابیانی زانیاریی شەرعیی چەند سەرنجو ڕێنماییەك.

٥٨- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە.

٥٩- بانگەواز بۆ لێی خوا .

٦٠- قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا پێویستە چۆن بنو چی بكەن؟!

٦١- ضیفو قضية (مقابلة مع قناة العربية). كە دوایـی لـە شێوەی نامیلكـەدا چاپ كراوە

٦٢- حوار خـاص (مقابلـة مـع قنـاة العـالم). كـە دوایـی لـە شێوەی نامیلكـەدا چـاپ كراوە.

٦٣- خواناسیی، ئاییـن ، ئیمان. چاپی ٢ / ٢٠٠٩ .

٦٤- واقیعی هەرێمی كوردستان ...دیدێكی ئیسلامییانە. چاپی ١/ ٢٠٠٨ .

٦٥- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەت دا. چاپی ١ /٢٠٠٨

٦٦- چۆن باشتر لە کتێبی بەڕێزی خوا بەهرەمەند دەبین؟!

چاپی ١/ ٢٠٠٨، چاپی ٣ /٢٠١٠

٦٧ - پوختە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاپی ١/٢٠١٠، چاپی ٢/ ٢٠١١.

چاپی٣/٢٠١٢

٦٩- چەند بابەتێکی سیاسی‌هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ‌و وەحیدا .

٧٠- کاری ئیسلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك.

٧١- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك.

٧٢- مەلێی گەورە کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك.

٧٣- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان .

٧٤- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا.

٧٥- الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تبارك وتعالى .

٧٦- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟!

٧٧- بەرگی یەکەمی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، کە سووڕەتی (الفاتحة و البقرة)ی گرتۆتە خۆی.

٧٨- بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی/ ٣

٧٩- ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی.

٨٠- ڕەوەندی کورد لە هەندەران‌و ئەرکی سەرشانی.

٨١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز / بەرگی دووەم سووڕەتی (آل عمران).

## ئەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن

١- خووو ڕەوشتی ئیسلامیی.

٢- گرنگی‌و پێویستی پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوە.

٣- ئیسلام‌و دەوڵەتداریی (١-٤)

٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز / بەرگی چوارەم، سووڕەتی (المائدة).

# نێوەڕۆك

## ئەم كتێبە :

لێكۆڵینەوەیەكە تێیدا بەراورد لەنێوان ئیسلامو عەلمانییەت كراوەو، گرنگترینو سەرەكی ترین خاڵە هاوبەشو جیاوازەكانیان خراونە ڕوو و، گرنگترین ئەنجامگیرییش كە ئەم لێكۆڵینەوەیە پێی گەیشتوە ئەوەیە كە:

هەرچەندە ئیسلام وسیكۆلاریزم چ لەڕووی سەرچاوەی لێوەهاتنیانو چ لەڕووی سرووشتیانەوە زۆر لێك دوورو جیاوازن، بەڵام كەم زۆر لە هەندێك شتدا نزیكیی و پێككگەیشتنیان هەیە ، خاڵەكانی پێككگەیشتنی سیكۆلاریزم و ئیسلامیش هەموو ئەو شتانەن كە عەلمانییەت كەمو زۆر -وەك ئیسلام- هەقی تێدا پێكاون و، خاڵە جیاوازەكانیشیان ئەو شتانەن كە عەلمانییەت بە پێچەوانەی ئیسلامەوە هەقی تێدا نەپێكاوە.

دیارە جگە لە ئایینو بەرنامەی تێر وتەواوی ئیسلامیش كە لە زانیارییو حیكمەتو بەزەیی بێ سنوورو ڕەهای خوای پەروەردگارەوە هەڵقوڵیوە، ناگونجێ هیچ ئایینو بەرنامەیەكی دیكە لە هەموو بوارێكدا هەق بپێكێ و، لە هیچ ڕوویێكەوە بە هەڵەدا نەچێ، چونكە ڕاستی ڕەها ناگوجێ لە غەیری خوای خاوەنی هەموو سیفەتێكی ڕەهاوە بێت و، هیچ گۆزەیەكیش نالوێ جگە لەوەی كە تێیدایە لێی بڕژێ!




نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 16 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com